# ڕوونکردنەوەی

# عەقیدەی طەحاوی

عەلی باپیر



التفسير

# ڕوونکردنەوەی
# عەقیدەی طە حاویی

نووسینی
عەلی باپیر



# ڕوونكردنه‌وه‌ی عه‌قیده‌ی طه‌حاویی


| | |
|---|---|
| نوسینـــــــــی | عـــه‌لـی باپـــیر |
| بلاْوكردنه‌وه‌ی | نوسینگه‌ی ته‌فسیر بۆ بلاْوكردنه‌وه‌و ڕاگه‌یاندن/ هه‌ولێر |
| خـــه‌ت | نه‌وزاد كۆیی |
| نه‌خشه‌سازی به‌رگ : | أمين مخلص |
| نه‌خشه‌سازی ناوه‌ڕۆك: | جمعه صديق كاكه |
| نۆره‌ و ساڵی چاپ: | یه‌كه‌م ١٤٣٦ك - ٢٠١٥ز |
| تــــــیراژ: | ١٥٠٠ دانه‌ |

له‌ به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی گشتی كتێبخانه‌ گشتییه‌كان ژماره‌ی
سپیاردنی (٣٧٢) ساڵی ٢٠١٤ پێدراوه‌




نوسینگه‌ی ته‌فسیر
بۆ بلاْوكردنه‌وه‌و ڕاگه‌یاندن
هه‌ولێر - شه‌قامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
Mob: +964 750 460 51 22
Tel: +964 750 818 08 66
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com

بسْمِ اللّهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم

﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ ... ﴿١٧٧﴾ ﴾ البقرة.

## پێشکەش بێ

بە هەرکەسێک، کە هەردەم هەوڵ دەدات ئیمان و عەقیدەکەی، ڕاست و ڕۆچووتر بێ، چونکە دەزانێ، کە دینداریی پاکو پتەو، بەرهەمی ئیمان و عەقیدەی تەواوو نەلەخشاوە.

### خوێنەری سەنگین و شیرین!

گرنگیی ئیمانو عەقیدە لە ژیانی مرۆڤدا، بەتاكو كۆمەڵەوە، شتێكی سەلمێنراوەو مشتو مڕ هەڵنەگرێ،چونكە بێگومان ئیمانو عەقیدە بناغەی دینداریی‌و مسوڵمانەتییەو، ئەوە جۆرو چۆنییەتی ئیمانو عەقیدەی مرۆڤە كە شێوەی ڕێژەی دینداریییەكەی‌و پابەندیی بەئیسلامەوە دیاریی دەكات.

هەربۆیەش بەندە، هەر لە سەرەتای فامكردنەوەمەوە، پاشان دەستبەكار بوونما لە بواری بانگەوازو كارو پرۆژەی ئیسلامییدا، بایەخێكی زۆرم بەو لایەنە داوە لە كارە فیكرییەكانما كە دەتوانم لێرەدا ئاماژە بە چواریان بكەم كە سەرەكییەكانیانن:

یەكەم: (ڕوونكردنەوەی مەتنی عەقیدەی طەحاویی) كە ئەم كتێبەیەو، كاتی خۆی (ساڵی: ١٩٩٣) لە گوندی (سەرئەشكەوتان) بە بیستو دوو (٢٢) دەرس (العقيدة الطحاوية)م شەرح كردوە، بە پۆلە پێشمەرگەو كادیرێكم[1] گوتۆتەوەو، لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردوودا، هەر بە كاسێت سوودی لێوەرگیراوە.

دووەم: (ڕوونكردنەوەی {معارج القبول}ی (الحافظ الحكمي) كە لە ساڵی (١٩٩٨) لە شاری هەڵەبجە لە خولێكدا بە بیست (٢٠) دەرس بە پۆلە كادیرێكم گوتۆتەوە، بەڵام ئێستا نازانم چارەنووسی ئەو كاسێتانەی ئەو دەرسەیان لەسەر تۆماركراون، چی لێهاتوە!

سێیەم: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا) كە لەساڵی: (١٩٩٩) لە مزگەوتێكی هەڵەبجە بە پەنجا (٥٠) دەرسی یەك سەعاتیی، لە خولێكدا

---

١) هەروەها هەردووك هاوسەری بەڕێزی ئەو كاتەشم، بەشداربوون:

١- ڕوخسار إبراهیم ماماغا كە لەساڵی (١٩٩٦)دا كۆچی دوایی كرد، خوا لێی خۆشبێ‌و پایەی بەهەشتی بەرز بێ.

٢- شوكریە أحمد عبدالله، خوا سەلامەت‌و سەرفرازی بكات.

كە ماوەی پەنجا ڕۆژی خایاندوە، بە وردیی باسی سەرجەم باس‌و بابەتەكانی ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامییم كردوە، بەبێ پشتبەستن بەكتێبێكی دیاریكراو.

شایانی باسیشە پەنجا دەرسەكەی ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی، دواتر لەلایەن كاك (مەلا بیلال قەلآدزەیی)یەوە نووسرانەوەو، پاش دەربازبوونیشم لە زیندانی ئەمریكا وەك زۆربەی بەرهەمەكانم، لەلایەن (نووسینگەی تەفسیربۆبلاّوكردنەوە)ەوە لە شەش بەرگدا لە نێوان ساڵەكانی: (٢٠٠٥ و ٢٠٠٨)دا چاپ‌و بلاّوكرانەوە.

هەڵبەتە ئەو كتێبەش (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی) بەگشتیی‌و، هەتا ئێستاش (٢٠١٣/١٠/٢٦) دوا هەڵوێست‌و تێگەیشتنی بەندە لەبارەی ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامییەوە دەگرێتە خۆی، هەرچەندە لە كتێبی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)دا، بۆ هەندێك بابەت ،وردەكاریی زیاترو قووڵترم باسكردوە كە پێم وانییە لە هیچ كتێب‌و بەرهەمێكی دیكەمدا هەبێ.

چوارەم: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله تعالى)، ئەو كتێبەیە كە لە زیندانی ئەمریكاییەكانداو، لە ساڵانی: (٢٠٠٤و٢٠٠٥) لە زیندانی (كروپر) نووسیومە، ئێستاش لە هەشت بەرگ‌و دەوری چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا لە شاری (بەیروت) لەژێر چاپەو، بڕیارە كۆتایی ئەمساڵ (٢٠١٣) یانی سەرەتای ساڵی نوێ (٢٠١٤) كاری تەواو ببێ.

دیارە ئەم كتێبەشم كە مەوسوعەیەكە لەبارەی ئیسلامەوە، لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا كە تاكە سەرچاوەی بەردەستم بوو لە سجن دا، دوا تێگەیشتن‌و بۆچوونەكانی لەبارەی ئیسلامەوە گرتوونە خۆی، چ بابەتی ئیمان‌و عەقیدە، چ بابەتەكانی دیكەش بەگشتیی.

ئەوە بەنسبەت كارە فیكرییەكانمەوە، لەبارەی ئیمان‌و عەقیدەوە بەگشتیی، بەنسبەت ئەم كتێبەشەوە بەتایبەت، دەڵێم:

وەك پێشتر ئاماژەم كرد، ئەم كتێبە لە ئەسڵدا، شەرح‌و ڕوونكردنەوەیەكی بەندەیە بۆ مەتنی (العقيدة الطحاوية)ی (أبو جعفر الطحاوي) كە بیست ساڵ لەمەوبەر لە دوو توێی

بیستو دوو دەرسی نیو سەعاتیدا، گوتراوەتەوە، پاشان لەسەر پێشنیاری چەند برایەکی دڵسۆز، بڕیاری نووسرانەوەیمداو، برای خۆشەویستو دڵسۆزم کاك: ( قاسم سەلام ) ئەرکی هێنرانە سەر کاغەزو تایپکرانی کێشاو لەگەڵ کاك: (سیروان کاکە ئەحمەد) برای زێدە خۆشەویستو دڵسۆزم، هێنایانە بەردەستم بۆ تەماشا کردنەوەو،دوادەستکارییو ئامادەکردنی بۆ چاپ.

خوا پاداشتی ئەو دوو برا بەڕێزە بداتەوە، کە پێم وایە هێندەی من بەشیان بەم بەرهەمەوە هەیە، چونکە ئەگەر داواکارییو پێشنیارو، پاشان هەوڵو هیممەتی وان نەبوایە، ئەو دەرسانەم نەدەبوونە کتێبو چاویان بەدنیای چاپخانە هەڵنەدەهێنا.

هەروەها بەپێویستی دەزانم سوپاسو دەستخۆشیی لە برای بەڕێزم مامۆستا نەوزاد کۆیی (خطاط) بکەم کە چ ئەم کتێبەو چ بەرهەمەکانی دیکەم کە لەنووسینگەی تەفسیر چاپ دەکرێن، پاش بەوردیی خوێندنەوەیان لە سەرنجەکانی خۆی لەبارەی هەڵەچنی یەوە بەهرەمەندم دەکات.

ئنجا لەبارەی کتێبی (العقیدة الطحاویة)و ڕوونکردنەوەکەی خۆمەوە، ئەم چەند خاڵە دەخەمە ڕوو:

١- وەك لە پێشەکی کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)دا گوتوومە: ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لە هێڵە گشتییو بنەما سەرەکییەکانیدا، هەر (یەکە)، بۆیە نازناوەکانی: سەلەفیی، خەلەفیی، ئەشعەریی، ماتۆریدیی، وەهابیی، بۆ ناساندنی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی، بە شتێکی زیاد دەزانم، هەر بۆیەش بە ناوو نیشانی: (العقیدة الطحاویة) موڕتاح نیم، چونکە بێگومان (أبو جعفر الطحاوي) تەنیا نووسەرەو ڕوونکەرەوەی ئەو عەقیدەیە بووە ،کە هی سەرجەم زانایانە بەگشتیی، نەك هی یەکێکیان، یان هەندێکیان، بەڵام مادام کتێبەکە وا ناسراوە، منیش بە ناچاریی، هەر بەکارم هێنا.

٢- کتێبەکەی - ڕاستتر بڵێین: نامیلکەکەی- (أبو جعفر الطحاوي) لە خستنە ڕووی بابەتەکانی عەقیدەی ئیسلامییدا، زۆرجاران ڕیز بەندیی مەنتیقیی (الترتيب المنطقي)

ڕەچاو نەكردوەو، هەندێك بابەت بۆ نموونە: خوا بەیەكگرتن (توحید)، یان قەدەر لەچەند شوێنێك دووبارە بۆتەوە، بەڵام بەزۆریی، بەشێوازو تەعبیری جیاواز بابەتەكە دووبارە دەبێتەوە.

٣- لە سۆنگەی ئەوەوە كە (الطحاوي) وەك لە سەرەتای كتێبەكەیەوە گوتوویەتی: بۆ نووسینی: {عەقیدەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت} پشتی بە جۆری تێگەیشتنو بۆچوونەكانی (أبو حنیفة) و (أبو یوسف و محمد بن الحسن الشّیباني) دوو قوتابییە هەڵكەوتووەكەی (خوا لێیان خۆشبێ) بەستوە، ئەوانیش لە هەندێك مەسەلەدا بیرو بۆچوونێكی تۆزێك، یان زۆر جیاوازیان بووە، لە هی زۆربەو جەماوەری زانایانی متمانە پێكراوو موعتەبەری ئیسلام، بۆیە لە هەر شوێنێك بیرو بۆچوونەكانی كتێبەكە لەوەی زۆربەی جەماوەری زانایان لەسەرنی، جیاواز بێ، هەڵوەستەی لە ئاقاردادەكەمو ڕای زۆربەو جەماوەردەخەمە ڕوو.

٤- وەك پێشتریش گوتم: دوا بۆچوونو تێگەیشتنی بەندە لەبارەی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامییەوە، لە كتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەت دا) و كتێبی: (الإسلام كما یتجلّی في كتاب الله)دا خراوەتەڕوو، بۆیە ئەوەی لەو دوو كتێبەدا هاتوە لەو بارەوە، بە تایبەتیش دووەمیان، باڵادەستە بەسەر ئەوەی لەم كتێبەو لە شوێنەكانی دیكەشدا گوتوومە.

٥- كەمو زۆریش، تێبینییو سەرنجەكانی خۆم لەسەر قسەكانی (طحاوي) لە دوو توێی دەرسەكاندا دەخەمەڕوو، هەرچەندە قسەكانی (طحاوي) لەبارەی عەقیدەی ئیسلامییەوە، زۆربەی هەرە زۆریان، خاڵی هاوبەشی نێوان ئەهلی ئیسلامی هاوسەنگو پابەند بە ڕێبازی پێشینی چاك (السلف الصالح)ەوەن.

٦- هەرچەندە ئەم ڕوونكردنەوە (شرح)ەیە، كاتی خۆی بە بیستودوو دەرس گوتراوەتەوە، بەڵام بە پێویستم نەزانی ئاماژە بە سەرەتاو كۆتایی دەرسەكان بكەم، هەركاتێكیش بە پێویستم زانی، ناوو نیشانی ڕوونكەرەوە بۆ باسو بابەتەكان دادەنێم.

٧- نامیلکەکەی (الطحاوي)، سەرجەم بۆ (١٠٥) خاڵو بڕگە دابەشکراوە کە بێگومان، کارئاسانییەکی باش دەکات بۆ دۆزینەوەی باسو بابەتە لەیەکچووەکانیو، هەرکات وشەی (خاڵ)مان بەکارهێنا - لەم ڕوونکردنەوەیەدا - ئەوە مەبەستمان پێی بڕگەکانی (مَتْن)ەکەی (أبو جعفر الطحاوي)یە (خوا لێی خۆشبێ).

٨- دیارە کاتی خۆی بۆ ئامادەکردنی ئەو دەرسانەی کە لە ژێر ناوو نیشانی: {ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی}دا پێشکەشکراون، لە کۆمەڵێك شەرحو لێکدانەوەی (مَتن)ەکەی (الطحاوي) بەهرەمەند بووم، بەلاّم لە هەموویان زیاتر شەرحێکی (إبن أبي العِزِّ الحَنفي) بوو، هەر بەناوی: (شرح العقيدة الطحاوية)، بەلاّم بێگومان ئەوەی ئەو کاتە عەقلّم نەیبڕیبێ، لێم وەرنەگرتوونو مەرجیش نیە هەرچی پێم باش بووە، لێم وەرگرتبێ، ، چونکە لەکاتی گوتنەوەی دەرسەکاندا، بەس مەتنو نامیلکەکەی (الطحاوي)یم بەدەستەوە دەگرت، وەك بێتەوە یادم.

خواش (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) بە باشترین شێوە پاداشتی سەرجەم ئەو زاناو پێشەوایانەمان بداتەوە کە دەریایەکی پڕ لە گەوهەرو مرواریبیان، لە بەرهەمو کەلەپووری هەمە جۆری خۆیان بۆ بەجێهێشتووین.

هیواداریشم ئەم کتێبە، ببێتە مایەی بەرچاو ڕوونبوونەوەی زیاتری براو خوشکە مسوڵمانەکانم، بەتایبەت چینی گەنجو تازە پێگەیشتوو کە لەم ڕۆژگارەدا بەهۆی شەپۆلی ماددیگەراییو دنیا پەرستییەوە، فشارێکی زۆر لەسەر عەقڵو دڵیان هەیەو، هەرچی زیاتر پێویستییان بە ئیمانو عەقیدەی ڕاستو ساغو دامەزراوو نەلەخشاوی ئیسلامیی هەیە، تاکو لە خلیسکانو هەڵە پارێزراوبن کە تووشیش بوون، زوو هەڵسنەوەو بگەڕێنەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٢١ذي الحجة ١٤٣٤ك
٢٦تشرینی یەکەمی ٢٠١٣ز
بەغداد/ ئەنجوومەنی نوێنەران

# ( أبو جعفر الطحاوي ) كێیە ؟

(شمس الدين الذهبـي) لە كتێبە ناودارەكەی خۆی (سِيَرُ الأَعْلام النُّبلاء) بەرگی (١٥) لاپەڕە (٢٧-٣٣)دا باسی (الطَّحاوي) كردوەو گەلێك شتی لەبارەوە خستۆتە ڕوو، ئێمەش گوڵبژێرێكی قسەكانی وی دەكەین لە چەند خاڵێكی گوشراودا:

## ١) ناوو شـۆرەتی:

(الذهبـي): گوتوویەتی: (الإمـام العَلاّمـة، الحـافظ الكـبير، مُحَدِّث الـديار المصـرية وفقيهها: أبو جعفر أحمد بن محمد بن سلامة بـن سَـلَمة بـن عبـدالملك، الأزديُّ الحَجْـريُّ المِصريُّ الطَّحاوي الحَنَفيّ).

كەواتە: (أبو جعفر) ناوی (أحمد كـوڕی محمـد كـوڕی سـلامة كـوڕی سـلمة كـوڕی عـبدالملك)ە، لە هۆزی (حَجْر الأزدي)یەو لە (مصـر) نیشـتەجێ بووەو (حنفي) مـەزهـەب بووە.

خەڵكی گوندی (طَحا) بووە لە گوندەكانی (مصـر) و، هـەربەو گوندەشـەوە شـۆرەتی دەركردوەو، بێگومـان (أبو جعفر)یش (كنية)یەتی.

## ٢) ساڵی لەدایك بوونو كۆچی دوایی كردنی:

(الذهبـي) لەبارەی مێژووی لەدایك بوونی (طحاوي)یەوە دوو ڕای هێناون:

یەكیان دەڵێ: لە ساڵی (٢٣٩)ی كۆچیی دا لەدایك بووەو، ئەوی دیكەشیان دەڵێ: لەساڵی (٢٣٨)دا لەدایك بووە.

وە لە ساڵی (٣٢١)دا كۆچی دوایی كردوە.

كەواتە: طەحاويی (٨٣-٨٤) ساڵ ژیاوە لە هەردووك سەدەی سێیەم‌و چوارەمی كۆچیی دا لە ڕۆژگاری حوكمڕانیی عەبباسییەكان دا.

## ٣) طەحاویی، سەرەتا شافیعی مەزهەب بووە و دوایی بۆتە حەنەفیی مەزهەب:

(أبو إسحاق) لە كتێبی (طبقات الفقهاء)دا گوتوویەتی:

{وأبو جعفر الطحاوي انتهت إليه رئاسة أصحاب أبي حنيفة بمصر. أخذ العلم عن أبي جعفر ابن أبي عمران، وأبي حازم وغيرهما، وكان شافعياً يقرأ على أبي إبراهيم المزني. فقال له يوماً: والله لا جاء منك شيء! فَغَضِبَ أبو جعفر من ذلك، وانتقل إلى أبي جعفر ابن أبي عمران، فلمّا صنَّف مُخْتَصَرَهُ قال: رحم الله أبا إبراهيم لو كان حياً لكفّر عن يمينه}.

واتە: (أبو جعفر الطحاوي) لە ڕۆژگاری خۆی دا سەرۆكی حەنەفییەكان بوو لە میسر، زانیاری لە (أبی جعفر بن أبی عمران)و (أبی حازم)و غەیری ئەوانیش وەرگرتبوو.

لەپێش دا شافیعیی مەزهەب بوو، دەرسی لەلای (أبي إبراهيم المُزَني) دەخوێند، ڕۆژێك پێی گوت: بەخوا تۆ نابی بەهیچ ! (أبو جعفر)یش لەو قسەیە تووڕەبوو، وەچووە لای (إبن أبی عمران) ئنجا كاتێك (المختصر)ەكەی خۆی نووسی - كە دیارە كتێبێكی گرنگە لە (فقە)دا- گوتی: خوا ڕەحم بە (أبو إبراهيم) - مامۆستا شافیعی مەزهەبەكەی- بكات، ئەگەر مابایە كەفارەتی سوێندەكەی دەدا - كە گوتبووی نابی بەهیچ -.

## ٤) كتێب‌و بەرهەمەكانی طەحاویی:

دیارە طەحاویی لە هەردووك بواری فەرموودەناسیی (علم الحديث)و شەرعزانیی (علم الفقه)دا زانایەكی زەبر دەست بووە وەك (الذّهبي) گوتوویەتی: (وَبَرَزَ في علم الحديث وفي الفقه، وتفقّه بالقاضي أحمد بن أبي عمران الحَنَفِيِّ، وَجَمَع وصنَّفَ).

ئەو كتێبانەش كە پێیان ناسراوە ئەمانەن:

١- (إختلاف العلماء) ٢- (الشّروط). ٣- (أحكام القرآن).
٤- (معاني الآثار). ٥- (المختصر). ٦- (العقيدة الطحاوية)...

### ٥) ڕای زانایان لەبارەیەوە:

(الذهبي) لەبارەیەوە گوتوویەتی: {الإمام العَلاّمة الحافظ الكبير، محدِّث الديّار المصرية وفقيهها} واتە: پێشەوای عەللامە، فەرموودە زۆر لەبەری گەورە، فەرموودەناس و شەرعزانی وڵاتی میصر...

هەروەها گوتوویەتی: {من نظر في تواليف هذا الإمام عَلِمَ مَحَلَّه من العلم، وسَعَةَ معارفه...}. واتە: هەرکەسێك سەرنجی دانراوەکانی ئەو پێشەوایە بدات، پێگەی وی لە زانست دەزانێ، وە فراوانیی زانستەکانی وی بۆ دەردەکەوێ..

هەروەها (أبو سعيد يونس) وەك (الذهبي) لێیەوە نەقڵ کردوە لەبارەیەوە گوتوویەتی:

{...كان ثقةً، ثَبْتاً فقيهاً عاقِلاً، لم يُخَلِّف مِثْلَهُ...}

واتە: متمانە پێکراوو دامەزراوو شەرعزان و تێگەیشتوو بوو، دوای وی زانای هاوتای وی نەبووە....

دیارە هەرکام لە وشەی (ثقة) و (ثبت) دوو زاراوەی تایبەتی بواری فەرموودەناسین و ئەوپەڕی ستایش دەگەیەنن بۆ زاناو شارەزایانی ئەو بوارە.

خوا پاداشتی طەحاویی بداتەوەو پلەو پایەی بەرزو بەرزتر بکاتەوە، منیش پێم وایە بەهرەمەند بوونی زانایان بەتایبەت و مسوڵمانان بەگشتی لە کتێب و بەرهەمەکانی ئەو پێشەوایە بەگشتیی و، بەتایبەت نامیلکەکە (العقيدة الطحاوية) بەڵگەو نیشانەیەکی دیکەی پایەبەرزیی و بۆ خوا سوڵحاویی و متمانە پێکراوییەتی، کە دیارە ئەم بنچینەیە تایبەت نیە بە (طحاوي)یەوەو بنچینەیەکی گشتی یە بۆ هەڵسەنگاندنی زانایان و پێشەوایان.

الحَمْدُ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾النساء.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾الأحزاب.

أَمَّا بَعْدُ: فإِنَّ أَصْدَقَ الحَديث كَلاَمُ الله وَخَيْرَ الْهَدِي، هدْيُ مُحَمَّد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[1].

بەڕێزان!

دەمەوێ ئەوەتان پێ بڵێم، كە بابەتی عەقیدە لە ئیسلامدا، بایەخێكی زۆرو هەرە گرنگی هەیە، ، چونكە دەتوانین بڵێین: ئیسلام دوو بەشە: وەك چۆن درەختێك لە دوو بەش پێك دێت: ١- ڕەگو ڕیشە. ٢- قەدو لقو پۆپو گەڵا.

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هاوەڵانی بەڕێزی فێردەكرد پێش هەر قسەیەكی گرنگ بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییكردن (خِطْبة)و .. هتد، ئەم وتارە هەركام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێكی هێناوە.

ئیسلامیش دوو بەشە:

١- ئیمانو بیرو بڕوا.

٢- بەڕێوەچوونو ڕەفتار كردن بە پێی ئەو ئیمانو بیرو بڕوایە.

دیارە ئینسانیش بە هۆی ئیمانو عەقیدەوە[1] دەزانێ كێیە؟ لە كوێوە هاتوە؟ بۆ كوێ دەچێ؟ چی پێ سپێردراوە؟ كێ خاوەنییەتی؟ ئەو بوونەوەرە بۆچی دروست كراوە؟ چی تێدایە؟ عەقیدە هەموو ئەو مەسەلانە ڕوون دەكاتەوە، بە هۆی شەریعەتیشەوە ئینسان دەزانێ كە دەبێ هەڵوێستی بەرانبەر خوا چۆن بێ؟ لەگەڵ خەڵكیدا چۆن بێ؟ لەگەڵ دەوروبەریدا چۆن ڕەفتار بكات؟ چۆن بەڕێوە بچێ؟ حەڵاڵ چییە؟ حەڕام چییە؟

هەتا عەقیدە نەبێ، شەریعەت بەڕێوە نابردرێ، وەك چۆن هەتا بناغە نەبێ، دیوار دانامەزرێ، هەتا درەخت ڕەگو ڕیشەی بە زەویدا نەچێتە خوار، قەدو لقو پۆپی بۆ پەیدا نابێ كەواتە: چ لەسەر ئاستی تاك، چ لەسەر ئاستی كۆمەڵ، چاوەڕێی پابەندیی‌و ئیلتیزامو گەردنكەچیی‌و فەرمانبەریی كردنی خواو پێغەمبەر ناكرێ، هەتا ئیمانو عەقیدە نەبێ.

بەڵام پرسیارێكی گرنگ لێرەدا سەر هەڵدەدات: ئایا عەقیدە دەبێ لە چ سەرچاوەیەكەوە وەربگیرێ؟

ئیمانو عەقیدە -وەك باسم كرد- یانی هەڵوێستی ئینسان بەرانبەر بە خوا (سبحانه وتعالى)، بەرانبەر بە پێغەمبەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) كە خوا ناردوونی بۆ ڕێ پیشاندانی ئینسانەكان، بەرانبەر بە سەرەتای ئینسان، بەرانبەر بە چارەنووسو سەرەنجامی، بەرانبەر بە هەموو ئەو شتانە كە لە بوونەوەردا ئینسان هەڵسوكەوتیان لەگەڵدا دەكات، وەك: فریشتەكان، جندەكان، ... هتد.

دیارە عەقیدەیەك بەو گرنگیی‌و بایەخەوە، نابێ لەسەر بنچینەی گومانو بیرو بۆچوونی ئینسان بنیات بنرێ، ، چونكە ئینسان یەكجار دەژی‌و یەك تەمەنی پێدراوە، ئەو

---

١) لە بەرگی یەكەمی كتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی...)دا پێناسەی هەركام لە (ئیمان)و (عەقیدە)و باسی جیاوازیی نێوانیانمان كردوە.

ژیانو تەمەنەش، دەبێ لەسەر ئەساسێكی زۆر مسۆگەرو ڕوون بەڕێ بكات، ئینسان پێنج شەش تەمەنی پێنەدراوە، تەمەنێكی بەو شێوە بگوزەرێنێ، تەمەنێكی دیكەی بە شێوەیەكی دی بگوزەرێنێ، هەروەها تەمەنەكانی دیكەشی بە چەند شێوەیەكی دیكەی جیاواز .

كەواتە: دەبێ ئەو تەمەنە لەسەر بنچینەیەكی زۆر مسۆگەرو ڕوون بەڕێ بكات، ئەو بنچینە مسۆگەرو ڕوونەش، دەبێ لە سەرچاوەیەكەوە دیاری كرابێ كە زانیارییەكی دەورە دەر (محیط)ی هەبێ، زانیارییەك كە هیچی لێ ون نابێ، ئەویش بەس خوای بێ وێنەیە كەواتە: دەبێ ئیمانو عەقیدە لە وەحییەوە وەربگیرێ، نەك لە گومانەوە، ئێمەش تەنیا دوو سەرچاوەمان هەن بۆ وەحی:

١)- وەحی ڕاستەوخۆ (مُباشر) كە قورئانە، ڕاستەوخۆ بە بێژەو ماناوە، خوا بۆ پێغەمبەری (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ناردوە.
٢)- وەحی ناڕاستەوخۆ (غَير مُباشر) كە سوننەتی پێغەمبەری خوایە (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، مانایەكەی لە خواوەو، بێژە (لفظ)و داڕشتنەكەی لە خۆیەوەیە.

كەواتە: دەبێ ئیمانو عەقیدە لە قورئانو سوننەتەوە هەڵبهێنجین، هەروەك شەریعەتیش، هەر دەبێ لەوێوە هەڵبهێنجرێ، ئەدی دەوری زانایان چییە لە ڕوون كردنەوەی عەقیدەدا؟ دەوری زانایان هەر ئەوەیە كە ئەوەی خواو پێغەمبەر (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویانە ڕوونی بكەنەوەو ڕۆشنی بكەنەوە كە خوای پەروەردگار ئەوەی مەبەست بووەو پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئاوای دەوێت، هەروەها لە بواری ڕاگەیاندنی شەریعەتیشدا بەهەمان شێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە لە بواری عەقیدەدا، زانایان بەس ئەركیان ڕوونكردنەوەی ئەوەیە كە خواو پێغەمبەر(صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویانە، بەڵام لە بواری شەریعەتدا، زانایان بواریان فراوانترە، بە تایبەت لە بوارەكانی سیاسییو ئابوورییو كۆمەڵایەتییدا كە عەقڵ دەتوانێ ئەسپی خۆیان تێدا تاودا، دەنا شەریعەتیش لە بواری عیبادەتدا، دیسان عەقڵ دەبێ تەنها ئەوەی خواو پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّم) فەرموویانە، ڕوونی بکاتەوەو ڕایگەیەنێ، دەنا بۆ خۆی، بۆی نیە هیچ زیادەی بخاتە سەر، یان هیچ عیبادەتێکی دیکەی تازە دابێنێ.

دیارە هەر ئەوەش- واتە: بواری ئیمانو عەقیدەو عیبادەت- مەبەستە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ}حديث صحيح[1] واتە: هەر کەسێك شتێك لەم ئایینەماندا دابێنێ، ئەوە ڕەتکراوەیە.

چونکە لەبواری عەقیدەو عیبادەت دا - کە بواری مامەڵە کردنی مرۆڤـــە لەگـەڵ خوادا- وەحی نوختەی خستۆتە سەر پیت، بۆیە هەرچـی دابهێنـرێ زیادەیـەو ناڕەوایـەو ناوونیشانی (بِدعة) دەیگرێتەوە، بە پێچەوانەی بواری هەڵسو کەوتەکان (المُعامَلات)ەوە کە شەریعەت دەقی کەمی هێناوەو بۆشایی زۆری بەجێهێشتوە، تـاکو مرۆڤــ بـەهۆی ئیجتیهادی عەقڵەوە بەگوێرەی پێداویستی خۆی، پڕی بکاتەوە.

ئنجا خوێنەری بەڕێز! بە پێویستی دەزانم کە لەم بەراییەدا، ئاماژە بەمەســەلەیەکی گرنگ بکەم لە بواری ئیمانو عەقیدەدا، بە تایبەتیو لەبواری ناسینی ئیسلامو دینداریدا بە گشتییو، دەڵێین: عەقیدە لە ئیسلامدا واتە: بیرو بڕوا کە لە قورئاندا زیاتر بە وشەی ئیمان تەعبیری لێکراوە، بەردی بناغەی ئیسلامەو، یەکەمین هـەنگاوی مســوڵمانەتییەو بناغەو بنچینەیەکە، هەموو شتەکانی دیکـە لەســەر ئـەو بنیـات دەنـرێن، ئنجـا ئـەو عەقیدەیە ،هەتا پتەوتر بێ، دەگونجێ ئەو بینایەی کە لەسەری بنیات دەنرێ دامــەزراوتر بێ، وە هەتا ئەو عەقیدەیە ڕاستتر بـێو سـاف تـر بـێو چـاکتر بـێ، دەگـونجێ ئـەوەی لەسەریشی بنیات دەنرێ، تەواوتر بێ، وە هیچ کەس لەوانەی کە لە ئیسلامدا شـارەزان، لەسەر ئەو مەسەلەیە مشتو مڕیان نیە کە عەقیدە بەردی بناغەیەو یەکەمین هەنگاوە، یەکەمین کارە کە ئینسان دەبێ بیکا، بەڵگەش لەو بارەوە زۆرن، هەر بۆ وێنە ئەوەی کە لە هەموو شتێك زەقترە، خوا (جل جلالـه) لە قورئاندا هیچ فەرمانێك ئاڕاستەی مســوڵمانان ناکات، مەگەر پێشێ پێیان دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئـەی ئەوانـەی

---

١ ) مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: البُخَارِيُّ برقم: ( ٢٦٩٧ )، وَمُسْلِمٌ برقم: ( ١٧١٨ ).

ئیمانتان هێناوە! یانی: ئەی ئەوانەی عەقیدەتان هەیە کە بڕواتان هەیە، ، چونکە مەعقوول نیە مرۆڤ هەڵگری بیرو بڕوای ئیسلام نەبێ‌و، موکەللەف بکرێ بە جێبەجێ کردنی ئیسلام، شەریعەت لە عەقیدەوە هەڵدەقوڵێ، کارو کردەوەی چاك لە ئیمانەوە سەرچاوە دەگرێ، عیبادەت و ئەخلاق و جموجۆڵی ئیسلامییانە: لە خواناسی (معرفة الله)و خوا بەیەکگرتن (توحید)ەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەوە شتێکە، دان پێدا هێنراوە، بەڵام ئەوەی من لێرەدا دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە:

ئیسلام وەك چۆن بە تەنیا تەصەووف‌و تەزکیەی نەفسی ڕووت نیە ، عەقیدەی بە تەنیاش نیەو، سیاسەتی بە تەنیاش نیەو، جەنگ‌و چەکداریی تەنیاش نیە، بۆیە لە ڕاستیدا هەروەك گوتمان، ئیمان‌و عەقیدە، شتێکی بایەخدارەو بەردی بناغەیە، بەڵام ئەگەر بکرێتە دەستە چیلەو بیانووی ئەوە کەهەموو ماندوبوونێکمان‌و هەموو وزەو هێزمان، خەرج بکەین بۆ چەسپاندنی عەقیدەو، ئاگامان لە هەموو شتێکی دیکە ببڕێ، ئەوە لەڕاستیدا پێچەوانەی خودی ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامییە، ، چونکە هەندێك لەوانەی کە جم‌و جۆڵی ئیسلامیی دەکەن، بە بەهانەی ئەوە کەئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی بەردی بناغەیەو بنچینەیەو، لە هەموو شتێکی دیکە گرنگترەو، هەموو شتەکانی دیکە لەسەر ئەو بنیات دەنرێن، دەیانەوێ وا خەڵکی حاڵی بکەن کە کاری ئێمە ئەمڕۆ بەس کاری دامەزراندنی ئیمان‌و چەسپاندنی عەقیدەیەو، پێگەیاندنی خەڵکییە لە عەقیدە کە ئەمە هەم هەقی تێدایەو، هەم باتڵیشی ڕەگەڵ کەوتوە: هەقە کە ئیمان‌و عەقیدە ئەوەندە گرنگەو جێی بایەخەو یەکەمین هەنگاوە، بەڵام ناهەقە کە ئێمە هەموو وزەو توانامان لەو بوارەدا کورت هەڵبێنین، ، چونکە لە ڕاستیدا ئیمان بۆ ئەوەیە کەدوایی کردەوەی چاکی بە دوادا بێ‌و، عەقیدە بۆ ئەوەیە کە دوایی شەریعەتی پێ جێبەجێ بکرێ.

ئنجا لە ڕاستییدا، هۆی سەرەکیی دووبەرەکیی مسوڵمانان‌و جیاوازیی‌و ناکۆکییشیان، بۆ ئەو جۆرە حاڵی بوونە دەگەڕێتەوە:

١) یەکێکیان لەبەر ئەوەی عەقیدە زۆر گرنگە، دەڵێ: ئیسلام بەس عەقیدەیەو ئیمانە.

٢) ئەوی دیكە دەڵێ: نەخێر ئیسلام بەس بریتیە لە تەزكیەی نەفس‌و تەصەووف‌و لایەنی مەعنەویی‌و ئەخلاقیی.

٣) یەكێكی دی دەڵێ: نەخێر ئیسلام بەس بریتیە لە سیاسەت‌و بنیاتنانی دەوڵەت.

٤) ئەوی دیكە دەڵێ: نا، ئیسلام بەس جەنگ‌و چەكەو هێزی بازوو دەستەڵات‌و هەیبەتە.

٥) ئەوی دیكە دەڵێ: نەخێر، ئیسلام هەمووی لە پەروەردەدا كورت هەڵدێ...هتد.

ئنجا هەر كامێك لەوانەش، لەوانی دیكە حاڵی نابێ، بەڵام ئێمە خوا پشتیوان بێ، دەبێ كارێكی ئیسلامیی وا بكەین كە هەموو برینەكانی میللەتەكەمانی پێ سارێژبن‌و كارێكی ئیسلامیی وا بكەین كە هەموو ئایەت‌و فەرموودەكانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) جێبەجێ بكەین، كارێكی ئیسلامی وا بكەین كە مسوڵمانانێكی هاوسەنگ‌و، كۆمەڵگایەكی مسوڵمانی هاوسەنگ (متَّزن) پەروەردە بكەین، نەك مسوڵمانی لاسەنگ‌و لاتەڵ، عەقیدەی هەبێ، بەڵام تەزكیەی نەفسی نەبێ، یان تەزكیەی نەفسی تێدا زۆر گەشەدار بێ، بەڵام ئاگای لە سیاسەت نەبێ، یان سیاسەتی هەبێ، بەڵام عیبادەتی نەبێ، یان فیقهی هەبێ، بەڵام بیری پاكسازیی‌و چاكسازیی نەبێ، ئەوە هەمووی لاتەڵیی‌و لاسەنگییە.

بە ڕاستییش بۆیە ئەمڕۆ مسوڵمانان نەك هەر لە كوردستان، بەڵكو لە هەموو جیهانی ئیسلامییدا، ناتوانن دەوری خۆیان ببینن، ، چونكە لاتەڵن‌و لاسەنگن، لایەكیان گرتووەو چەندلایان فەرامۆش كردوون، هەر ئەوەش هۆكاری بنەڕەتیی پارچە پارچە بوونی مسوڵمانانە، ، چونكە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) لە سوڕەتی (المائدة)دا سەبارەت بە پارچە پارچە بوون‌و بەش بەش بوونی نەصرانییەكان، دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ١٤﴾

واتە: لەوانەی گوتیان: ئێمە نەصرانیین، بەڵێن‌و پەیمانمان لێ وەرگرتن، ئنجا بەشێك لەوەی كە ئامۆژگارییان پێی كرابوو، (بەشێك لەوەی كە پێیان ڕاگەیەنرابوو لە دینی خوایان) فەرامۆش كرد، ئیهمالیان كرد، لەئەنجامدا دوژمنایەتیی‌و كینەو یەكدی بوغزاندنمان لە نێواندا پەیدا كردن، هەتا ڕۆژی قیامەت.

یانی: لە ئەنجامی ئەوەدا كە بەشێك لە ئایینی خوایان واز لێهێنا، دووبەرەكیی و ناكۆكییان كەوتە نێوان.

كەواتە: بەردەوام دووبەرەكیی‌و جیاوازیی‌و ناكۆكیی نێوانی ئەهلی دین، لەوەدایە كە دەبنە بەش بەش، هەر بەشێكیان ئەندازەیەك لە دینەكە دەگرێ‌و، ئەوەی دیكە واز لێدەهێنێ، با لەو بارەوە وێنەیەك بێنمەوە: دەگێڕنەوە جارێك كۆمەڵێك كوێر دەبەن، دەچن بۆ ولاتێك، تاكو بزانن فیل چ دەعبایەكە، هەڵبەتە چاویان نیە، تاكو دیمەنی گشتیی فیل ببینن‌و وێنەی هەمووی وەربگرن، بە ناچاریی پەنا دەبەنە بەر هەستی دەست لێدان (اللمس)، یەكێكیان دەست لە گوێی دەدات، یەكێكیان دەست لە لمۆزی دەدات، یەكێكیان دەست لە لاقی دەدات، یەكێكیان دەست لە پشتی دەدات... هتد، كوێرەكان دەگەڕێنەوە بۆ ولاتی خۆیان‌و پێیان دەڵێن: ئەرێ فیلتان دەست لێدا؟ دەڵێن: بەڵێ، دەڵێن: چۆن بوو؟ ئەوەی كە دەستی لە گوێی داوە دەڵێ: فیل شتێكە وەك گەلای درەخت پانە، ئەوەی دەستی لە لاقی داوە، دەڵێ: نەخێر ڕاست ناكات، فیل شتێكە وەك كۆڵەگە وایە، ئەوەی دەستی لە لمۆزی داوە، دەڵێ: نەخێر، هیچتان ڕاست ناكەن، فیل شتێكە وەك گۆچان وایە، ئەوەی دەستی لە پشتی داوە، دەڵێ: نەخێر، ئێوە هەر لێی تێنەگەیشتوون، فیل وەك تەختە دارێكی پان وایە،دیارە هەر كامێك لەو كوێرانە لە ناسینی بەشێكی فیل دا ڕاست دەكەن، بەڵام لە ناسینی هەموویدا بە هەڵەداچوون، ئنجا لە ڕاستیدا ئەمڕۆش مسوڵمانان وایان لێهاتوە، ئەوەی كە دەڵێ: ئیسلام بەس تەزكیەی نەفس‌و عیبادەت‌و ئەخلاقە، لەوەدا كە ئیسلام ئەو لایەنەی تێدایە، ڕاست دەكات، بەڵام ئەوە كە ئیسلام هەر ئەوەندە بێ، بە هەڵەدا چووە، ئەوەی كەدەڵێ: ئیسلام بریتیە لە سیاسەت‌و سەرپەرشتیكردنی كۆمەڵگاو هەبوونی دام‌و دەزگاو دروست كردنی دەوڵەت، ڕاست دەكات، بەڵام كەدەڵێ: ئیسلام هەر

ئەوەندەیە، نەخێر ڕاست ناكات، هەروەها بیرو بۆ چوونەكانی دیكەش كە پێشتر باسمانكردن، لە نێو مسوڵمانان هەموویان بەو شێوەیەن، بەڵام بێگومان ئیسلام هەموو ئەوانەیە بە تێكڕاو هیچ كام لەوانە نیە بە تەنیا.

بەڵێ، ئینسان كە هەموو ئیسلامی گرت، لە هەموو كەس حاڵی دەبێ، بۆ وێنە: لەگەڵ بابای سۆفیدا دەگەیە ئەنجامێك،بەمەرجێ سۆفیەكی پابەندبێ بە قورئانو سوننەتەوەو لە سنووری شەریعەتدا تەصەووفو تەزكیەی خۆی بكات، لەگەڵی دەگەیە لێك تێگەیشتن، هەروەها بەهەمان شێوە لەگەڵ بابای سەلەفییدا كە كاری خۆی لەوەدا دەبینێ عەقیدە ڕابگەیەنێ، دەگەیە ئەنجامێكو پێی دەڵێی: بەڵێ، عەقیدە گرنگەو جێی بایەخە، بەڵام ئیسلام بەس بە تەنیا عەقیدە نیە، لەگەڵ ئەوانی دیكەش دا بەهەمان شێوە دەگەیە ئەنجام، بە مەرجێك بۆ خۆت ئیسلامێكی فراوانت پێ بێ، بەڵام ئەو بەشێكی پێیەو، تۆش بەشێكت پێ بێ، قەت ناگەیە ئەنجام، ، چونكە لەو حاڵەتەدا لێك تێنەگەیشتن ڕوو دەداتو، هەر كامێكیان ئەوی دیكە ڕەفز دەكاتو دەڵێ: هەر ئەوەی خۆم ڕاستە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿...وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾﴾ الروم.

واتە: لە هاوبەشدانەران مەبن ئەوانەی كە دینەكەیان بەش بەش كرد (هەریەكەیان بەشێكیان لێ گرت)، ئنجا هەر كۆمەڵێك بەوەی كە خۆی لەسەریەتی پێی دڵخۆشە.

سۆفی دەڵێ: ئیسلام بەس سۆفییایەتییە، سەلەفی دەڵێ: ئیسلام بەس سەلەفییایەتییە، ئەوەی دیكە دەڵێ: ئیسلام بەس ئەوەیە، یان بەس ئەوەیە، نەخێر، هیچ كام لەوانە نیە بە تەنیا، بەڵكو هەموویانی تێدایە، هەر شتەو لە شوێنو قۆناغی خۆیداو بە قەبارەی خۆی.

***

## دەستپێکی کتێبەکەی طەحاویی

دیارە ئەو کتێبەی کە ئێمە دەمانەوێ شەرحی بکەین، بریتیە لە مەتنی (عەقیدەی طەحاویی) کە شەرحو تەفسیری زۆری لەسەرکراون، مەتنەکە لە چەند خاڵێکدا نووسراوە، ئنجا ئێمە هەر دەرسە، چەند خاڵێکی تێدا دەخەینە ڕوو و، بە پشتیوانی خوای پەروەردگار، شەرحو تەفسیریان لەسەر دەکەین، کتێبەکە ئاوا دەست پێدەکات:

> بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم، الحَمْدُ لله رَبِّ العَالَمِين، قَالَ الْعَلاَّمَةُ حُجَّةُ الإِسْلامِ أَبُو جَعْفَرٍ الْوَرَّاقُ الطَّحَاوِيُّ:

واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانییان، زانای پایە بەرز، ئەبو جەعفەری وەڕراق کە بە ناوبانگە بە طەحاویی (لە میسر دانیشتوە) گوتوویەتی:

> هَذَا ذِكْرُ بَيَانِ عَقِيدَةِ أَهْلِ السُّنَّةِ وَالْجَمَاعَةِ:

واتە: ئەمە باسی ڕوونکردنەوەی بیرو بڕوای ئەهلی سوننەتو جەماعەتە، دیارە ئەهلی سوننەتو جەماعەت ، یانی: تێکڕای مسوڵمانانێك کە خەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و خەتی جێنشینە سەر ڕاستەکانیان بەرنەداوەو گرتوویانە، لە بەرانبەر ئەهلی سوننەتو جەماعەتدا، چەند کۆمەڵو دەستەیەك هەن، کەمو زۆر لە خەتی پێغەمبەرو (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) جێنشینە سەر ڕاستەکان ترازاون، وەك: (شیعە، موعتەزیلە، مورجیئە، قەدەرییە، جەهمییە، جەبرییە ...هتد).

بەڵام وەك دواییش لە میانەی دەرسەكانمان دەیخەینە ڕوو، ئەوەی لێرەدا (أبو جعفر الطحاوي) گوتوویەتی، هەرچەندە لە زۆربەی خاڵەكانیدا پێكاویەتی كە تەعبیری كردوە لە عەقیدەو بیرو بۆچوونەكانی زاناو پێشەوایانی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، بەڵام بێگومان، لە هەندێك خاڵیشدا نەیپێكاوەو، زیاتر ڕاو بۆچوونی (أبو حنيفة: النعمان بن ثابت الكوفي) و دوو قوتابییەكەی: (أبو يوسف) و (محمد بن الحسن الشيباني) هێناوە.

پاشان دەڵێ:

> عَلَى مَذْهَبِ فُقَهَاءِ الْمِلَّةِ: أَبِي حَنِيفَةَ النُّعْمَانِ بْنِ ثَابِتٍ الْكُوفِيِّ، وَأَبِي يوسف يَعْقُوبَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ الأَنْصَارِيِّ، وَأَبِي عَبْدِ اللهِ مُحَمَّدِ بْنِ الْحَسَنِ الشَّيْبَانِيِّ "رِضْوَانُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ أَجْمَعِينَ" وَمَا يَعْتَقِدُونَ مِنْ أُصُولِ الدِّينِ، و يَدِينُونَ بِهِ رَبَّ الْعَالَمِينَ:

واتە: بە پێی تێگەیشتنو بۆچوونی ئەبو حەنیفە و، (هەردووك قوتابییە بەڕێزەكەی ئەبو یوسفو، موحەممەدی كوڕی حەسەنی شەیبانیی (رضي الله عنهم)) دامناوە، ئەوەی كەئەوان بڕوایان پێبووە لە بنچینەكانی ئایین كە خوای پەروەردگاری جیهانەكانیان پێ پەرستوە.

ئنجا لە ڕاستییدا ئەوەی كەئەوانیش گوتوویانە، هەموو ئەهلی ئیسلام، ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەسەری یەكدەنگن، جگە لە چەند مەسەلەیەك كە دوایی لە میانەی دەرسەكانماندا بە پشتیوانی خوای پەروەرگار ئاماژەیان پێدەكەین.

شایانی باسیشە زانایانی ئیسلام بۆ عەقیدەو ئیمان، هەركام لە (أصول الدين)، (علم الكلام)، (علم التوحيد)یان بەكارهێناوە، هەروەها پێشیان گوتوە: (الفِقْهُ الأكْبَر)، ئەبو حەنیفە كتێبێكی هەیە بەو ناوە كە عەقیدەی ئیسلامیی تێدا ڕوون كردۆتەوە.

نووسەر (خوا لێی خۆشبێ) لە پێنج خاڵی یەکەمدا: (١-٥) باسی گرینگترین‌و گەورەترین‌و سەرەکییترین بابەتی ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی دەکات کە بریتیە لە خوا بەیەکگرتن (التوحید)، بە ماناو چەمکی فراوان‌و گشتگیریی کە یەکتایی‌و بێ هاوەڵیی خوا لە:

١) بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگاریەتیی‌و خاوەندارێتیی (الخالقية والربوبية والمالكية)دا.

٢) پەرستراوێتیی (الأُلوهية)دا.

٣) ناوو سیفەتە هەرە چاك‌و بەرزەکانی (أسماؤه الحسنى وصفاته العليا)دا دەگرێتەوە.

وە دەڵێ:

> نَقُولُ فِي تَوْحِيدِ اللهِ مُعْتَقِدِينَ بِتَوْفِيقِ اللهِ:

واتە: ئێمە لە یەکتایی خوادا، دەربارەی خوا بە یەکگرتن‌و یەکتاپەرستیی، بڕوامان وایەو بە یارمەتیی خوا دەڵێین:

ئنجا یەکسەر دێتە سەر خاڵی یەکەم:

> ١- (إِنَّ اللهَ وَاحِدٌ لاَ شَرِيكَ لَهُ):

واتە: بێگومان خوا یەکەو هاوبەشی نیە.

بەڕێزان!

خوا بە یەکگرتن، شتێکە فیطرەت‌و سروشتی ئینسان، عەقڵ‌و زانست‌و، بوونەوەرو کائینات، شایەدیی لەسەر دەدەن، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَآ إِلَٰهَ

﴿إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾﴾

آل عمران، واتە: خوا شاهێدیی دا، هەروەها فریشتەكانیش، هەروەها زانایانیش كە بێجگە لەو، هیچ پەرستراوێك نیە، خوا بەس بۆ خۆیەتی شایستەی پەرستران، خوایەك كە بەدیهێنەری بوونەوەرو ئینسان بێ، خوایەك كە شایستەی پەرستران بێ، خوایەك كە خاوەنی هەموو سیفەتو ناوی بەرزی پەسندە، تەنیایە كە (الله)یە، لە زمانی عەرەبیدا پێی دەڵێن: (الله)، لە زمانی كوردیدا پێی دەڵێن: (خوا)، لە فارسی پێی دەڵێن: (خدا)، لە زمانی ئینگلیزیی پێی دەڵێن: (God)، ئنجا خوا بەیەكگرتن لە سێ بواردا خۆی دەنوێنێ:

## یەكەم: خوا بەیەكگرتن لە پەروەردگاریەتیی دا (توحید الله في الربوبية):

واتە: بەس خوا بەدیهێنەرە، بەس خوا پەروەردگارە، بەس خوا مشوورگێڕو سەرپەرشتیكەری ئەو كەون و كائیناتەیە، ئەم جۆرە خوا بەیەكگرتنە، هەموو تائیفەكان، هەموو میللەتەكان، زۆربەی زۆری ئینسانەكان لەسەر ئەوە ڕێككەوتوون كە تەنیا خوا دروستكەرو بەدیهێنەرو پەروەردگارە، كێشەی پێغەمبەرانیش (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) لەگەڵ میللەتانیان، هەرگیز لەو بارەوە نەبووە كە بیانەوێ بە خەڵكەكەی خۆیان بسەلمێنن كە تەنیا یەك بەدیهێنەر (خالق) هەیە، چونكە ئەو قسەیە هەموویان بۆخۆیان گوتوویانە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴿٢٥﴾﴾ لقمان.

واتە: ئەگەر لێیان بپرسی كێ ئاسمانەكانو زەوی دروست كردوە؟ دەڵێن: خوا (الله)، ئەوە بەنسبەت یەكتایی خوا لە بەدیهێنەرێتیی و پەروەردگارێتییدا.

## دووەم: خـوا بەیەكگـرتن لـە پەرسـتـراوێتیی دا (توحیـد الله فـي الألوهیة):

ئولوهییەت، یانی: (المعبودية) پەرستراوێتیی، ئەوەی كەجێی كێشەو مشتو مڕ بووە، لە نێوان پێغەمبـەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)و میللەتەكانیانـدا، بڕگـەی دووەمـی خـوا بەیەكگرتن بووە كە بریتیە لە یەكتایی خوا لە پەرستراوێتییدا، گەلـەكانیان گوتوویانـە: بەڵێ، هەر خوا بەدیهێنەرە، هـەر خـوا پـەروەردگارە، هـەر خـوا دەژیـێنێ، هـەر خـوا دەمرێنێو ڕزقو ڕۆزی دەدا، زیندوو دەكاتەوەو ... هتد، بەڵام هاوبەشیان بۆ خوا بڕیـار داوە لە پەرستندا، واتە: لە (ألوهیـة)دا، نەك لە پەروەردگارێتییو بەدیهێنەرێتییدا، كەم بوون ئەوانەی كە بڕوایان بە دوو دروستكەر، یان زیاتر بووبێ، (ثنوية)و مـەجووسـییەكان بڕوایان بە خوای خێرو شەڕ بووە: یەزدانو ئەهریمەن، یەزدان خوای خێر، یان ئاهورامزدا، ئەهریمەن خوای شەڕ كە تاریكیی هێمای خوای شەڕ بووە، ڕووناكییش ڕەمزی خوای خێـر بووە، بە بۆ چوونی ئەوان، بەڵام ئەوانیش دیسان دەڵێن: خوای شەڕیش، هەر خوای خێـر دروستی كردوە! وەك چۆن ئێمە دەڵێین: خوا هەیەو شـەیتان هەیـە، شـەیتان مـەخلووقی خوایە، بەڵام ئەوان لە شەیتان زیاتر دەسەڵاتیان بە ئەهریمەن داوە.

خوا دەربارەی نەصـڕانییەكان دەفـەرموێ: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ...﴿٧٣﴾﴾المائدة، واتە: بە تەئكید بێبڕوان ئەوانەی گوتیـان: خـوا سـێیەمی سێیەكانە، بەڵام دیسان ئەوانیش دەڵێن: خوای دروستكەرو بەدیهێنەر هـەر یەكـە، خـوا عیساشی (علیه السلام) دروست كردوە، دایكیشی دروست كردوە، ئەوان عیساو مەریەم بە خوا دەزانن، بەڵام بە دوو خوای دروستكراوی خوایان دەزانن كە پێیان دەگوترێ :(الأَقَانِيمُ

الثَّلاثَـةَ)[١]، بە هەرحاڵ ئەوەی کەجێی مشتو مڕو کێشە بووە، لە نێـوان پێغەمبـەرانو میللەتەکانیاندا، مەسەلەی پەرستراوێتیی خوا بووە، نەك بەدیهێنەرایەتیی خوا، چـونکە ئەوە کە هەر خوا دروستکەرو بەدیهێنەرەو غەیری وی هەمووی دروست کـراوە، چـونکە شتێکی ئەوەندە ڕۆشنەو ئەوەندە بە هێزە، کەس ناتوانێ نکوولّیی لێ بکـات، ئنجـا لـە مەسەلەی پەرستراوێتیی خواش دا، خەڵك لە دوو بواردا بە هەڵەدا چوون کە ئێستا هەندێ کەس وادەزانێ، تەنیا لەیەك بوارياندا بە هەڵەدا چوون ڕوویداوە کـە بـواری دروشـمەکان (شعائر)ە، ئێستا کەسانێك کە باسی عەقیدەی ئیسلامیی دەکەن، باسی ئیمان دەکەنو بە حیسابی خۆیان جەنگیان ئیعلان کردوە لەدژی شیركو بیدعەتو لادان لە شەریعەت، پێیان وایە کێشەی مسوڵمانان هەر ئەوەیە کە خەڵك لە بواری دروشمەکان (شـعائر)دا لـە خـوا بەیەکگرتن دوور کەوتوونەتەوە، بەڵام نەخێر، هەر لە سەرەتای مێـژووەوە، تـا ئێسـتاش، ئەوەی کەزیانی لە خوا بەیەکگرتنو لە عەقیدەی ئیسلامیی داوە، ئەو دوو بوارە بووە:

یەکەم: بواری دروشمەکان، وەك: نوێژو ڕۆژوو و زەکاتو حەجو زیکرو قوربانیی سەربڕینو سوێند بە خوا خواردن، ئەوانە، کە زیاتر شتی مەعنەوییو شەخصیین، لەو بـوارەدا خەڵك تووشی شیرك بووە، وەك: سوێند بە غەیری خوا خواردن، پشت بە غەیری خوا بەستن، لە غەیری خوا ترسان، قوربانیی سەربڕین بۆ غەیری خوا، بڕوا بوون بەوەی کە فڵان شەخص، فڵان مەزارە، زەرەرو قازانجی بەدەستە، هەروەها چەند جۆرو شـێوەی دیکە.

دووەم: بواری دووەم کە خەڵك تێیدا بە هەڵەدا چووە، لە پەرستراوێتیی خـوادا، بـواری بەرنامـەکان (شـرائع)ە کە ئەوە ئێستا زۆر کەم لە لایەن ئەوانـەوە کـە بـە حیسـاب بەرگریی لە عـەقیدەی ئیسلامیی دەکەن، باس دەکرێ ! (شـعائر) کۆی (شـعيرة)یـە، واتە: دروشم، خوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن

---

١) الأقانيم جمع أقنوم: الأصل والأقانيم الثلاثة عند النصارى: الأب، الإبن، الروح القدس. المعجم الوسيط، ص٧٦٣.

تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ الحج، هەر كەسێك دروشمەكانی دینی خـوا بـە بـەرزو مـەزن بگرێ، ئەوە بەرهەمی تەقوایە كە لە دڵاندایە.

(شرائع)یش كۆی (شریعة)یە واتە: یاسا، دەستوور، بەرنامـە. بەڵێ، وەك چۆن خەڵك لە بواری دروشمەكاندا تووشی شیركو بیدعەتو لادانو ترازان بووە، بەهەمان شێوە لە بواری بەرنامـەكان (شرائع)یشدا. بۆ وێنـە: ئەگەر بابایەكی سۆفیو دەروێش، یـان مسـوڵمانێكی نەزان، دینداریيەكەی بە شێوەیەك دەكات كە دەچـێتە قـاڵبی شـیركو بیدعەتـەوە، بـە شێوەیەك لەگەڵ خوادا ڕەفتار دەكات كە پێی وایە خوا هاوبەشی هەن، یان شێخیش، یان فلان كەسیش زەرەرو قازانجی بەدەستە، یان دەتوانێ لە گوناهان خۆشـبێ، یـان دەتـوانێ بیپارێزێ، یان دەوڵەمـەندی بكات، یان شیفای بۆ بنێرێ، یان هەژاری بكات... هتد.

بەڵێ، ئەگەر بابایەكی مسوڵمانی سادە، سۆفیو دەروێشو...هتدێك لێرەدا بە هەڵەدا چووە، كەسانێكی دیكەش هەن كە لەولاڕا بەهەڵەدا چوون كە پێیان وایە ئەبو جـەهلێك، نەمروودێك، فیرعـەونێك، قاڕوونێك، بۆی هەیە بەرنامەی ژیانیان بۆ دابنێ، لایەنـەكانی ئابووریيو سیاسيیو كۆمـەڵایەتیيو هەموو لایەنەكانی ژیانیـان بـۆ دابڕێـژێ، بـە پێـی ئارەزووی خۆی!! لادان لە فەرمانی خواو لە دینی خوا، لە بواری دروشمەكاندا بێت، یان لە بواری بەرنامـەكان دابێت، هەر هاوبەش بۆ خوا بڕیار دانەو، هەردووكی هەر پێچـەوانەی خوا بەیەككگرتنە، بۆچی؟ ، چونكە خوای پەروەردگار لەسـەر زاری یوسـوف دەفـەرموێ: ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ ﴾ یوسـوف، پێغەمبەر یوسوف كە موناقەشەو وتو وێژی لەگەڵ دوو هاوەڵە زیندانییەكەی دابووە، لـە كۆتایی قسەكانیدا دەفەرموێ: ﴿ ...إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ... ﴿٤٠﴾ ﴾ یوسوف، واتە: حـوكم، یانی: بەرنامە دانان بۆ ژیانی خەڵكو ڕێكخستنی ژیـانی خـەڵك بـە هـۆی بەرنامـەكان (شرائع)ەوە، ئەوە هەر مافی خوایەو كەسی دیكە مافی ئەوەی نیـە ﴿ ...أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ

﴿إِلَّآ إِيَّاهُ...﴾ يوسف، واتە: خوای تاكو پاك فەرمانی كردوە كە بەس ئەو بپەرستن، یانی: ئەگەر لە بواری حوكمو بەرنامە دانان بۆ ژیاندا، ڕوو لە غەیری خوا بكەن، ئەوە غەیری خواتان پەرستوە، هەروەك چۆن ئەگەر بتەوێ خوا بەیەكگر (موحّد) بی، دەبێ نوێژەكەت بەس بۆ خوا بێ، بەس پشت بە خوا ببەستی، بەس لە خوا بترسی، بەس خوات خۆش بوێ[1]، بەس قوربانی بۆ خوا سەربڕی، خوا بەیەكگرتن بەوەش دەبێ كە بەرنامەی ژیانت لە بوارەكانی: سیاسیی، ئابووریی، كۆمەڵایەتی...هتددا، بەس لە خوا وەربگری، چونكە هەر ئەو خوایەی كە كاروباری مزگەوتو نوێژو ڕۆژوو حەجو زەكاتو قوربانیی سەربڕینو نەزرو ئەوانەت بۆ ڕێك دەخات، هەر ئەو خوایەشە كە بەرنامەی بوارەكانی: سیاسییو ئابووریيو كۆمەڵایەتی بۆ تۆ ڕێكخستوە[2]، ئیدی لە هەر بوارێكیاندا لە فەرمانی خوا دەربچی، مانای وایە تۆ پێچەوانەی خوا بەیەكگرتن لە پەرستندا جووڵایەوەو،مانای وایە تۆ تەنیا خوات نەپەرستوەو، لە پەرستندا خوات بەتاك نەگرتوەو، هاوبەشت بۆ خوا پەیداكردوە، ئەوە مەسەلەیەكی زۆر گرنگە كە بە حەقیقەت گەلێك لە مسوڵمانان تێیدا بەهەڵەدا چوونو پێیان وایە بەڵێ، ئەگەر كەسێك وا بزانێ كە فلان شێخ، یان فلان كەس، یان فلان مەزارگەو قەبر، زەرەرو قازانجێكی بەدەستە، ئەوە شیركەو هاوبەش بۆ خوا بڕیاردانە، بەڵام پێی وانیە، ئەگەر لە بوارەكانی: سیاسییو ئابووریيو كۆمەڵایەتییو لە هەر بوارێكی دیكەی ژیاندا، ڕووی لە غەیری بەرنامەی خوا كرد، دیسان تووشی شیرك بووە!! لەگەڵ ئەوەشدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَـٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ...﴾ الشوری، واتە: ئایا چەند هاوبەشێكیان هەن كە شتێكیان بۆیان بڕیار دەدەن لە دین (دین یانی: بەرنامەی

---

١) واتە: ترسو خۆشەویستییو پشت بەستنێك كە بگاتە ئەوپەڕیی، ئەوە تەنیا شایستەی خوایە، نەك هەموو جۆرەكانیان بە ڕەهایی.

٢) واتە: وەك هێڵە گشتییەكانیان.

ژیان) ﴿... مَا لَمْ يَأْذَنْ بِهِ اللَّهُ ...﴾ کە خوا ئیزنی لەسەر نیە کەواتە: هەر کەسێك سەبارەت بە ژیانی خەڵکی، دەستوورێك، یاسایەك دابنێ کە ئیزنی خوای لەسەر نەبێ، ئیزنی شەریعەتی خوای لەسەر نەبێ، ئەوە مانای وایە خۆی بە شەریکی خوا لە قەڵەم داوە، هەر کەسێکیش لەو یاسایەدا دوای بکەوێ، مانای وایە بە کردەوە دانی بەوە داناوە کە خوا هاوبەشێکی هەیە.

بە کورتیی: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿...أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ... ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف، بزانن کە دروست کردن (خلق) هەر هی خوایە، فەرمانو حوکم (أمر)یش هەر هی خوایە، هەروەك چۆن بەس خوا هەموو شتێکی خوڵقاندوە، بەس دەبێ خواش بەرنامە دابنێ، وەك چۆن بڕوات بەوە هەیە کە تەنیا خوا دروستکەر (خالق)ە، دەبێ بڕواشت بەوە هەبێ کە تەنیا خوا بەرنامە دانەر (حاکم)و بەس خوا (آمر)ە، دروست کردن بەس هی خوایەو، حوکمو فەرمانیش بەس مافی خوای بێ هاوتایە، هیچ کەسی دیکە ئەو مافەی نیە لە ژیانی ئینساندا حوکمو فەرمانی ڕەهای هەبێ، مەگەر حوکمو فەرمانی خوا بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە[1]، وەك پێشەواو زانایان کە بەرنامەو فەرمانی خوایان بۆ ئێمە ڕوون کردۆتەوە.

## سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتەکانیدا (توحید الله في الأسماء والصفات):

دەبێ ئێمە بڕوامان وابێ کە بەس خوا خاوەنی هەموو ناوو سیفەتێکی بەرزو پەسندە، هیچ کەسو هیچ شتێك لە دروست کراوەکانی خوا، لە سیفەتەکانی خوادا بەشدار نیەو هیچ کەسو هیچ شتێك، ناوو سیفەتێکی نیە وەك ناوو سیفەتی خوا، یانی زانیاریی خوا، تواناو دەستەڵاتی خوا، ویستی خوا، حیکمەتی خوا، بەزەیی خوا، عیززەتی خوا، هەموو

[1]) بۆیە گوتوومە: (حوکمو فەرمانی ڕەها) چونکە زانایانیش لە ڕێی ئیجتیهادەوە، بۆیان هەیە یاساو فەتوای جۆراو جۆر لە شەریعەت هەڵهێنجن.

سیفەتەكانی خـوا، تایبـەتن بـە خۆیـەوە، هـیچ شـتێكی دیكـە، سـیفەتێكی وەك سیفەتەكانی خوای پەروەدگاری نیە، چونكە كـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿... لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ...﴿١١﴾﴾ الشوری، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە، یانی، نەلـە زاتیـدا، نەلـە سیفەتیدا، لە هیچ شتێكدا، جا ئینسان وەختێك بەخوابەیەكگر (موحِّد)و یەكتاپەرستی ڕاست دادەنرێ كە بڕوای بـەوە بێـت، بـەس خـوا دروسـتكەرو بەدیهێنـەرە، ئـەوە خـوا بەیەكگرتنە لە پەروەردگارێتیدا، بڕواشی وابێ كە بـەس خـوا پەرسـتراوە، چ لـە بـواری دروشمەكاندا، چ لە بواری بەرنامـەكان (شرائع)دا، دەبێ هەم بەدروشمەكان (شـعائر) بـەس خوا بپەرستێ‌و، هەم بە بەرنامـەكان (شرائع)یش بەس خوا بپەرستێ، بڕواشی بەوەبێ كـە ئەو ناوو سیفەتە بەرزو پەسندانەی خوا هەنیی، هیچ كام لە دروست كراوەكانی، ئەو نـاو سیفەتانەیان نیە.

ئنجا دێتە سەر خاڵی دووەم كە بێگومـان هەر جەختكردنەوەیە لەسەر نێوەڕۆكی خاڵی یەكەم، چونكە مـادام خوا تاك‌و تەنیاو بێ هاوەڵ بێ: (إِنَّ اللهَ وَاحِدٌ لاَ شَرِيكَ لَـهُ) كەواتە: ئاشكرایە نابێ وێنەو هاوتاشی هەبێ، وەك دەڵێ:

**٢) ( وَلا شَـــيْءَ مِثْلُـــهُ ) :**

واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە، ئەوە تەئكیدی ئەوەی پێشەوەیە، یانی: هیچ شـتێك وەك خـوا نیـە، نەلەزاتیـدا، نەلەسـیفەتیدا، چـۆن؟ چـونكە: غـەیری خـوا، هـەمووی بەدیهێنراوو دروستكراوەو هەمووی ئاتاجە، بەڵام خوا ئاتاج نیە، دەوڵەمەنـدو بێنیـازە، غـەیری خوا، هەمـووی بوونەكەی لەخواوەیە، بوونێكی خوازراو (مستعار)ی هەیە، خاوەنی بوونێكی ئەصیل‌و ڕەسەن نیە، بوونەكەی لە خواوە بۆ هاتووە، بەڵام خوا بوونێكی زاتیی هەیە، بوونەكەی لە خۆوەیە، غەیری خوا هەمووی، كاتێك بووە كە نـەبووە، بـەڵام خـوا

کاتێك نەبووە کە نەبووبێ، وەك دوایی دەیگەینێ، واتە: بوونی خوا، سەرەتایەکی نیە، بەڵام بوونی غەیری خوا، هەمووی سەرەتایەکی هەیە.

جا لێرەدا وەڵامی ئەو پرسیارە، زۆر بە ئاسانیی دەدرێتەوە: کە دەڵێ: باشە ئەگەر خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، ئەدی کێ خوای بەدیهێناوە؟ کێ خوای دروست کردوە؟ دەبێ بڵێین: ئەو پرسیارە شتێکی نامەعقوولە، بۆچی؟؟ دەڵێین: چونکە، کە دەڵێی: ئەگەر خوا بەدیهێنەرەو هەموو شتێکی بەدیهێناوە، ئەدی کێ خوای بەدیهێناوە؟ ئەگەر تۆ لە وشەی خوای بەدیهێنەر (خالق) حاڵی بوویای، ئەو پرسیارەت نەدەکرد، تۆ بڕوات بە خوای بەدیهێنەر هەیە؟ دەڵێ: بەڵێ، بڕوام بەوە هەیە خوا هەیە، دەڵێین: باشە خوا کێیە؟ خوا ئەو زاتەیە کە بەدیهێنەری غەیری خۆیەتی، خوا ئەو زاتەیە کە بوونەکەی سەرەتای نیە، پێویستی بە هیچ کەس نیەو، هەموو کەس پێویستی بەو هەیە، ئنجا تۆ کە لە پێناسەی خوای بەدیهێنەر تێگەیشتیوحاڵی بووی، جارێکی دیکە ناڵێی: کێ خوای دروست کردوە، بۆچی؟ چونکە خوا ئەو کەسەیە کە خوای نیە، خوا ئەو کەسەیە کە بەدیهێنەرێکی نیە، ئنجا تۆ چۆن پێشێ دان بەبوونی خوا دادەنێی، کە خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، دوایی دەتەوێ لەنێو مەخلووقەکانیدا بەدیهێنەرێکی بۆ بدۆزیەوەو،قسەی پێشووت هەڵدەوەشێنییەوە؟!

ئنجا دێتە سەر خاڵی سێیەم، بێگومان ئەم خاڵی سێیەمەش، هەر جەختکردنەوەیە لە نێوەڕۆکی خاڵی یەکەم، ، چونکە خوایەکی تاكو بێ وێنەو هاوەڵ، بێگومان هیچ کەسو هیچ شتێك دەستەوستانی ناکات:

٣) ( وَلا شَـــيْءَ يُعْــــجِـــزُهُ ) :

واتە: هیچ شتێك خوای زاڵو باڵادەست دەستەوستان ناکات، هیچ شتێك نیە کە لە ژێر ڕکێفی خوا ڕزگاری ببێو، خوا دەستەڵاتی بەسەردا نەشکێ، وەك جندە بڕوادارەکان کە لە سوورەتی (الجن)دا هاتوە، دەڵێن: ﴿ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعْجِزَ ٱللَّهَ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَن نُّعْجِزَهُۥ هَرَبًا

﴿١٢﴾ الجن، واتە: ئێمە یەقینمان(١) هەیە كە ناتوانین خوا دەستەوستان بكەین، ناتوانین لەژێر دەسەڵاتی ئەو دەربازبین‌و ڕابكەین.

دوایی دێتە سەر خاڵی چوارەم كە بێگومان بەرهەم‌و دەرەنجامی مەنتیقییانەی خاڵەكانی پێشوویەتی، چونكە:

خوایەكی تاكی بێ هاوەڵی بێ وێنەی خاوەنی باڵا دەستیی ڕەها، شایستەی ئەوەیە كە بەتەنیا بپەرسترێ‌و هیچ شتێك‌و هیچ كەس نەكرێتە هاوبەشی، لە پەرستران‌و بەندایەتیی بۆ كراندا، بۆیە دەڵێ:

## ٤) ( وَلا إِلَـــهَ غَيــــرُهُ ) :

واتە: جگە لە خوا، هیچ پەرستراوی دیكە نین، لێرەدا یەكێك بۆی هەیە بڵێ: چۆن پەرستراوی دیكە نین؟ ئەدی ئەوەنیە مەسیحییەكان، عیساو دایكیشی دەپەرستن؟ زەردەشتییەكان، ئاگردەپەرستن؟ بت پەرستەكان، بت‌و صەنەم دەپەرستن؟ طاغووتییەكان، ئەبوجەهل‌و قاڕوون‌و فیرعەونەكان دەپەرستن؟... هتد، چۆن هیچ پەرستراو نین؟

هەڵبەتە ئەوە خوای پەروەردگار لە قورئاندا زۆر تەئكیدی كردۆتەوە كە بێجگە لە خوا، هیچ پەرستراو نین، لە وەڵامدا دەڵێین: خوای زاناو توانا نافەرموێ: لە دنیای واقیعدا هیچ پەرستراو نین، بەڵكو دەفەرموێ: لە حەقیقەتدا، نابێ هیچ پەرستراو هەبن، یانی: هیچ كەس‌و هیچ شتێك نیە، شایستەی پەرستران بێ، ئەوانە كە ئینسانێك دەپەرستن، تاغووتێك دەپەرستن، حیزبێك دەپەرستن، ئارەزووی نەفسی خۆیان دەپەرستن، ئەستێرەو ڕۆژو مانگ دەپەرستن، شتێك دەپەرستن كە شایستەی پەرستران نیەو دروستكراوێكە وەك خۆیان.

---

١) وشەی (ظن) هەرچەندە لە ئەسڵدا بەمانای (گومان)، یان (گومانی زاڵ)ە، بەڵام جاری واشە بەمانای زانیاریی‌و دڵنیایی (العلم الیقین) دێ‌و، ئەوەش بەپێی سیاق دەزانرێ، بڕوانە: المعجم الوسیط، ص٥٧٨.

یانی: لێرەدا كە دەفەرموێ: (وَلا إِلَهَ غَيْرُهُ)، هیچ پەرستراوێك نیە غەیری خوا، یانی: هیچ پەرستراوێك نیە كە شایستەی پەرستراو بەندایەتیی بۆ كران بێ

پاشان دێتە سەروەسفكردنی خوا (عزّ وجلّ) بە دوو سیفەتی بەرزی، كە زەقترین سیفەتنی بۆ جیاكردنەوەی لە دروستكراوەكانی كە هەر بوونێتی (أزليَّة)و، هەرماوێتی (أبديّة)ینو دەڵێ:

**٥) ( قَدِيمٌ بِلا ابْتِدَاءٍ دَائِمٌ بِلا انْتِهَاءٍ ) :**

واتە: خوا ئەزەلییە، لە مێژینەیە، بەبێ سەرەتا، هەمیشەییە بەبێ كۆتایی، یانی: بوونی خوا، هیچ سەرەتایەكی نیە، كاتێك نەبووە كە خوا نەبووبێ (دَائِمٌ بِلا انْتِهَاءٍ)، هەمیشەییشە بەبێ كۆتایی.

مەولەویی شاعیر (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە كتێبی (فضيلة)دا كە لەبواری عەقیدەی ئیسلامییدا نووسیویەتی، دەڵێ:

مِنْ أَين أَين يُنْتَمى إِلَيْهِ      مَتَى مَتَى حَتَّى أَتَى عَلَيْهِ
كَم سَاعِدٍ يَصِلُهُ في كُمٍّ كَمْ      فَكَيفَ لا كَيْفٌ مَعَ الكيفِ يُضَم؟!

(مِنْ أَين أَينٌ ينتمى إِلَيْهِ) دەڵێ: كوێ لە كوێیە، (كوێ) یانی: (مكان) شوێن، (ينتمى إِلَيْهِ) هەتا پاڵبدرێتە لای، كاتێك بووە بوونەوەر نەبووە، مانای وایە شوێن نەبووە، كاتێك كە ماددە نەبووە، یانی: زەمانو مەكان نیە، ، چونكە (زَمان): بریتیە لە درێژ بوونەوەی ماددە، لە ڕووی كاتەوە، (مَكان): بریتیە لە درێژبوونەوەی ماددە لە ڕووی جیسمەوە كەواتە: كاتو شوێن (الزمان والمكان) بە هۆی ماددەوە پەیدادەبن كە ماددە نەبوو، مانای وایە ئەوانیش نین. بۆیە دەڵێ: كوێ، یانی: شوێن (مَكان) كوا هەبووە، هەتا خوا پاڵبدرێتە لای؟!

(مَتَى مَتَى حَتَّى أَتَى عَلَيْهِ) کاتیش کەی هەبووە، هەتا بەسەر خوای گەورەدا بێ، چونکە کات بریتییە لە جموجۆڵی ماددە، ماددە جووڵە دەکات کات پەیدا دەبێ کە ماددە نەبووە، مانای وایە کاتیش نەبووە.

کەواتە: ئەو کەسەی دەڵێ: چۆن کاتێك نەبوە کە خوا نەبووبێ؟ دەڵێین: جا کات بەهۆی ماددەوە پەیدا بووە، خواش ماددەی خولقاندوە، یان دەڵێ: خوا لە کوێیە؟ دەڵێین: بەر لەوەی خوا ماددە بخولقێنێو بوونەوەر بخولقێنێ، کاتو شوێن نەبوون، ئەو کات چۆن بووە، ئێستاش هەروایە، دیارە هەموو شتێکیش پێویستی بە خوایە، خوا پێویستی بە غەیری خۆی نیەو پێویستی بە شوێنێك نیە تێیدا بحەوێتەوە.

پاشان مەولەویی تاو گۆزیی (خوا لێی خۆشبێ) دەڵێ:

(کَم ساعِدٍ یَصِلُهُ فِي کُمِّ کَمْ؟) واتە: چەند باسك لە قۆڵی چەندێتییەوە پێیدەگەن؟ (فَکَیفَ لا کَیْفٌ مَعَ الکیفِ یُضَم؟!) واتە: جا چۆن بێ چۆنییەتی لەگەڵ چۆنییەتییدا یەکدەگرێ؟ دیارە مەبەستی لە: (لا کیف) خوای بێ وێنەیە کە چۆنییەتییەکی زانراوی بۆ ئێمە نیە، چونکە ﴿...لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ...﴿١١﴾﴾ الشوری کەواتە: مەولەویی نەفی دەکات کە بەهیچ کام لە چوار ئامرازەکانی پرسیار کردن لە شتە ماددیەکانو دروستکراوەکان کە پرسیاریان پێ لە: شوێنو کاتو چەندێتیو چۆنییەتی دەکرێ، بگونجێ پرسیار لەبارەی خواوە بکرێ، ، چونکە خوای بەرزو بێ وێنە، لە سەرووی کاتو شوێنەوەیەو لە دەرەوەی جوغزی دروستکراوەکانیدایە!

## پوختەی ئەوەی لە پێنج خاڵی ڕابردوودا باسکرا:

ئێمە مادام خۆمان بە مسوڵمان دەزانین، دەبێ بڕوامان وابێ کە خوا تاكو تەنیاو بێ هاوەڵە، لەزاتیو لەسیفەتیدا، وەك چۆن خوا تاکە بەدیهێنەرە، دەبێ تاکە پەرستراویش بێ، ئەو ناوو سیفەتانەی کە خوا هەنیی، هیچ شتێكو هیچ کەسی دیکە نینی، هیچ کەسی دیکە، لە هیچ ناوو سیفەتێکی خوادا بەشدار نیە، خوا دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، خوا تاقە پەرستراوە لە ڕووی حەقیقەتەوە، نەك لە ڕووی واقیعەوە، لە ڕووی

واقیعەوە شتی دیکەو خەڵکی دیکەش لەگەڵ خوادا دەپەرستریٚ، بەڵام لە ڕووی حەقیقەتەوە، ئەو شتانەو ئەو کەسانە کە دەپەرسترێن، شایستەی پەرستران نین، بوونی خوا سەرەتایەکی نیە، هەروەك بوونەکەی کۆتاییشی نیە.

## دوو ڕوونکردنەوەی پێویست لەسەر خاڵی چوارەم و پێنجەم

ڕوونکردنەوەی یەکەم: تایبەتە بە خاڵی چوارەم کە دەڵیٚ: (وَلَا إِلَهَ غَيْرُهُ)، لە چەند شوێنی قورئان دا ئەو شێوە تەعبیرە، لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران بەکارهاتوە (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) کە ڕوو بە میللەتانی خۆیان قسەیان کردوە، یەکەمین قسەیان ئەوە بووە: ﴿...يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ... ﴿٦٥﴾﴾ الأعراف، واتە: ئەی کۆمەڵو گەلی من! خوا بپەرستن، جگە لەو، پەرستراوێکی دیکەتان نیە، وشەی (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّٰه) کە کراوە بە کلیلی دەرگای هاتنە نێو ئیسلام، کراوە بە ناوونیشانو دروشمی مسوڵمانەتی، لەگەڵ (مُحَمَّد رَسُولُ الله)دا، ئەو وشەیە گرنگییەکی یەکجار زۆری هەیە، وەك پێشتر باسم کرد، زۆربەی خەڵکی، پەرستراوێتیی خوا زیاتر لە جێبەجیٚ کردنی دروشمەکان (شعائر)دا دەبینن، وەك نوێژو ڕۆژوو و زەکاتو زیکرو دوعاو قوربانیی سەربڕینو پشت بە خوا بەستنو خۆشویستنو لە خوا ترسانو سوێند پیٚ خواردن...، پێیان وانیە کە وەك چۆن خوا (جلّ جلاله) بەدروشمەکان (شعائر) کە باسمان کرد دەپەرستریٚ، بە یاسادانان (شرائع)یش دەپەرستریٚ، بەڵکو پێیان وایە کە مرۆڤ تەنیا لە بواری دروشمەکاندا بەنددار (مقيَّد)ەو، دەبیٚ بە پێی فەرمانی خوا بەڕێوە بچیٚو خوا بپەرستیٚ، بەڵام لە بواری یاسادانانو بەرنامە داناندا ئازادە، ڕوو لە هەر لایەك بکات، هەر پەیڕەوێك بکاتە بەرنامەی ژیانی خۆی ئازادە، دیارە هۆی ئەو بەهەڵەداچوونەش لەوبارەوە دەگەڕێتەوە بۆ دوو شت:

یەکەم: بە گشتیی، خەڵك دینداریی بە شتێکی شەخصیی دەزانن، زۆربەی خەڵکی ئێستا واتاو چەمکی دینیان لیٚ بۆتەوە شتێکی تاکیی، لێیان بۆتەوە شتێکی مەعنەویی ڕووت، یانی: خەڵك بۆیە پێیان وایە خوا پەرستیی، یانی: جێبەجیٚ کردنی

دروشمەكان، ، چونكە وا دەزانن دین پەیوەندییەكە لە نێوان ئینسانو خوادا، ئینسان وەك تاك، خواش وەك پەروەردگارو بەدیهێنەرو پەرستراو، نوێژو ڕۆژوو و زەكاتو حەجو زیكرو پاڕانەوەو...هتد، هەموویان شتی تاكین، دینیش شتێكی شەخصییە كەواتە: خوا پەرستیی، یانی: جێبەجێ كردنی ئەو شتە تاكییانە!.

دووەم: دیسان هەندێكی دیكە لە خەڵكی، پێیان وایە دین شتێكی مەعنەویی ڕووتەو، پەیوەندیی بە ڕووحی ئینسانەوە هەیە، پەیوەندیی بە قەبرو قیامەتو لایەنی مەعنەویی‌و ئەخلاقیی ئینسانەوە هەیە، نازانن كە دین، وێڕای ئەوەی شتێكی تاكییە، شتێكی كۆمەڵییشەو، وێڕای ئەوەی كەشتێكی مەعنەوییە، شتێكی ماددییشە، ، چونكە دین وەك چۆن بۆ هیدایەتی ئینسان هاتوە، بۆ ڕێكخستنی ژیانیش هاتوە، واتە: وەك چۆن هاتوە بۆ پاككردنەوەی دڵو دەروونو جوانكردنی ئەخلاقو پەیوەستكردنی ئینسان بە خوای پەروەردگارەوە، هاتوە ژیانیش ڕێك بخات، لە لایەنەكانی: ئابووریی‌و سیاسیی‌و كۆمەڵایەتیی ... هتدداو، لەخەڵكی بگەیەنێ، چۆن لەگەڵ دەورو بەریان ڕەفتار بكەن كەواتە: لێرەوە دەزانین بۆچی خەڵك خواپەرستیی لە جێبەجێكردنی دروشمەكاندا كورت هەڵدەهێنن؟

لە سۆنگەی ئەوەوە كە دینداریی تەنیا بە شتێكی تاكیی (فَردي) دەزانن، یان بە شتێكی مەعنەویی، بەڵام لە حەقیقەتدا وانیە، بەڵێ، دین بەرنامەیە بۆ تاك، بەڵام لەهەمان كاتدا، بەرنامەشە بۆ كۆمەڵ، بەڵێ، دین[1] بەرنامەیەكی مەعنەوییە، بەڵام لە هەمان كاتدا بەرنامەیەكی شارستانیی‌و مەدەنییشە.

ڕوونكردنەوەی دووەم: دەربارەی خاڵی پێنجەم كە دانەر دەڵێ: (قَدِيمٌ بِلا ابْتِدَاءٍ دَائِمٌ بِلا انْتِهَاءٍ)، واتە: خوا لە مێژینەیە، بەبێ سەرەتا، هەمیشەییە بەبێ كۆتایی، لە سوورەتی

---

١) دیارە مەبەستمان لە وشەی (دین) ئیسلامەو، ئیسلامی بەرجەستە لە قورئانو سوننەتدا، ئنجا بەكارهێنانی وشەی (دین)یش بەگشتیی‌و بەبێ دیاری كردن كە كام (دین)؟ دەرهاوێشتەی خراپی لێدەكەونەوە، وەك لەكتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی...)دا باسمكردوەو بەزۆریی عەلمانییەكانیش تووشی ئەو هەڵەیە بوونو دەبن!.

(الحديد)دا، خوای پەروەردگار لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ وَٱلظَّاهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئەو یەکەمینو دوامینو، ئاشکراو پەنهانەو، بەهەموو شتێك زانایە.

بەڕاستیی ئەگەر نووسەر ئەو ئایەتە قورئانییەی بەکارهێنابا، زۆر چاکتر بوو، ، چونکە (قديم) بە شتێکی لە مێژینەو کۆن دەگوترێ، بەڵام مەرج نیە سەرەتای نەبێ، بەڵام (الأوَّل) یەکەمین، تەصەوور ناکرێ شتێکی لە پێشەوە هەبووبێ، ئنجا (الآخِر)یش دیسان لە (دائِم) چاکترە، ، چونکە شت هەیە دەوام دەکات، بەڵام مەرج نیە (آخِر) دوامین بێت، بێگومان بەوشە قورئانییەکە چاکتر دەبێکا، ئەگەر گوتبای، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ ﴾، لە جیاتی (قَدِيم) بیگوتبا (الأوَّل)، لە جیاتی (دَائِم) بیگوتبا (الآخِر).

ئنجا لێرەشدا، با تۆزێك باسی ئەو دوو سیفەتە مەزنەی خوای بێ وێنە بکەین:

## أ- بێ سەرەتایی خوا (أولية الله):

خوا (جَلَّ جَلاَلُه) بوونەکەی، بوونێکی بێ سەرەتایە، بۆچی؟ ، چونکە خوا بەدیهێنەرەو، بەدیهێنەریش ئەو کەسەیە کە کەسێك پەیدای نەکردوە، یانی: بوون (وجود)ەکەی شتێکی خودیی (ذاتي)یەو لە خۆیەوەیە، واتە: نەبوون (عَدَم) پێشی نەکەوتوە، بە پێچەوانەی بوونی شتەکانی دی، کە هەمووی دروستکراو (مَخْلوق)ە، ئنجا ئایا ئێمە بۆچی ناچارین بڵێین: خوا یەکەمو بوونەکەی سەرەتایەکی نیە؟! ، چونکە ئەگەر وا نەڵێین، دەبێ پەنا ببەین بۆ دوو شتی دی،کە هەردووکیان هەڵەن:

١) زنجیرەی بێ کۆتایی (التسلسل اللانهائي).

٢) وەستانی (بوون)ی دووشت، یان زیاتر هەرکامیان لەسەر ئەوی دیکە کە (دَور)ی پێدەگوترێ.

ئنجا با بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکی هەرکام لە:

زنجیرەی بێ بڕانەوە (التسلسل اللانهائي)و دەور (الدّور)، دوو وێنە بێنینەوە، بەلاّم سەرەتا دەڵێین:

گیرۆدە بوون بەیەکێك لەو دوانەوە: (التسلسل)و (الّدور) چارەنووسێکی حەتمیی و مسۆگەرە بۆ هەرکەسێك کە مل نەدات بۆ دانهێنان بە بەدیهێنەرایەتیی خوا (الإقرار بخالقية الله)دا.

واتە: هەرکەسێك دان بە بەدیهێنەرایەتی خوادا نەهێنێ، بۆ تەفسیرکردنی سەرهەڵدانو پەیدا بوونی بوونەوەر (کَوْن) کە ئەمەیان: فیترەتو عەقڵو زانستو وەحیو واقیعو مێژوو، دەیخوازن، ناچار دەبێ، پەنا بەرێتە بەر یەکێك لەو دوانە، کە هەردووکیان مەحاڵنو، لەگەڵ عەقڵو زانستو واقیع تێك دەگیرێن!.

## ١) وێنەی زنجیرەی بێ بڕانەوە (التسلسل اللانهائي):

ئەگەر من بڵێم: من ئەم کتێبە دەدەم بە کاك ئەحمەد، بەمەرجێك ئەویش قەڵەمەکەی بدات بە کاك موحەممەدو، ئەویش بەمەرجێك قەڵەمەکەی دەداتە ئەحمەد کە کاك مەحموود دەفتەرەکەی خۆی بداتێو، ئەویش بەمەرجێك فلاّنە کەس سەعاتەکەی خۆی بداتێو.... هەروەها زنجیرەکە بێ پسانەوەو بڕانەوە بەردەوام بێ، بێگومان لەوحاڵەدا من کتێبەکەم نادەمە کاك ئەحمەد، چونکە ئەو شتەی بەمەرجم گرتوە، ناگونجێ بێتەدی. کەواتە: زنجیرەی بێ کۆتایی هەڵەو نامەنتیقییەو، ناگونجێ پەیدا بوونی بوونەوەری پێ تەفسیر بکرێ.

## ٢) وێنەی: دەور (الدّور):

ئەگەر بڵێین: ئاسمان، زەوی دروستکردوەو، زەویش ئاسمانی دروستکردوە، ئەمە مەحاڵە، چونکە هەرکام لە ئاسمانو زەوی، بوون (وجود)یان وەستاو (متوقّف)ە لەسەر بوونی ئەوی دیکەو، ئەوەش مەحاڵە، ، چونکە ئەوە وەك ئەوە وایە بڵێی: هەتا (أ) پەیدا نەبێ (ب) پەیدا نابێو، هەتا (ب)یش پەیدا نەبێ، (أ) پەیدا نابێ کەئاشکرایە لەو

حاڵەتەدا، هیچ کامیان پەیدا نابن. یان دوو کەس هەر کامێکیان هاتنــە ژووری خــۆی بەوی دیکەوە ببەستێ، ئاشکرایە سەرەنجام هیچیان ناچنە ژووری!

کەواتە: ئێمە بۆ ئەوەی زنجیرەی دروستکراوەکان بوون (وجود)ێکی ڕاستەقینەی پەیدا بێت، ناچارین بیبەینە سەر سەرەتایەك، بیبەینە سەر هەبوو (موجود)ێك کە بوونەکەی خواستراو (مستعار) نەبێ، بەڵکو بوونێکی ڕەسەن (ئەصیل) بێ‌و هی خۆی بێ، دەتوانین لەو بارەوە نموونەیەك بێنینەوە: ئەگەر بێین لە ڕۆژئاواوە، تا ڕۆژهەڵات سفر ڕیز بکەین، بەڵام هیچ ژمارەیەکیان لە پشت نەبێ کە خاوەنی نرخێکی ژمارەیی ســەربەخۆ (قیمــة عددیة ذاتیة)، یانی: نە (١) نە (٢) نە (٣)...هتد هیچ ژمارەیەك نەبێ لە پشت ئــەو سفرانە، ئایا ئەو سفرانە هەر بە سفر (٠) نامێننەوە؟؟! با، بەڵام وەرە یەك سفر دابنێ، ژمارەی (١)ی لە پشتەوە دابنێ، قیمەتی پەیدا دەبێ، یەك بۆ خۆی یەکە، سفرێك لــە پێشیەوە بێ، دەیکاتە دە (١٠)، شەش سفری لە پێشەوە بــێ (٠٠٠٠٠٠)، دەیکاتــە یەك ملیۆن (١٠٠٠٠٠٠)، بەڵام ئەگەر لە سفری یەکەم بپرسی، واتە: سفری کۆتایی: تۆ ئەو قیمەتەت لە کوێ هێناوە؟ دەڵێ: لە سفری سەد هەزار بپرسە، لەو بپرسی بلێی: ئەو قیمەتەت لە کوێ هێناوە؟ دەڵێ لە سفری هەزار بپرسە، ئەویش دەڵێ: لە سفری ســەد (١٠٠) بپرسە، ئەویش دەڵێ: لە سفری دە (١٠) بپرسە، دواین سفر دەڵێ: لــە ژمــارە یەك (١) بپرسە، ئەگەر لە یەك (١)ەکەش بپرسی: ئەو قیمەتەت لە کوێ هێنا؟ دەڵێ: هی خۆمە!! دروستکراوەکانیش هەروان، هەر شتێك تۆ دەیبینی، بوونەکەی لە خۆیەوە نیە، من کاتێك بووە نەبووم ، بابم کاتێك بووە نەبووە، باپیرم ... هتد، ئەو بوونــەوەرە کاتێك بووە نەبووە، بەو شێوەیەی ئێستا کەواتە: بوونی هیچ کام لــەو دروســتکراوانە، بوونێکی زاتییو سەربەخۆ نیە، هەمووی دەڵێ: لە پێشەوە بپرسە کەواتە: دەبــێ ئــەو زنجیرە لە شوێنێك ڕابوەستێ کە (بوون)ەکەی (بوون)ێکی خــۆیی (ذاتــي) بــێ، ئــەویش خوایە (جل جلاله)، ﴿ ... وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾ النحل.

## ب- بێ کۆتایی بوونی خوا:

نووسەر گوتوویەتی: (دَائِمٌ بِلا انْتِهَاءٍ) خوا هەمیشەیی یە بەبێ کۆتایی، دیارە بێ کۆتایی (آخر) بوونی خوا، لە بەرانبەر بێ سەرەتا بوون (أوّل) بوونی خوادایە کە هەندێك لە زانایان بە (أزَلِيّ) و (أبَدِيٌّ) بوون،تەعبیریان لێدەکەن، مەبەستیش لەبێ کۆتابوونی خوا ئەوەیە، کە بوون (وجود)ی خوا بەبێ کۆتایی، بەقووڵایی داهاتوو (مستقبل)دا درێژ دەبێتەوە،وەك چۆن بوون (وجود)ی بەبێ سەرەتاو دەستپێك بە قووڵایی ڕابردوو (ماضي)دا درێژ بۆتەوە، بەڵام لێرەدا ئیشکالێك پەیدا دەبێ، ئەویش ئەوەیە: ئێمەش ئەگەر خوا بمانباتە بەهەشتێ، ئێمەش هەمیشەیی (دائِمي) دەبین لە بەهەشت دا وەك خوا؟ چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿... خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا... ﴿٨﴾﴾ البيّنة، واتە: بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، هەروەها بە هەمان شێوە ئەهلی دۆزەخیش بە هەمیشەیی لەدۆزەخدا دەمێننەوە.

کەواتە: ئەگەر بەشێك لە دروستکراوەکانی خوای پەروەردگار کە هەندێکیان بڕوادارانن، لە بەهەشتداو، کافرانن لە دۆزەخدا، ئەوانیش هەمیشەیی بن، ئایا ئەو هەمیشەییەی ئەوان، لەگەڵ هەمیشەیی بوونی خوادا دژایەتیی (تعارض) دروست ناکات؟!

ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەندێ لە دروستکراوەکان، سیفەتێکی خوایان تێدا دێتەدی؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە: ئێمە کە دەڵێین: خوای بەرزو مەزن بوونێکی بێ سەرەتای هەیە، مانای وانیە کە ئەم بوونەوەرەی ئێمە کە تەمەنەکەی ئەوەندە ساڵەیە، لە پێش ئەم بوونەوەرەدا، خوا هیچ دروستکراوێکی دیکەی نەبووە، چونکە خوا لە ئەزەلەوە دروستکەر بووە، کەواتە: وا چاوەڕوان دەکرێ کە دروستکراوی دیکەشی بووبن، جگە لەم بوونەوەرە، هەر خوا بۆ خۆی دەزانێ، چەند بوونەوەری دیکە دروستکراون، ئەمە ڕای پەسندو هەرە بەهێزی زۆربەی زانایانی ئیسلامە، دوایش دێمەوە سەر ئەم باسە .

کەواتە: خوا لە زۆر لە مێژینەوە دروستکراوی دیکەی هەبوون، جگە لەم بوونەوەرەش، بەڵام یەکەمین (الأوَّل) کێیە کە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوە؟! بێگومان خوایە سبحانە و تعالى، دوامین (الآخِر) کێیە؟ کە دەبێتە هۆی بوون بەخشین بە غەیری خۆی؟ بێگومان هەر خوایە کەواتە: با ئێمە لە بەهەشتدا بە هەمیشەییش بمێنینەوە، بەڵام ئەوەی کەدەمانهێڵێتەوە کێیە؟ بەس خوایە، با کافرەکان بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا بمێننەوە، بەڵام ئەوەی کەدەیانهێڵێتەوە کێیە؟ هەر خوایە کەواتە: تۆ بوونەکەت، نەلەسەرەتاو نەلە کۆتاییدا لە خۆتەوە نیە، بەڵکو لە خواوەیە، مادام لە خواوەیە کەواتە: هەر خوا یەکەمین (الأوَّل) و دوامین (الآخِر)ە.

لە کۆتایی ئەو بڕە توێژینەوەیەشدا لە بارەی:

بێ سەرەتاو بێ کۆتابوونی خوای بێ وێنەوە، دەڵێم:

بێگومان عەقڵی مرۆڤ توانای لەخۆدا جێکردنەوە (إستيعاب)ی چەمكو واتای بێ سەرەتاو بێ کۆتا (أزَلـيٌّ و أبَـديٌّ)ی نیە، چونکە بێگومان شتی سنووردار، (محدود) جێگای شتی بێ سنوور (لا محدود)ی تێدا نابێتەوە، ئایا دەگونجێ ئاوی، نەك زەریاو دەریایەك، بگرە گۆمو حەوزێکیش، لە پەرداخێکدا جێی بێتەوە؟! بێگومان نەخێر.

*********

### خوێنەری سەنگین و شیرین!

بۆ ئاگاداریی‌و بەرچاو ڕوونییت: نووسەر لەم خاڵی شەشەم (٦)ەوە، هەتا خاڵی حەڤدە (١٧)، واتە: دوازدە (١٢) خاڵی تەرخان كردوون بۆ باسی خوای بەرزو مەزن‌و بێ وێنەو، خستنە ڕووی ژمارەیەكی بەرچاو لەسیفەت‌و وەسف‌و ناوو كردەوە بەرزو پەسندو بێ وێنەكانی، هەرچەندە جارو بار هەندێك باس‌و بابەتی دیكەشی لەگەڵ ئاوێتە كردوە، بەتایبەت باسی قەزاو قەدەر كە نووسەر پانتاییيەكی باشی لە بەشێك لە خاڵەكانی نامیلكەكەی بۆ تەرخان كردوەو، پێم وایە هۆكارەكەشی ئەوەبووە كە لەو كاتەدا (سەدەی سێیەم‌و چوارەمی كۆچیی) باس‌و خواسی قەدەر زۆر گەرم بووەو، سەرجەم زانایانیش لە كتێب‌و بەرهەمەكانیاندا، زیاتر ڕەچاوی پێویستیی خەڵك‌و كۆمەڵگای ڕۆژگاری خۆیانیان كردوە، زانینی ئەو ڕاستییەش، شتێكی گرنگە بۆ لێتێگەیشتنی زانایان بە بەرهەم‌و كەلەپوورەكەیان!

شایانی باسیشە نووسەر زۆربەی ئەو دوازدە (١٢) خاڵەی بە خێرایی‌و كورت‌و گوشراویی خستوونە ڕوو ، ئێمەش هەر بەو جۆرە پێیاندا دەڕۆین، لەهەر جێیەكیش بەپێویستمان زانی، هەڵوەستەیەك دەكەین‌و ڕوونكردنەوەی پێویست لەقەدەر حاڵ‌و بوار لەسەر خاڵەكان دەدەین، سەرەتا لە خاڵی (٦)دا، باسی هەر ماوێتی‌و هەرمانەوە (أَبَدِيَّة)ی خوا دەكات‌و دەڵێ:

٦) ( لاَ يَفْنَى وَلاَ يَبِيدُ ) :

واتە: خوا نە بەفەنادا دەچێ، نە لە نێویش دەچێ. (يَفْنَى) وە (يَبِيدُ) مانایان لێك نزیكە (فَنَى، يَفْنَى) یان (بَادَ، يَبِيد)، هەردووكیان یەكن، یان زۆر لێك نزیكن[1]، وەك

١) بڕوانە: المعجم الوسيط، ص٧٠٤ (فَنِيَ الشيءُ يَفْنى فَناءً: بادَ وانتهى وجوده) وە ص٧٨ (بادَ يَبيدُ بَيْداً وبياداً وبيوداً وبَيْدودةً: هلك وانقرض).

خوای بێ سەرەتاو بێ کۆتا، لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾الرحمن، واتە: هەرچی کە لە زەوی دایە لە بەین دەچێ، بەڵام ڕووی پەروەردگاری خاوەن شکۆو ڕێزت دەمێنێتەوە، (وَجْه، يَدْ، قَدَم) گەلێك سیفەتی دیکە، کە بۆ خوای بێ وێنە بەکارهاتوون، دەبێ بڵێین: خوای بێ وێنە ئەو سیفەتانەی هەن، بەڵام بەو شێوەیەی کە لە خۆی دەوەشێتەوە، نەك ڕووی هەبێ، وەك ڕووی ئێمە، یان دەستی هەبێ، وەك دەستی ئێمە، ، چونکە ئەوە وێچواندن (تَشْبِيه)ە، بە دروستکراوەکان، دوایی بەیارمەتی خوای بەخشەر، دێینە سەر ئەو باسەش.

پاشان لە خاڵی (٧)دا باسی ڕەهایی بێ سنووریی ویستی خوا دەکاتو دەڵێ:

**٧) ( وَلا يَكُـــونُ إِلاَّ مَـــا يُـــرِيـــدُ ) :**

واتە: هیچ شتێك نابێ، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، نەدروستکراوەکان، نەکردەوەی دروستکراوەکان، هیچ شتێ پەیدانابێ، مەگەر خوا بیەوێ، کردەوەش چ هی چاك، چ هی خراپ، هیچ کردەوەیەك لەسەر دەستی ئینسانەکان پەیدانابێ، لەسەر دەستی جند و، باقی دروستکراوەکان، مەگەر خوا بیەوێ، ئنجا (موعتەزیلە) یان (قەدەرییەکان)[1] بۆچوونیان وایە دەڵێن: ئینسان بۆ خۆی کردەوەکانی خۆی دەوێو بۆخۆشی دەیانخوڵقێنێ، ئەگەرنا، خوا کردەوەی خراپی ئینسانی ناوێ، ناشیخوڵقێنێ، دەڵێن: خوا بەدیهێنەری کردەوە خراپەکانی ئینسان نیە، نەشیویستوون، بەڵام ئینسان بۆخۆی کردەوە خراپەکانی خۆی دەوێو بۆ خۆشی دروستیان دەکات.

ئنجا بۆچی (موعتەزیلە) وادەڵێن؟ بۆ ئەوەی لە چنگ ئەوە ڕابکەن کە وەك جەبرییەکان (الجبرية) دەڵێن: مادام خوا کردەوەی خراپی لە خراپەکاران ویستوەو، هەر ئەویش کردەوەکانیان بۆ دەخوڵقێنێ، ئەدی چۆن سزایان دەدات؟ بە حیسابی خۆیان بۆ

---

١) چونکە (معتزلة) (قدرية)شیان پێگوتراوە، یان جیاوازییەکی کەمیان هەبووە.

ئەوەی بەرگریی لە دادگەریی خوا بکەن، هەڵساون ویستی خوایان گچکە کردۆتەوەو، قودرەتو دەستەڵاتی خوایان تەسك کردۆتەوە!! بەڵام لە ڕاستییدا بەهەڵەداچوون، هەروەك چۆن (جەبرییە)کانیش لە بەرانبەری قەدەرییەکاندا دەڵێن: ئینسان هیچ دەورێکی نیە لە دروستکردنی کردەوەکانی خۆیداو، لە وەدەستهێنانی کردەوەکانی خۆیدا، بەڵکو ئینسان وەك پەڕەمووچێك وایە بەدەم باوە، ئەدی چۆن خوا ئینسانەکان سزا دەدات؟ دەڵێن: ئینسان موڵکی خوایە، بۆی هەیە سزای بدات، خراپەی پێ بکاتو ئەگەر هیچ ویستو ئیرادەیەکیشی لەئارادا نەبێو، ئنجا سزاشی بدات، بەڵام بێگومان هەم موعتەزیلە لەلایەكو، هەم جەبرییەکان، لەلایەکی دی، هەردووکیان بە هەڵەداچوون!

بەڵام ،ئایا ئەهلی سوننەتو جەماعەت کە زۆربەو جەماوەری مسوڵمانانن، دەڵێن: چی؟ دەڵێن: نەخێر (وَلا يَكُونُ إِلاَّ مَا يُرِيدُ)، هەرچی خوا نەیەوێ نابێ، خوا کردەوەی خراپی لە خراپەکاران ویستوە، چاکەشی لە چاکەکاران ویستوە، بەڵام ویستی خوا لەگەڵ ڕەزامەندیی خوا، هەموو کاتێك بەیەکەوە نین، بەڵێ، خوا کردەوەی چاکی لە بڕواداران ویستوە، پەسەندیشی کردوە، خوا کردەوەی چاکی دەوێو خۆشیشی دەوێ، خوا کردەوەی چاکی لە بڕواداران‌و چاکەکاران ویستوەو، فەرمانیشی پێکردوەو خۆشیشی دەوێ.

کەواتە: کەسێك کردەوەیەکی چاك بکات، هەم ویستی خوا هاتۆتە دی، هەم ڕەزامەندیی خواش هاتۆتەدی، هەم فەرمانی خواشی جێبەجێ کردوە،خوا کردەوەی خراپی لە خراپەکارانیش ویستوە، چونکە بەبێ ویستی خوا، هیچ شتێك نابێ، بەڵام خوا ڕازی نیە لە کردەوەی خراپ، فەرمانیشی پێ نەکردوە، بەڵکو نەهی کردوە لە کردەوەی خراپ. کەواتە: کەسێك کە کردەوەی خراپ دەکات، بەڵێ، بە ویستی خوا کردەوەی خراپ دەکات، بەڵام پێچەوانەی ڕەزامەندیی‌و فەرمانی خوا جووڵاوەتەوە.

ئنجا ئایا ئەو کەسەی کردەوەی خراپ دەکات، بەڵگەی بە دەستەوە هەیە بڵێ: بەویستی خوا کردوومە؟ نەخێر، بۆچی؟ ، چونکە ویستو خواستی خوا بۆ ئێمە دیار نیە، هەتا کردەوەکە نەکەین، نازانین خوا ویستی لەسەر چییەو بۆ ئێمە شتێکی نادیارە، بەڵام ئەوەی لە ئێمە دیارە، ڕەزامەندیی خوایەو فەرمانی خوایە کە ڕەزامەندیی خوا لە

شەریعەتەکەیدا دەردەکەوێ، فەرمانی خوای بەرزیش دینەکەیەتی، کەواتە: ئەوەی کە تۆ دەیزانی، خوا پێی خۆشەو فەرمانی پێکردوە، ئەوە جێبەجێ بکـە، بۆچـی دەچـی گرێـە لەویستی خوا دەئاڵێنی کە بۆتۆ شتێکی نادیارە؟ تۆ ڕەزامەندیی خوا بۆ خۆت بێنـەدیو فەرمانی خوا جێبەجێ بکە، ئنجا دوای ئەوەی کەکردەوەی چاك دەکـەی، ئـەوجار بـۆت دەردەکەوێ کە خوا ویستیشی لەسەر بووە.

کەواتە: هیچ کەس بۆی نیە ئیرادەو ویستی خوا، بکاتە بەڵگەو بەهانەی ئەوە کە خوا خراپەی پێکردوە، بۆ خۆت دەیکەی، تۆ خراپەت بوێ، یـان چـاکە، خـوا بـۆت دروسـت دەکات، بەڵام ئەوە تۆی کامەیان هەڵدەبژێری، ویستەکە بەدەستی خوایە، هەڵبژاردنەکە بە دەستی خۆتە، هـەرکامێکیان هەڵبـژێری، خـوا بـۆت دروسـت دەکـات، هـەرکامێکیان هەڵبژێری، بە ویستی خوا دەیکەی، خوای بەرزیش بۆت دروست دەکات، ، چونکە ناتوانی بۆخۆت دروستی بکەی، بەڵام دەتوانی هەڵیبژێری[1].

بۆ وێنە: تۆ دەچیە دوکانێکی قوماش فرۆش، تۆپە قوماشەکان زۆر بـەرزن، دەڵێـی: کاکە لەو تۆپە قوماشە، سێ مەترم بۆ لێبکەوە، یان لەوەیان، چوار مەترم بۆ لێبکەوە، بۆ

---

١) ئەم ڕایەم کە: (خوا دروستکەرو بەدیهێنەری کردەوەکانی مرۆڤە) کە ڕای سەرجەم زانایانی ئیسلامە، جگە لە (معتزلـة) کە پێیان وایە مرۆڤـــ بەدیهێنــەری کردەوەکانیــەتی: (الإنسـان خـالق أفعالـه)، ڕای کـاتی ڕابردوومە کە لە کتێبی: (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی...)یش دا هەروام گوتوە، بەڵام لەو کتێبەم دا کە لە زیندان دا نووسیومە:(الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) هەروەها لە تەفسیری سووڕەتی(الأنعام) کە بەرگی پێنجەمی(تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز)ە، ڕایەکی دیکەم لەو بارەوە خستۆتە ڕوو کە نـەمزانیوە پێشـتر خرابێتەڕوو، ئـەویش ئەوەیـە کـە: کردەوەکـانی مرۆڤـــ: بـە نیـازی دڵ‌و دەربـڕینی زمـان‌و جموجـۆڵی ئەندامەکانەوە، هەموویـــان لەجۆری شـتی پەیـداکراوو دروسـتکراو (مُحدث و مخلوق) نـین، تـاکو وەك موعتەزیلە گوتوویانە: مرڤـ خۆی دروستیان بکات، یان وەك جەبرییە گوتوویانە: خوا بۆی دروست بکات! بەڵکو کردەوەکانی مرۆڤـ لە جۆری: گێڕراوو وەدەست هێنراوو ئەنجام دراو (جعليّ و كسـبّي و فعلـيّ)ن‌و، تەنیا گێـڕەر (جاعل)و وەدەستهێنەر (کاسـب)و ئەنجامدەر (فاعـل)یـان دەوێ‌و، مـرۆڤیش هـەموو ئـەو سیفەتانەی هەن.

ئەمە زۆر بەکورتیی‌و لە هەردووك سەرچاوەی ئاماژە پێکراودا، بە درێژیی باسـی ئـەو بابەتـەم کـردوەو ئایەتەکانی قورئانیشم هێناوەتەوەو (الحَمْدُ لِله الّذي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصّالِحات).

خۆت دەستت ناگاتێ، کابرای قوماش فرۆش بەپەیژە سەردەکەوێو بۆت دێنێ، هەڵبژاردنەکە بە دەست تۆیە، بەڵام لێکردنەوەی قوماشەکە بە دەست کابرای قوماش فرۆشە، هەڵبەتە ئەمە بۆ نزیك خستنەوەیە لە عەقڵی ئێمە، تۆ هەر شتێ بکەی بۆ نموونە: نوێژ بکەی، خوای دادگەر کردەوەکەت بۆ دروست دەکاتو بە ویستی خوا دەیکەی، (قەتڵ)ێکیش دەکەی، هەر بە ویستی خوا دەیکەی، خوای کاربەجێ بۆت دروست دەکاتو یارمەتیت دەدات، هەر کامیان بکەی، بەڵام بۆچی ئاسانکارییت بۆ دەکات لە خراپەکەت دا؟ بۆ ئەوەی تاقیت بکاتەوە، دیارە خوا لە کردەوەکان ڕازی نیە، بەڵام خوا ڕێگات لێ ناگرێو پێداویستیی یەکان (مستلزمات)ی ئەنجامدانی چاکەو خراپەی بۆ تۆ فەراهەم هێناون، هەر کامێکیان دەکەی، بۆت هەیە، بۆیەش خوای کاربەجێ مەلائیکەتی دروست کردوون کە ئیلهامی خێر دەخەنە دڵی مسوڵمانانەوە، شەیتانیشی دروست کردوون کە وەسوەسەو خوتخوتەی خراپ دەخەنە دڵی خراپەکارانەوە، تۆ بە دەست خۆتە ڕوو دەکەیە مەلائیکەت، یان ڕوودەکەیە شەیتان، بەڵام خوا هێزو دەستەڵاتێکی داوەتە دەست شەیتان، گەر تۆ بە لای شەیتاندا چووی، بەرەو خراپەت دەبات، ئەگەر بەرەو مەلائیکەتیش چووی، بەرەو چاکەت دەبات.

خوا پێغەمبەرانی (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) ناردوون، قاڕوونو ئەبو جەهلو فیرعەونیشی دروست کردوون، ئەگەر بە دوای پێغەمبەران بکەوی، بەرەو سەرفرازییو ژیانی پاكو چاكو بەرەو بەهەشتی بەرینت دەبەن، ئەگەر بەدوای شەیتانو قاڕوونو ئەبو جەهلو فیرعەونەکان بکەوی، بەرەو ڕوو زەردییو شەرمەزاریی دنیاو، سزای خوا لە قیامەتێت دەبەن، هەڵبژاردنەکە بەدەست تۆیە، بەڵام هەر کامێکیان بکەی، خوای بالاَ دەست هۆکارەکانی کردنی کردەوەکانی بۆ تۆ فەراهەم هێناون، ، چونکە بەبێ خوا، هیچ شتێك پەیدا نابێ، ئەوە مەسەلەیەکی زۆر وردە، دوایی زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

ئنجا لە خاڵی (٨)دا باسی بەرزییو مەزنییو بێ وێنەیی خوا دەکات، کە هیچ عەقڵو خەیاڵێك ناتوانێ پەی پێ ببات و دەڵێ:

## ٨) (لا تَبْلُغُهُ الأَوْهَامُ، وَلا تُدْرِكُهُ الأَفْهَامُ):

واتە: گومانەکان پێی ناگەن، عەقڵەکانیش تێی ناگەن، خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) لە بارەی خۆیەوە دەفەرموێ: ﴿...لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ١١﴾ الشورى، واتە: خوا وەك هیچ شتێك نیە، هیچ شتێك وەك خوا نیە، نەخوا وەك هیچ شتێکە، نە هیچ شتێك وەك خوایە، نە لە زات و نەلە سیفەتو نە لەکردەوەدا. کەواتە: هەرچی گومانی تۆ بەلایدا دەچێ، هەرچی خەیاڵو گومانو تەصەووری تۆ بەلایدا دەچێ، خوا بەو شێوەیە نیە، وەك گوتراوە: (كُلُّ مَا جَرَى بِبَالِكَ فَاللهُ بِخِلاَفِ ذَلِكَ)، هەرچی بە دڵو گومانو ئەندێشەی تۆ دا دێ، خوا پێچەوانەی ئەوەیە، بۆچی؟ چونکە خەیاڵو عەقڵی تۆ، ئەندێشەی تۆ دەتوانێ بیر لەچی بکاتەوەو، دەتوانێ چی تەصەوور بکات؟ بێگومان شتی ماددیی‌و دروستکراوی وەك خۆت، دیارە خواش ماددەو دروستکراو نیە. کەواتە: هەرچی بە بیرو خەیاڵی تۆدا دێ، خوای بێ وێنە وانیە، (وَلا تُدْرِكُهُ الأَفْهَامُ)، وەك چۆن گومانو خەیاڵ بە خوای بەرزو مەزن ناگات، بێگومان عەقڵو هۆشەکانیش لە خوای تاكو پاك ناگەن، بەڵام لە خوا ناگەن، بەو مانایە نا، کە عەقڵ ناتوانێ پەی بەبوونی خوا بەرێ، بەڵکو بەو مانایە کە ماهییەتو حەقیقەتی خوا بۆ عەقڵەکان ئاشکرا نابێ، خوا زۆر لەوە گەورەترە کە عەقڵی ئینسان بتوانێ دەورەی خوا بدات بە تەواویی‌و، بزانێ ماهییەتی چییەو چۆنە؟! بگرە هەندێ لە دروستکراوەکانیش عەقڵی ئینسان تێیان ناگات.

بۆ وێنە: هێزی کێشندە (قوّة الجَاذبية)، هێزی موگناتیسیی، ڕوح، عاتیفە، گەلێك شتی دیکە، هەتا ئێستا ئینسان لە بەرانبەریاندا، دەستەوستانو ماتوحەیرانەو تێیان ناگاو نازانێ چین؟ هێزی کێشندە چییە؟ زەوی بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە دەوری ڕۆژدا دەخولێتەوە، ڕۆژ لەگەڵ کۆمەڵەی خۆر بەدەوری داڵی ڕاوەستاودا، ئەو بەدەوری شتێکی دیکەدا، هەموو کەهکەشانەکان دەخولێنەوە بە هۆی هێزی کێشندەوە، ئایا هێزی کێشندە چییە؟ کەس نازانێ ماهیەتو حەقیقەتی چیە؟ کەس دیتیەتی؟ نەخێر کەس

گوێی لە دەنگی بووە؟ نەخێر كەس تامو بۆنی كردوە؟ نەخێر كەس دەستی لێداوە؟ نەخێر كەواتە: بە پێنج هەستەكان هێزی كێشنددمان بۆ كەشف نەبووە، حەقیقەتی چۆنە چۆن نیە؟ نازانین، بەلام هەیە، یان نا؟ بەڵێ، هەیە، چۆن دەزانین هەیە؟ دەزانین هەیە، ، چونكە شوێنەواری دیارە، خوای بەرزو مەزنیش {سیفەتی هەرە بەرز بۆ خوا (وَلِلّٰهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى)، بەلام دەمانەوێ لە عەقلی خەڵك نزیكی بخەینەوە} بە هەمان شێوە كەس نەیدیوە، كەس بۆنی نەكردوە، تامی نەكردوە كەس دەستی نەداوەتێ كەس گوێی لە دەنگی نەبووە[1] بەلام چۆن دەزانین هەیە؟ ، چونكە شوێنەواری هەیەو بوونەوەرو كائیناتێك دەبینین كە بەبێ دان بەبوونی خوا داهێنان، بۆمان تەفسیر ناكرێ، چۆن پەیدا بووە؟!

هەرخۆت سەیری خۆت بكە، لە چییەوە هاتووی؟! لە زیندەوەری تۆویی (الحیوان المنوي) كە لە ئاوی باب‌و دایكت دا هەبووەو، یەكیان گرتووەو زیندەوەرێكی دیكەیان پێكهێناوە كە پێی دەگوترێ: تۆویلكە (نُطْفَة)، ئنجا لە مندالدانی دایكت دا نۆ مانگت گوزەراندوە، ئنجا ئێستا تەماشای خۆت بكەو، تەمەشای ئەو حاڵەتەی ئەو كات بكە، بزانە كێ تۆی گەیاندۆتە ئێرە!! ئێمە بەردێك دەبینین لەوەتەی خوا دنیای داناوە بەرد هەیە، بەلام بەرد نابێتە هیچ، ئەدی ئەو تۆویلكە (نُطْفَة) ئەو زیندەوەرە، كە دەبێ بە میكرۆسكۆب ببینرێ، كێ ئەو زیندەوەرەی گەیاندە ئەو قۆناغە؟ بێگومان خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ)، ئایا بۆ خۆی دەیتوانی خۆی وا لێ بكات؟ نەخێر ئەدی كەسی دیكە، دایك‌و باب دەیانتوانی بەو قۆناغانەیدا تێبپەڕێنن؟ نەخێر، بەڵكو هەر ناشزانن چییە؟ خۆیان بە دەست

---

١) لەوبارەوە كە ئایا ئەوەی مووسا (علیه السلام) لە كاتی گەڕانەوەیدا لە (مەدیەن)و كرانی بە پێغەمبەر، گوێبیستی دەنگی خوای بەرزو مەزن بووە، یان دەنگێكی دیكەی دروستكراوی خوا بووە؟ زانایان لەو بارەوە قسەو باسیان زۆرە، بەلام وا پێدەچێ ڕای ڕاست ئەوەبێ كە خوا سبحانە و تعالی لەو كاتەدا ئەو دەنگەی بە شێوەیەكی تایبەت بۆ مووسا دروستكردبێ‌و، ئەویش دلنیا بووبێ كە ئەو دەنگە لە خواوەیە -نەك هی خوا بێ- هەروەها دەنگەكە هی فریشتەش نەبووە، چونكە خوا ڕاستەوخۆ مووسای دواندوە، بەلام ناشگونجێ ئەو دەنگە فەرمایشتی ڕاستەوخۆ (الكلام النفسي)ی خوا بووبێ، چونكە فەرمایشتی نەفسیی خوا، سیفەتی خوایەو ناچێتە قالبی دەنگ‌و پیتەوەو بە گوێش نابیسترێ. بڕوانە: (التحریر والتنویر)ی (محمد الطاهر بن عاشور) ج١٦ ص١٩٦.

نەبووە، تا منداڵەكەیان بەدەست بێ ،كەواتە: ئێمە بوونەوەرو كائیناتێك دەبینین، ناچارمان دەكات بڵێین: پەروەردگارێكو مشوورگێڕێك بەسەری ڕادەگاو، بەرنامەی بۆ داناوە، ئەگەرنا ئێمە ڕاستەوخۆ ناتوانین خوا بناسینو ناتوانین پەیوەندیی ڕاستەوخۆ بە خواوە ببەستین، بەو مانایە كە لە ڕێی پێنج هەستەكانەوە، یان لەڕێی عەقڵەوە ڕاستەوخۆ حەقیقەتەكەی بزانین، بەڵام شوێنەواری خوا دەبینین، بۆیە من كاتی خۆی لە شیعرێكدا گوتوومە:

سروشت ئاوێنەی تەجەللای خوایە چاك سەرنجی دە بزانە چی تیایە
لە ڕێی كردەوە كردگار دەناسرێ سروشت كرێكە كردگاری خوایە

سروشت، یانی: ئەو بوونەوەرو كائیناتە، ئاوێنەی تەجەللای خوایە، واتە: وەك ئاوێنەیەك خوای تێدا دەدرەوشێتەوە، چاك سەرنجی بدە ئەو سروشتە بزانە چی تیایە!! سیفەتەكانی خوا لەو بوونەوەرەدا دەدرەوشێنەوە، لەڕێی كرەوە كردگار دەناسرێ، (كر) ئەوەی كەدەچنرێ، لە ڕێی چنراوەوە، ئەو كەسەی چنیویەتی دەناسرێ، سروشت (كرێكە) ئەو بوونەوەرە چنراوێكە، كردگاری خوایە، خوای گەورەو مەزن چنیویەتیو دروستی كردوە، بۆیە تا زیاتر بوونەوەر بناسی، زیاتر خوا دەناسی.

پاشان لە خاڵی (٩)یشدا هەر ئەو ڕاستییەی پێشێ دووپات دەكاتەوەو دەڵێ:

٩) ( وَلا يُشْبِهُ الأَنَامَ ):

واتە: خوا وەك خەڵكی ناچێ، نە لەزاتیدا، زاتی خوا بوونێكی سەربەخۆیە، نە لەسیفەتیشیدا، سیفەتەكانی خوا تایبەتن بە خواوە، نە لەكردەوەكانیدا، لە هیچ شتێكدا خوای بێ هاوەڵ، وەك خەڵكی ناچێ. (الأَنَام) یانی: خەڵك.

لە خاڵی (١٠)یش باسی هەردووك سیفەتی ژیانی ڕاستەقینەو مشورخۆریتی بەردەوامی خوا دەكاتو دەڵێ:

## ١٠) (حَـيٌّ لا يَمُـوتُ، قَيُّـومٌ لا يَنَـامُ):

واتە: زیندووەو نامرێ، سەرپەرشتیارەو ناخەوێ، خوا زیندوویەو خاوەنی ژیانی ڕاستەقینە، هەر خوایە، ژیان بەو مانایە نا، كە خوای بەرزو مەزن ڕووحی لەبەر بێو دڵی لێبدات!! بەڵكو ژیانێك كە لە خوا دەوەشێتەوە، خوا مردنی بەسەردانایەت، ئێمە بۆچی مردنمان بەسەر دادێ؟ ، چونكە ژیانەكەمان ژیانێكی كاتییەو، ژیانێكی خواستراوە كە خوا پێی داوین، ژیانێكی وەرگیراو (مستعار)ە، بەلاَم بۆچی خوای بەرز مردنی بەسەردا نایەت؟ ، چونكە ژیانەكەی ژیانێكی ڕاستەقینەیە.

(قَيُّومٌ لا يَنَامُ)، خوا سەرپەرشتیارەو ناخەوێ، هەندێك لە تەفسیرەكان لە مووسا (عليه السلام) ئەم بەسەرهاتە دەگێڕنەوە، {بەلاَم من ئەوە بەدوور[1] دەزانمو ڕەنگە یەكێك لە پیاو چاكان بووبێ} گومانێكی بۆ دێ: تۆ بڵێی پەروەردگار خەوی نەبێو ئیسراحەتێك نەكات؟! خواش دوو فریشتە لە شێوەی دوو ئینساندا دەنێرێ بۆ لای و دوو شووشەی وێدەدەن، دەڵێن: ئەو دوو شووشانەمان بۆ بگرەو دایان مەنێ، با هەر بەدەستتەوە بن، ئنجا دەبێتە دوو شەوو دوو ڕۆژ نایەڵن بنوێ، دەیخافڵێننو دەڵێن: نابێ شووشەكانیش دابنێیو، سەرەنجام وەنەوز دەیگرێو شووشەكان پێكدا دەدات، پێی دەڵێن: دوو شووشە بە دەستی تۆوە بوون، لەحزەیەك لێیان غافڵ بوویو وەنەوزت هاتێ، شكاندتن، ئەدی ئەو بوونەوەرو كائیناتە، ئەگەر خوای پەروەردگار لێی غافڵ بێ، چۆن بەڕێوە دەچێ؟

---

١) ضَعِيف جداً، أَخرَجَهُ أَبو يعلى برقم: (٦٦٦٩) والديلمي في الفردوس برقم: (٧١٢٦)، وابن الجوزي في الواهيات (٢٢ - ٢٣) من حديث أبو هريرة، وقَالَ ابن الجوزي: ولا يثبت هذا الحديث عَن رسول الله (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وغَلَط من رفعه، تفسير القرطُبي، بتحقيق عبدالرزاق المهدي.

خوای زاناو تواناش لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ... ﴿٢٥٥﴾ ﴾، دوای ئەوەی کەباسی ئەوە دەکات کە زیندووەو سەرپەرشتیاری بوونەوەرە، دەفەرموێ: نە وەنەوزی دێتێو نە خەوی لێدەکەوێ، چونکە خەو لێکەوتنو وەنەوز هاتن، پێچەوانەی سەرپەرشتییکردنو مشوورگێڕانە بۆ خوای بێ وێنە، کە ناگونجێ تاوێك لە دروستکراوەکانی بێ ئاگابێ، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ المؤمنون.

لە خاڵی (١١)دا باسی هەردووك سیفەتی بەدیهێنەرایەتیو ڕۆزیی دەرێتی (خالقیة ورازقیة)ی خوای بەرزو مەزن دەکاتو دەڵێ:

## ١١) (خَالِقٌ بِلا حَاجَةٍ، رَازِقٌ بِلا مُؤْنَةٍ):

واتە: (خوا) بەدیهێنەرە، بێ ئەوەی پێویستی بە بەدیهێنراوەکانی بێ، ئێمە هەر شتێك دەکەین، پێویستیمان بەو شتە هەیە، خانوویێك دەکەی، دەتەوێ تێیدا بحەوێیەوە، کتێبێك دەنووسی، دەتەوێ خەڵکی پێ تێبگەیەنی، وتارێك دەدەی، دەتەوێ خەڵکی پێ تێبگەیەنی، هەر شتێك کە دەیکەین، پێویستیمان پێی هەیە، بەڵام خوا بەدیهێنەرە، بێ ئەوەی پێویستی بە بەدیهێنراوەکانی بێ، (رَازِقٌ بِلا مُؤْنَةٍ) خوا ڕۆزیی دەرە، بێ ئەوەی پێوەی ماندوو بێو بارگران بێو پێوە سەغڵەت بێ، یەکێ بۆی هەیە بپرسێ: باشە ئەگەر خوا بەدیهێنەرەو پێویستی بە بەدیهێنراوەکانی نیە، ئەدی بۆچی بەدی هێناون؟ کەواتە: شتێکی بێ حیکمەتی کردوە، مادام پێویستیی پێیان نیە، بۆچی دروستی کردوون؟

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە ئەوە بۆ ئێمەی مەخلووق، بۆ ئێمەی ئینسان، وایە شتێك هەتا پێویستیت پێی نەبێ، نایکەی، بەڵام خوا (جَل جلالـه) ئەو شتانەی کە دروستیان دەکات بۆ خۆی پێویستی پێ نین، بەڵام مەخلووقەکان پێویستییان پێیان هەیە، خوا مەبەستێکی نیە لە دروستکراوەکانیدا بیهێنێتە دی، چونکە خوا پێویستی بە غەیری

خۆی نیە، بەڵام ئەوە کە مەبەستێکی نیە لە دروستکراوەکانیدا، مانای ئەوە نیە کە دروستکرانی ئەو دروستکراوانە، هیچ ئامانجو حیکمەتێکی تێدانیە، بەڵکو چەندان حیکمەتو ئامانج لە دروستکرانی دروستکراوەکاندا هەن، بەڵام ئامانجو حیکمەتەکان، پەیوەندییان بە خواوە نیە، بەڵکو پەیوەندییان بە خودی مەخلووقەکانەوە هەیە، بۆ وێنە: خوا ئێمەی دروست کردوە، نەك لەبەر ئەوەی پێویستی بە ئێمە هەیە، بەڵکو ئێمەی خوڵقاندوە، ، چونکە ئێمە پێویستیمان بە خوڵقان هەبووە، خوای بەخشەر نازو نیعمەتی زۆری بەسەردا ڕشتووین، نەك لەبەر ئەوەی بیەوێ سوودێك ببینێ لەوەدا، بەڵکو بۆ ئەوەی سوود بە ئێمە بگەیەنێ، دەتوانین بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست، وێنەیەك بهێنینەوە: تۆ بە شوێنێکدا تێدەپەڕی، کابرایەکی هەژارو نەدار دەبینی دەپاڕێتەوە، تۆش هەندێ پارەی پێدەدەی، تۆ پێویستیت بەو هەژارە نیە، ڕەنگە هیچ چاکەیەکی بۆ تۆ پێ نەکرێو، چاوەڕوانیی هیچ شتێکی لێ نەکەی، بەڵام چ شتێك پاڵت پێوە دەنێ؟ بێگومان بەس چاکەکاریی، دەتەوێ چاکەی لەگەڵدا بکەی، خوای بێ وێنەش ئێمەی دروست کردوە، بەس ویستوویەتی چاکەمان لەگەڵدا بکات، نەك لەبەر ئەوەی دەتوانین سوودێکی پێ بگەیەنین، بەڵکو لەبەر ئەوەی خوا چاکەکارو بەخشندەو میهرەبانەو، دەیەوێ چاکە لەگەڵ غەیری خۆیدا بکات.

ئنجا لە خاڵی (١٢)ش باسی هەردووك سیفەتی مراندنو زیندوو کردنەوەی خوای بێنیازو جێی نیاز دەکاتو، دەڵێ:

**١٢) ( مُمِيتٌ بِلا مَخَافَةٍ، بَاعِثٌ بِلا مَشَقَّةٍ):**

واتە: (خوا) مرێنەرە، بێ ئەوەی بترسێ، لە کەس ناترسێ کە دەمرێنێ، ، چونکە هیچ کەس دەستەلاتی بەسەر خوادا ناشکێ، تۆڵەی لێ بسێنێتەوە، یان سزای بدات، پاشان خوا ئەوپەڕی حیکمەتی هەیەو، ڕەخنە لە کارەکانی ناگیرێ: ﴿ لَا يُسْئَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ

يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء، (بَاعِثٌ بِلا مَشَقَّةٍ) خوا زیندووکەرەوەیە، بێ ئـەوەی، پێـوەی ماندوو بێ، بێ ئـەوەی پێـوەی سـەغڵەت بـێ، بـۆ ڕۆژی لێپرسـینەوەو دادگـاییکردن، ئامادەیان دەکات.

*********

## گرنگیی و گەورەیی خواناسیی و بناغە بوونی بۆ سەرجەم پایەکانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی

بەڕێزان!

شتێکی ئاشکرایە کە عەقیدەی ئیسلامیی شەش بنچینەی هەن:-

١- بڕوا بە خوا.

٢- بڕوا بە فریشتەکان.

٣- بڕوا بە کتێبەکانی خوا.

٤- بڕوا بە پێغەمبەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام).

٥- بڕوا بە ڕۆژی دوایی.

٦- بڕوا بە قەزاو قەدەر.

بەڵام لەو شەش بنچـینانە، ئـەوەی کەبنچـینەی هـەرە پتـەوو گەورەیـەو، هـەموو بنچینەکانی دیکە لەسەری وەستاونو لەویەوە پەیدادەبن: پایەی خوا ناسییە، خوا ناسیی بە شێوەی خوا بەیەکگرتن (توحیـد) کە خوای پەروەردگار هیچ دینێکی نەناردووەو، هـیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە نـەکردوە کـە بـە شـێوەی خـوا بەیـەکگرتن خوایـان بـە خـەڵکی نەناساندبێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾الأنبياء، واتە: هیچ پێغەمبـەرێکمان پێش تۆ نەناردوە، هەتا

پێمان ڕانەگەیاندبێ کە هیچ پەرستراوێك نیە (بە هەق) تەنیا من نەبێ، دەجا بەس من بپەرستن.

ئنجا لە خواناسییەوە، پێغەمبەرناسیی پەیدادەبێ، فریشتە ناسیی پەیدادەبێ، دوارۆژ ناسیی پەیدادەبێ، کتێب ناسیی پەیدادەبێ، هەروەها قەزاو قەدەریش بە هەمان شێوە، ئنجا بۆیە لێرەدا، وە لە هەر کتێبێکی دیکەی عەقیدەدا، باسی خوای پەروەردگار بەشی زۆر دەگرێ، ، چونکە ئەوە ئەسڵو بناغەی عەقیدەی ئیسلامییە، کاتێکیش ئینسان لە خوا ناسی (مَعْرِفَةُ الله)دا بە شێوەیەکی ڕاستو دروست، وە لەخوا بە یەکگرتن (توحید)دا گەیشتە قەناعەتو ئەنجام، شتەکانی دی هەموویان ئاسانن کە ئینسان خوای ناسی، خواناسیی پێی دەڵێ: دەبێ پێغەمبەریش هەبێ، ئەویش پێی دەڵێ: دەبێ دوارۆژێکیش هەبێ کە خوا لێی بپرسێتەوە، دیسان بڕوا بەفریشتەکانیش بە هەمان شێوەو بڕوا بەکتێبەکانی خواو بەقەدەریش هەروان.

کەواتە: ئینسان کاتێ لە خواناسییو ئیمان بەخوادا گەیشتە ئەنجام، ئەوانی دیکە هەموو ئاسانن، ئەگەر لەوێش نەگەیشتە ئەنجام، پێویست ناکات خۆی بەوانی دیکەوە ماندوو بکات! کەسی وا هەیە دەڵێ: من بڕوام بە زیندوو بوونەوە نیە، یان بڕوام بە فریشتەکان نیە، مەچۆ لەوێ مشتو مڕی لەگەڵدا بکەی، بەڵکو بیهێنە سەر ئەسڵێ کە خوا ناسییەو خوا بەیەکگرتن (توحید)ە، ئەگەر لەوێ گەیشتە ئەنجام، لەوانی دیکەدا هەموویان دەگاتە ئەنجام بە ناچاریی، ئەگەر لەوێشدا نەگەیشتە ئەنجام، پێویست ناکات لە شتەکانی دیکەدا خۆتی لەگەڵ ماندوو بکەی.

شایانی باسیشە کە لەچەند کتێبێکم دا لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلم لە بارەی خوا ناسییو بڕواهێنان بە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگارێتی خوا (عزّ وجلّ) کردووە، بەڵگەی زۆرم لەو بارەوە خستوونە ڕوو، هەرچەندە بۆ کەسێك میزاجی عەقڵو دڵی ساغ بێو تێك نەچووبێ، بوونی خوا (تبارك وتعالى)و بەدیهێنەر بوونی، بۆ هەموو شتێك ئاشکراو ڕوونەو بەڵگە نەویستە، لەو کتێبانەم کە باسی ئەو بابەتەم تێدا کردوون:

١- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچکان. وتووێژی یەکەم سەلماندنی بوونی خوا.

٢- خوا ناسیی، ئایین، ئیمان: ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە و ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێتەوە.

٣- ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی... بەرگی (٢) خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگارێتییدا.

٤- الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله، الباب الأول: الإسلام معرفة صحيحة بالخالق وبالخلق.

هیواداریشم کتێبە عەرەبییەکە - کە ئێستا لەژێر چاپە- پاش چاپکرانی، بە زوویی وەربگێڕرێتە سەر زمانی کوردیی.

بەڵێ، بەڕێزان!

خوا ناسیی‌و ئیمانی ڕاست‌و ساغ ،بناغەی دینداریییە، بۆیە نووسەریش زۆرجەخت لەسەر خواناسیی‌و ئیمان بەخوا هێنان دەکاتەوەو، لەسەر باسکردنی سیفەت‌و کردەوەکانی بەردەوام دەبێ‌و، دەڵێ:

١٣) (مَا زَالَ بِصِفَاتِهِ قَدِيمًا قَبْلَ خَلْقِهِ، لَمْ يَزْدَدْ بِكَوْنِهِمْ شَيْئًا لَمْ يَكُنْ قَبْلَهُمْ مِنْ صِفَتِهِ، وَكَمَا كَانَ بِصِفَاتِهِ أَزَلِيًّا، كَذَلِكَ لا يَزَالُ عَلَيْهَا أَبَدِيًّا):

واتە: خوا بەردەوام سیفەتەکانی هەبوون، پێش ئەوەی دروستکراوەکانی دروست بکات، خوا بە هۆی دروست بوونی دروستکراوەکانییەوە، شتێك لە سیفەتەکانی زیاد نەبووە کە لەمەوپێش بەر لەوەی دروستکراوەکانی دروست بکات، ئەو سیفەتەی نەبووبێ، واتە: خوا (جل جلاله)، پێش ئەوەی بوونەوەر، یان دروستکراوەکان دروست بکات، سیفەتەکانی کە ئێستا هەینی، ئەو کاتیش هەر بوونیو، بە هۆی دروستکرانی دروستکراوەکانییەوە سیفەتێکی تێدا زیاد نەبووە.

(وَكَمَا كَانَ بِصِفَاتِهِ أَزَلِيًّا، كَذَلِكَ لا يَزَالُ عَلَيْهَا أَبَدِيًّا)، هەروەك چۆن بەبێ سەرەتا (بە ئەزەلیی) سیفەتەكانی هەبوون، بۆ هەمیشەو بێ كۆتـایی (بـە ئەبـەدیی)، لەسـەر ئـەو سیفەتانە دەمێنێتەوەو، ئەو سیفەتانەی هەر دەمێنن.

نووسەر لێرەدا دەیەوێ ئەو حەقیقەتە ڕابگەیەنێ كە خوای پەروەردگار، پێش ئـەوەی بوونەوەر دروست بكات، پێش ئەوەی دروستكراوانی دیكەش، ئەگەر لە پێش بوونەوەردا هەبووبن كە ڕای زۆربەی زانایـان وایـە، خـوا پـێش ئـەوەی ئـەو بوونـەوەرە بخـولقێنێ، دروستكراوی دیكەشی هەبوون، دەڵێ: خوای بێ هاوتا، پـێش ئـەوەی دروسـتكراوەكانی بخولقێنێ، سیفەتەكانی خوایەتیی لە: پەروەردگارێتیی، لە بەدیهێنەرایەتیی، لە زاڵیـی، لە عیززەت، لەهێز، لە ئیرادە، لە ژیـان، لـە سەرپەرشـتیاریی‌و بەسـەر ڕاگەیشـتن، لـە حیكمەت، لە بەزەیی، لە زانیاریی، هەموو سیفەتەكانی كە ئێستا هەینی، ئەو كـاتیش بوونی، هیچ كام لە سیفەتەكانی دوای دروستكردنی دروستكراوەكانی، تێیدا زیاد نەبووە، بە حەقیقەت ئەوە دیـارەو شـتێكی ئاشكراشـە ، ئنجـا وەك چـۆن بـەبێ سـەرەتا ئـەو سیفەتانەی بوونەو، پێش دروست كردنی دروستكراوەكانیشی، بۆ هەمیشەش لەسەر ئـەو سیفەتانە دەمێنێتەوەو، هیچ گۆڕانی بەسەر دانایەت.

ئنجا لە خاڵی (١٤)ش دا لەسەر هەمان بابەتی پێشوو بەردەوام دەبێ‌و، دەڵێ:

> ١٤) (لَيْـسَ بَعْـدَ خَـلْقِ الْخَلْـقِ اسْتَـفَادَ اسْمَ "الْخَـالِقِ"، وَلا بِإِحْدَاثِ الْبَـرِيَّةِ اسْتَـفَادَ اسْمَ "الْبَـارِي"):

ئەم خاڵە زیاتر ئـەوەی پـێش خـۆی ڕوون دەكاتـەوە، واتـە: لـە دوای دروسـتكردنی دروستكراوەكان، ناوی بەدیهێنەری بۆ پەیـدا نـەبووە، (وَلا بِإِحْدَاثِ الْبَرِيَّـةِ اسْتَفَادَ اسْمَ "الْبَارِي")، بە هۆی وەدیهێنانی بەدیهێنراوەكانەوە خـوای پـەروەردگار نـاوی پەیداكـەر (الْبَـارِي)ی بـۆ پەیدانـەبووە، بـەڵكو پـێش ئـەوەی بـەدیهێنراوەكانیش بـەدی بهـێنێ‌و دروستكراوەكانیش بخولقێنێ، ناوو سیفەتی (خَالِق)و (باري)ی هەر هەبووە.

هەروەها خاڵی (١٥)ش هەر تەواوكەری مەبەستی پێشوویەو زیاتر جەخت لەسەر كردنەوەیەتی، چونكە دەڵێ:

> ١٥) ( لَـهُ مَـعْنَـى الرُّبُـوبِيَّـةِ وَلا مَـرْبُوبَ، وَمَعْنَـى الْخَـالِـقِ وَلا مَـخْـلُـوقَ ):

لەم خاڵی پازدەیەمدا، دیسان زیاتر ڕوونی دەكاتەوە، دەڵێ: خوا ماناو ناوی پەروەردگارێتیی بووە، پێش ئەوەی پەروەردەكراوێك هەبێ كە خوا پەروەردەی بكاتو مشووری بخواو بەسەری ڕابگا، چونكە پەروەردەكردن، یانی: (نەشونما پێكردنو بەخێوكردنی شتێك)، پێش ئەوەی پەروەردەكراوێك هەبێ، خوای پەروەردگار هەر پەروەردگار بووە، پێش ئەوەی دروستكراوێك هەبێ، خوا ناوی دروستكەرو بەدیهێنەری هەر هەبووە.

***

## ئایا خوا پێش ئەم بوونەوەرە، دروستكراوی دیكەی هەبوون، یان نا؟!

لەو بارەوە كە ئایا: خوای پەروەردگار ئەو دروستكراوانەی كە دروست كردوون، نەبوون (عدم) ێك لە پێش ئەو دروستكراوانەدا بووە، یان خوا بەلەمێژینەییو وەك بەبێ سەرەتا بەدیهێنەرو پەیداكەر بووەو، بەبێ سەرەتا پەروەردگار بووە، بەبێ سەرەتاش دروستكراوو پەروەردەكراوی هەبوون؟؟

## زانایان لەو بارەوە سێ هەڵوێستیان هەن:

١) هەندێك دەڵێن: لە پێش ئەم بوونەوەرەی خۆماندا، خوا هیچ مەخلوقێکی دیکەی دروست نەکردوە، ئەو بوونەوەرە کە دەیبینین، تەمەنەکەی چەند ملیۆن ساڵە، یان ملیارێك ساڵە، یان چەند ملیار ساڵە، بەڵام بەهەرحاڵ ، هەر شتێکی دیاریی کراو، (محدود)ە لە چاو ئەزەل، ئنجا زانایان بەشێکیان ڕایان وایە کە لە پێش ئەم بوونەوەرەی خۆماندا، خوا دروستکراوێکی دیکەی نەبووە، دەڵێن: دروستکراوەکانی خوا لە لایەنی ڕابردووەوە، سەرەتایان هەیەو پێشکەوتوو(مسبوق)ن بە نەبوون (عدم)، یانی: کاتێك بووە کە خوا هیچ دروستکراوێکی نەبووە، بەڵام لە لایەنی داهاتوودا، دەڵێن: کاتێك نابێ کە خوا دروستکراوی نەبێ، بۆچی؟ ، چونکە: بەهەشتییەکان بۆ هەمیشە لە بەهەشتدا دەمێننەوەو، دۆزەخییەکانیش (کافرەکان) بۆ هەمیشە لەدۆزەخدا دەمێننەوە کەواتە: لەگەڵ بەردەوام بوونی خوادا لەگەڵ هەمیشەیی‌و هەرماویی (أَبَدِيّة)ی خوادا، هەندێك لە دروستکراوانی خواش هەرماو (أَبَدي) دەبن، بەڵام بەهۆی خواوە، وەك لە ڕابردوودا باسمان کرد، واتە: بەلای ڕابردوودا دروستکراوەکان سەرەتایەکیان هەیەو کاتێك بووە کە نەبوون، بەڵام بەلای داهاتوودا، کاتێك نابی کەنەبن.

٢) ڕایەکی دیکە هەیە دەڵێ: هەم لە ڕابردوودا کاتێك بووە هیچ مەخلووقێك نەبووە، هەم لەداهاتوودا کاتێك دەبێ هیچ مەخلووقێك نابێ، جەهمییەکان کە مامۆستاکەیان (جەهمی کوڕی صەفوانە) ڕایان وایە، جەهم دەڵێ: دوای ئەوەی ئەهلی بەهەشت دێنە بەهەشت‌و ئەهلی دۆزەخ دێنە دۆزەخ، هیچیان بە ئەبەدیی نامێننەوەو لەبەین دەچن، واتە: لە ڕابردوودا کاتێك بووە[1] کە هیچ شتێك نەبووە، بەس خوا هەبووەو هیچ مەخلووقێکی نەبووە، لە داهاتووشدا کاتێك دێ کە خوا هەر بۆ خۆی دەزانێ چەندان ملیۆن ساڵ تێپەڕ دەبن، کاتێك دێ نە بەهەشت‌و نە ئەهلی

---

١) کات بەمانا گشتییەکەی، نەك مانا تایبەتییەکەی کە لە جووڵەی ماددە پەیدا دەبێ!

بەهەشت، نە دۆزەخو نە ئەهلی دۆزەخ، هیچیان نامێنن، ئەوە ڕای (جەهمی کوڕی صەفوان)ە کە ڕایەکی ڕیزپەڕە لە ڕای مسوڵمانانو پێچەوانەی قورئانو سوننەتیشە.

٣) هەندێکیش دەڵێن: هەم لەلایەنی ڕابردووەوە، سەرەتایەك نیە بۆ دروستکراوەکانی خوا، واتە: نەبوون (عدم) پێش دروستکراوەکانی خوا نەکەوتوەو کاتێك نەبووە، خوا دروستکراوی نەبووبن، هەم لە داهاتووشدا کاتێك نابێ، خوا دروستکراوی نەبن.

ئنجا لە ڕاستییدا ئەم ڕایەی سێیەم کە ڕای ئەهلی حەدیسو زۆر لە زانایانی پێشین (سلف)ە، (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ)، لە هەموو ڕایەکان بەهێزترە، بۆچی؟ چونکە:

أ- خوای تاكو پاك، کاتێك باسی بوونەوەر دەکات، دەفەرموێ: ﴿... وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ... ۝٧﴾هود، واتە: (خوا) پێش ئەوەی بوونەوەر دروست بکات، بارەگای لەسەر ئاوێ بوو. کەواتە: پێش ئەوەی بوونەوەر ببێ، خوا دروستکراوی دیکەی بووە، عەرش بووەو ئاویش بووە.

ب- ئنجا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ۝١٦﴾البروج، واتە: خوا هەرچی بیەوێ دەیکات، دیارە لە ئەزەل دا، خوا ئیرادەی هەر بووە، ، چونکە ئیرادە سیفەتێکی خوایەو، سیفەتی خواش لێی جیانابێتەوە، بۆیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾، هەرچی بیەوێ دەیکات کەواتە: لە ئەزەل دا خوای بەرزو مەزن ویستی بووە، ئنجا کردار (فعل)یش بەرهەمی ئیرادەیە کەواتە: مادام خوا ویستی هەر بووە، دیارە کردەوەشی هەر بووە، کردەوەش خوڵقێنرانی دروستکراوەکانەو، بوون بەخشینە بەدروستکراوەکانو ڕەحم کردنە بە غەیری خۆی.

بەڵێ، دروستکراوەکانی خوا لەم بوونەوەرەدا کورت هەڵنەهاتوون، بەڵکو لە ڕابردووشدا خوا دروستکراوی هەبوون، بەڵام لێرەدا ئیشکالێك دێتە پێش: ئایا ئەمە ئەوە

ناگەیەنێ کە دروستکراوەکانی خواش بێ سەرەتاو (ئەزەلیی)ن؟! دەڵێین: نەخێر، چونکە ئەم بوونەوەرە هەربوو (أزَلي) نیە، ئەوە دیارە، چەند بوونەوەری دیکەش بووبن، تاك تاكیان هەربوو (أَزَلي) نەبوونو هەر كامێكیان نەبوون (عدم)ی پێش کەوتوە، بەڵام بۆ تێکڕاو سەرجەمیان دەڵێین: هەر لەو کاتەوە[1] کە خوا ویستوویەتی دروستکراوی دروست کردوون کەواتە: دروستکراوەکانی خوا بەتێکڕاییو سەرجەمیان، سەرەتایەکیان نیە، بۆچی؟، چونکە خوا لە ئەزەلەوە خالیق بووە. کەواتە: لەئەزەلیشەوە دروستکراوی خولقاندوون، بەڵام تاك تاكی دروستکراوەکان، هەر كامێكیان دیارە نەبوون (عدم)ی پێش دەکەوێ، ئەم بوونەوەرە کاتێك بووە کە نەبووە، بوونەوەرەکەی پێش ئەویش بەهەمان شێوە، هەروەها عەرشیش کاتێك بووە کە نەبووە، وە هەروەها بەڵام سەرجەمیان بەتێکڕا،مادام خوا سیفەتەکانی هەربوو (أَزَلي)ن، دروستکراوەکانی خواش بەرهەمی سیفەتەکاننی، خوا لە ئەزەلەوە خالیق بووە، لە ئەزەلدا ویستی هەبووە، حەکیم بووە، ڕەحیم بووە،... هەموو سیفەتەکان کەواتە: لە ئەزەلیشدا بەرهەمی ئەم سیفەتانەش هەبووە، ئەوە ڕای بەهێزتر (راجح)ە، بەڵام هەڵبەتە ئەوەش لە عەقڵی ئینساندا چاك جێی نابێتەوە.

لە ڕاستیدا من بۆ خۆم زۆر بیرم لێکردۆتەوە، ئەم ڕایەش ئیشکالی هەر لەسەر پەیدا دەبێ، بەڵام هەرچۆن بێ لەوانی دیکە بەهێزترە، ، چونکە هیچ مەعقوول نیە بڵێین: خوا تەنیا پێش ملیارێك ساڵ شتی خولقاندوە، ئەدی لە ئەزەلەوە، ئایا بێکار (معطّل) بووە؟ ئەدی سیفەتەکانی خوا چۆن بەرهەمیان نەبووە؟ ئەوە شتێکی دوورە لە عەقڵەوە، ئنجا لەگەڵ دەقی قورئانیشدا تێك دەگیرێ کە دەفەرموێ: ﴿... وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ... ﴿٧﴾﴾هود کەواتە: پێش ئەم بوونەوەرە، عەرش بووەو ئاویش بووە، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾﴾البروج، واتە: خوا هەرچی بیەوێ دەیکات، هەڵبەتە لە

---

١) پێشتریش گوتمان لێرەدا کات بەمانا ڕەهایەکەی، نەك تایبەتییەکەی، بەکارهاتوە.

ئەزەلدا خوا ویستی هەر بووە، ویستیش بەچی دەردەكەوێ؟ بەكردەوە (فعل) كەواتە: خوای بەرزو بێ وێنە، وەك لە ئەزەلەوە ویستی هەبووە، خاوەن كار (فَعّال)یش بووە! هەروەها دەگونجێ لەو بارەوە، بەڵگە بەو ئایەتەش بێنینەوە: ﴿... كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ ٢٩﴾ الرحمن، واتە: هەموو كاتێك ئەو (خوا) كارێكی هەیە!، ئەم مەسەلەیە هەر ئەوەندەی لەسەر بڕۆین چاكە[1].

دیارە نووسەر لەم خاڵی (١٦)شدا وەك پێشووەكانی، هەمان مەبەستی پێشوو ڕوونتر دەكاتەوەو، دەڵێ:

**١٦) (وَكَمَا أَنَّهُ مُحْيِي الْمَوْتَى بَعْدَمَا أَحْيَا اسْتَحَقَّ هَذَا الإِسْمَ قَبْلَ إِحْيَائِهِمْ، كَذَلِكَ اسْتَحَقَّ اسْمَ الْخَالِقِ قَبْلَ إِنْشَائِهِمْ):**

واتە: وەك چۆن خوا زیندووكەرەوەی مردووانە، دوای ئەوەی زیندوویان دەكاتەوە، خوا بە زیندووكەرەوە (مُحْيِي) ناودەبرێ (یەكێ لە ناوەكانی خوا (مُحْيِي)ە، یەكێك لەناوەكانی دیكەی: مرێنەر (مُمِيت)ە، خوا زیندووكەرەوەو ژیێنەرەو مرێنەریشە)، ئنجا دەڵێ: وەك چۆن خوا دوای ئەوەی كەمردووەكان زیندوو دەكاتەوە، سیفەتی زیندووكەرەوەی هەیە كەچی شایستەی ئەو ناوەی بووە، پێش ئەوەی زیندووشیان بكاتەوە.

ئایا ئێستا كە جارێ خوای پەروەردگار دروستكراوەكانی زیندوو نەكردوونەوە بۆ ڕۆژی قیامەت، ناوی زیندووكەرەوە (مُحْيِي) هەیە، یان نا؟ بێگومان هەیەتی، چونكە ئاشكرایە كە یەكێك لە ناوەكانی خوا زیندووكەرەوە (مُحْيِي)یە، بەڵام ئایا جارێ هیچ كام لە مردووەكانی زیندووكردۆتەوە، ڕۆژی قیامەت هاتووە؟ نەخێر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كە

---

١) پێشتریش گوتم كە عەقڵی مرۆڤ سنووردار (محدود)ەو شتی بێ سنوور (لا محدود)ی تێدا جێ نابێتەوە.

جـاریٚ ئـەو كـارەی نـەكردوە كەچـی بـۆی جـێگیر (إثبـات) دەكـەین‌و دەڵـێین: خـوا زیندووكەرەوەیە، ئنجا دەڵێ:

(كَذَلِكَ اسْتَحَقَّ اسْمَ الْخَالِقِ قَبْلَ إِنْشَائِهِمْ)، واتە: هەر ئاواش خـوا پـێش ئـەوەش كـە دروستكراوەكان دروست بكات، ناوی بەدیهێنەر (خَالِق)ی هەر شایستە بووە.

ئایا پێش ئەوەی خوای پەروەردگار ئەم بوونەوەرە دروست بكات، سیفەتی بەدیهێنـەر (خَالِق)ی هەبووە؟ كە هەر بۆ خۆی دەزانێ چەند دروستكراوی خوڵقانـدوون، پـێش ئـەم بوونەوەرەی خۆمان، ئایا خوا ئەو سیفەت‌و ناوانەی ئێستا هـەینی، ئـەو كاتـەش هـەر بوونی؟ بەڵێ، بە دڵنیاییەوە ئەو ناوو سیفەتانەی هەر بوو ون، ، چـونكە خـوا گـۆڕانی بەسەردا نایەت، تاكو بگوترێ: دوایی پەیدا بوون!.

لە كۆتایی ئەم بابەتە گەورەو گرنگەدا، نووسەر لە خاڵی (١٧)دا وەك بەڵگە هێنانەوە وە تەفسیركردنی مەبەستەكانی پێشوو، دەڵێ:

١٧) (ذَلِكَ بِأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَكُلُّ شَيْءٍ إِلَيْهِ فَقِيرٌ، وَكُلُّ أَمْرٍ عَلَيْهِ يَسِيرٌ، لا يَحْتَاجُ إِلَـى شَـيْءٍ ﴿... لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى):

واتە: ئەوەش بەهۆی ئەوەوە كە خوا بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە، هەموو شتێك پێویستی بەو بووە، هەژارو نەدارەو چاو لە دەستی ئەوە، هەموو كارێك بـۆی ئاسانـە ( چونكە دروستكەرو بەدیهێنەری هەر شتێكی دیكەیە)، (خوا) پێویستی بە هیچ شتێك نیە، چونكە هەر شتێك غەیری خـۆی دروسـتكراوە، ئـەو دروسـتكراوە، چ بـۆ نەفسـی بوونەكەی، چ بۆ هەموو كاتەكانی، چاوی لە دەستی خوایە، كەواتە خوای بێ نیازو جێی نیاز چۆن پێویستی بەویە؟! كەسێك هەرچی زانستی هەیەتی‌و هەرچی مـاڵی هەیـەتی‌و

هەرچی نیعمەتی هەیەتی، تۆ بەسەرتدا ڕشتبێ، ئایا پێویستیت بە هیچ كام لە شتەكانی وی دەكات؟ نەخێر، چونكە تۆ بۆ خۆت پێت داوە (وَللهِ مَثَلُ الأَعْلَى)، ئنجا كۆتاییی ئـەو باسە بەو ئایەتە دەهـێنێ كـە دەفـەرموێ: ﴿...لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾الشورى.

واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە، خوا بیسەری بینەرە كە ئێمە دوایی قسە لەبارەی ئەو ئایەتەوە دەكەین.

## وەلاَمدانـەوەی چـەند پرسـیارێك لەبارەی دەسـتەلاَتـی بـێ سـنووری خـواوە

با تۆزێك هەڵوەستە بكەین بەرانبەر بە ڕستەی یەكەم كە دەڵێ: (ذَلِكَ بِأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، یانی چی؟

١- یەكێ بۆی هەیـە بڵـێ: باشە خوا كە لەسەر هـەموو شتێك بە توانایە، دەتوانێ (٢ + ٢=٤) بكات بە (٢+٢=٣)؟!

٢- یان ئایا خوا دەتوانێ، لە یەك كاتدا شتێك وا لێبكات هەشبێ‌و نەشبێت؟

٣- یان ئایا خوا دەتوانێ، خوایەكی وەك خۆی دروست بكات؟

٤- یان ئایا خوا دەتوانێ، خۆی لەبەین بەرێ؟

٥- یان ئایا خوا دەتوانێ، شتێك وا لێبكات بەشێكی لە هەمووی گەورەتر بێ؟

٦- یان ئایا خوا دەتوانێ كەسێك لە شوێنێك دابنێ كە موڵكی خۆی نەبێ؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەو پرسیارانە لە خودی خۆیان دا هەڵەن، چونکە:

ئێمە دەڵێین: خوا لە چەندان شوێن دا دەفەرموێ: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠﴾ البقرة، واتە: خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، بەڵام ئەوانەی تۆ دەیانڵێی شت نین و تەنیا لە وەهم دا هەن و خەیاڵن، بەڵام لە واقیعدا گونجاو (ممکن) نین و مەحاڵ (مستحیل)ن:

١- جاری ئەوە کە: دەڵێن (٢ + ٢) بکاتە (٣)، ئەوە مەحاڵە، ئەوە شت (شيء) نیە، تاکو ویست و دەسەڵاتی خوا ڕووی تێبکەن: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٠﴾، ئەدی ئەوەی شت (شَيء) نەبێ؟!.

٢- ئەوە کە خوا شتێك وا لێبکات: هەشبێ و نەشبێ، دیسان مەحاڵە و ناگونجێ ببێ، واتە: شت (شيء) نیە، تاکو خوا بیخوڵقێنێ!.

٣- ئەوە کە خوایەکی دیکە بخوڵقێنێ وەك خۆی بێ، ئەوە مەحاڵە، چونکە ئەوەی کەخوا دەیخوڵقێنێ دروستکراوە، مانای وایە وەك خوا نابێ، کەواتە: خوایەکی دیکەی وەك خوا، شت (شيء) نیە، تاکو بگونجێ خوا بیهێنێتە دی.

٤- ئەوە کەخوا خۆی لەبەین بەرێ، ئەوە مەحاڵە، بۆچی؟

چونکە خوا، بوون پێویستە (واجب الوجود)ە و، دەبێ هەر ببێ و، ناگونجێ نەبێ، ئەوەش دیسان شت (شيء) نیە. تاك و خوا بیخوڵقێنێ.

بەڵێ، خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە، بەڵام شتێك کە (شت) بێ و بگونجێ لە عالەمی واقیعدا هەبێت، زانایان دەڵێن: بوون (وجود) سێ بەشە:

أ- (واجب)ی هەیە.

ب- (ممکن)ی هەیە.

ج- (مستحیل)ی هەیە.

یەکەم: خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) (واجب الوجود)ە، ئەویش ئەوەیە کە ناگونجێ نەبێ، نەلە ئەزەلدا، نەلە ئەبەددا، ناگونجێ کاتێ بووبێ نەبووبێ، کاتێکیش ببێ نەبێ، ئەوە (واجب الوجود)ە کە خوایە، ئەوەی کەبوونی پێویستە، بەس خوایە، بۆچی واجبە؟ چونکە بەبێ بڕواهێنان بەوەی کە خوا، بوون پێویستە (واجب الوجود)ە، ناگونجێ تۆ بوونی هیچ شتێك تەفسیر بکەی کە هەمووی پەیدا کراوە، ئەدی کێ پەیدای کردوە؟ هەمووی بوونەکەی بوونێکی زاتیی نیە، بەڵکو وەریگرتوە، ئنجا ئایا کێ پێی بەخشی؟! ئەمە وەك ئەوە وایە کابرایەك ، هەتا دوێنێ سواڵی پێ شیابێ، وەك بەرپرسە حیزبییەکان کە هی وایان هەبووە سواڵی پێ شیاوە، کەچی ئێستا قەسری چەند ملیۆن دۆلاری بۆ پەیدابووە، دەی باشە لە کوێ بۆی پەیدا بووە؟ حەتمەن لە شوێنێکەوە بۆی هاتوەو ماڵی ڕەش‌و ڕووتانە، پەزمەندەی کردوەو وەسەرێکی ناوەو خۆی پێ دەوڵەمەندکردوە، ئەو شتانەی ئێمەش دەیانبینین، ئەو دیاردە سروشتییانە هەر کام لە: مانگ، ڕۆژ، کەهکەشان، مرۆڤ، ئاژەڵ، زیندەوەر... کاتێ بووە نەبووە، ئەدی کێ بوونی پێ بەخشی‌و لە کوێوە هات؟ خۆی نەبووە تاکو بۆ خۆی خۆی بەدی بهێنێ، وەك دەڵێ: چەوەندەرێك لەو گۆڕە هەڵقەنە، کابرا بۆخۆی شتێکی نەبێ، چۆن پەیدای دەکات؟ مەحاڵە (فَاقِدُ الشَّيْءِ لا يُعْطِيهِ) بنچینەیەکی مەنتیقییە کەسێك شتێکی نەبێ، ناتوانێ بیبەخشێ، من کاتێ بووە نەبووم، ئەدی چۆن دەگونجێ بڵێم: بۆ خۆم بوونی خۆم پەیداکردوە؟ ماددە عەقڵی نیە، عیلمی نیە، ژیانی نیە، دیتن‌و بیستنی نیە، ، چونکە ئەسڵی بوونەوەر (كَوْن) هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ماددە، ئەویش بۆ گەردیلە، گەردیلە (ذرّة)ش لە سێ بەشی پێکدێ: ئەلیکترۆن، پرۆتۆن، نیوترۆن، بارگەی ساردو گەرم‌و بێ بارگە، ئنجا ئەو گەردیلانە هیچیان عەقڵیان هەیە؟ زانیارییان هەیە؟ حیکمەتیان هەیە؟ ڕەحم‌و بەزەیی‌و ژیان‌و دیتن‌و بیستنیان هەیە؟ نەخێر، ئەدی چۆن ماددە توانی ئینسانێك بخولقێنێ ئەو سیفەتانەی هەبن؟ ئەو سیفەتانەی ئینسان چۆن دەگونجێ بڵێی: لە ماددە پەیدا بوون؟ کوا ماددە کەی ئەو سیفەتانەی هەن؟ کەواتە: ئەو سیفەتانە لە ئینساندا هەن، لە سەرچاوەیەکی

دیكەوە هاتوون كە ئەو سیفەتانەی هەن. ئەویش خوایە: خوا زانستی هەیە ئینسانیشی دروست كردوەو زانستی پێ بەخشیوە، خوا دەبینێ، ئینسانیشی دروست كردوە، بینینی هەیە، خوا ژیانی هەیە، ئینسانیشی دروست كردوە ژیانداره.

كەواتە: ئێمە كاتێك ئەو بەدیهێنراوانە دەبینین‌و تەماشا دەكەین، هیچ كامیان بوونەكەی لە خۆیەوە نیە، بەڵكو دوای ئەوەی كە نەبووە پێی بەخشراوە، ناچارین بڵێین: لە سەرچاوەیەكەوە كە خاوەنی بوونێكی زاتییە، ئەو بوونەیان پێدراوە، ئەدی بۆچی نەڵێین: ئەدی ئەو كێ خولقاندوویەتی؟ لە وەڵامدا دەڵێین: ، چونكە تووشی زنجیرەی بێ بڕانەوە دەبین كە شتێكی مەحاڵە، یان تووشی (دەور) دەبین كە ئەویش شتێكی مەحاڵە، وەك پێشتر باسمان كرد، كەواتە: ناچارین دەبێ دان بەوەدا بنێین كە زاتێك هەیە (واجب الوجود)ە بوونەكەی پێویستە ببێ كە خوایە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ).

دووەم: (ممكن الوجود) هەیە كە بوون‌و نەبوونەكەی دەگونجێ، دەگونجێ هەبێ دەگونجێ نەبێ، هیچ شتێك نیە نە بوونەكەی فەرز بكات، نە نەبوونەكەی، ئەویش دروستكراوەكانن، غەیری خوا هەمووی (ممكن الوجود)ە، ئێمە، بوونەوەر، عەرش، كورسی... هتد، هەرچی غەیری خوایەو دروست دەكرێ، هەمووی (ممكن الوجود)ە یانی: بوونەكەی فەرز نەبووە، دەگونجا هەبێ و دەگونجا نەبێ.

سێیەم: (مستحيل الوجود)دیش هەیە كە بوونەكەی مەحاڵ (مستحيل)ە كە بریتیە لەو شتانەی نامەعقووڵن‌و عەقڵ ڕێگایان پێ نادات، وەك ئەوە كە (٢ + ٢) بكاتە (٣)، وەك ئەوە كەبەش (جزء) لە هەموو (كُل) گەورەتربێ، وەكو ئەوە كەشتێك لەیەك كاتدا ببێت و نەشبێت، وەكو ئەوە كەخوا خۆی لەبەین بەرێ، ئەوانە هەموو بەس لە وەهمی ئینساندا هەن، هەر كام لەوانە بەوشە دەگوترێ، بەڵام لەدنیای واقیعدا ناگونجێ ببێ.

کەواتە: دەڵێین: بەڵێ، خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە، بەڵام هەموو شتێك کە (شت) بێت، بەڵام ئەوانە شت نین، واتە: دەبێ شتەکە، بوون گونجاو (ممکن الوجود)بێ، نەك بوون نەگونجاو (مستحيل الوجـود)، ئنجا لێرەدا یەکێ بۆی هەیە بڵێ: ئایـا ئەگـەر خـوا نەتوانێ شتێکی مەحاڵ (مستحيل) دروست بکات، دەستەوستـانیی نادرێتـە پـاڵ خـوا؟ لەوەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە خوا بۆخۆی ئەو یاسایانەی وادا ناون، خوای پـەروەردگار بەپێی ئەو یاساو دەستوورانە وایداناوە کە شتی مەحاڵ نەکات.

ئنجا دەڵێ: (وَكُلُّ شَـيْءٍ إِلَيْهِ فَقِيـرٌ) هـەموو شتێك پێویستی بـە خـوا هەیـە، بـۆ ئەسڵی بوونەکەی پێویسـتی بە خوا هەیەو بۆ درێـژەدان بە بوونی، دیسان پێویستی بـە خوا هەیـە، هەر هەموو شـتێك، (وَكُلُّ أَمْرٍ عَلَيْـهِ يَسِيـرٌ)، هـەموو کارێـك بـۆ خـوا ئاسانە، (لا يَحْتَاجُ إِلَى شَـيْءٍ) خوا پێویستی بە هیچ شـتێك نیـە، چونکە هـەموو شـتێك غەیری خوا مەخلووقەو خۆیو بوونەکەیو هەرچی کە هەیەتی لە خواوەیە، خـوا پێویسـتی پێ نیە.

*********

# باسێك لەبارەی سیفەتەكانی خـواوە

لەكۆتاییدا ئەو ئایەتە دەهێنێ كە خوا دەفـەرموێ: ﴿...لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾، هیچ شتێك وەك خوا نیەو خوا بیسەری بینەرە.

ئەم ئایەتە بەرپەرچی دوو بۆچـوونی هەڵــە دەداتەوە، لـە بـواری ســـیفەتەكانی[1] خـــوادا ﷻ.

## ســێ بۆچوون كە یەكیان ڕاستەو دوانیان هەڵەن لەبارەی سیفەتەكانی خواوە:

١) بۆچوونی یەكەم: وێچواندن (تشبیە)ە كە خوای بێ وێنە بچوێنی بە دروستكراوەكانی، وەك ئەوە بڵێی: من چۆن پێویستم بەوەیە لەسەر كورسی دانیشـم، خـواش (ســبحانە وتعالی) ئاوا لـەسـەر كورسی، یان (عـەرش) دادەنیشێ، واتە: خوا پێویستی بە غــەیری خۆی هەیە، ئەوە وێچواندنە كە بێگومان ئەوە شتێكی زۆر هەڵەیە.

٢) بۆچوونی دووەم: پەككخستن (تعطیل)ە، واتە: دارنینی سیفەتەكان لــەخوا، بـۆ وێنــە: موعتـەزیلەكان بۆچوونیان وایە كە خوا سیفەتی نین، بـە تایبــەت ســیفەتەكانی وەك چوونە سەر بارەگا (الإستواء علی العرش)، دەست (یـد)، ڕوو (وجـە)، چـاو (عــین)، دەڵێن: خوای پەروەردگار ئەو سیفەتانەی نین، بۆچی؟ ، چونكە پێیان وایە، ئەگەر تۆ گوتت خوای بێ وێنە ڕوو (وجە)ی هەیە، واتە: ڕووەكەی وەك هی بەشەرە، بە هەمان شێوە هەموو سیفەتەكانی دیكە دادەڕنن لە خوای پەروەردگار.

---

١) لە خوا بەزیاد بێ لە هەركام لە بەرگی (٣)ی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی..)داو، بەرگی (٢)ی (الإسلام كما یتجلّی في كتاب الله)دا لێكۆڵینەوەیەكی خستو خۆڵمان لە بارەی ناوو سیفەتەكانی خوای بەرزو مەزنو بێ وێنەو كردەوە، بەتایبەت یەكەمیان.

٣) بۆچوونی سێیەم: چەسپاندن لەگەڵ بەپاك گرتندا (إثبات مع تنزيه) كە ئەمە بۆچوونی ڕاستەو لە نێوان هەردوو بۆچوونەكەی دیكە دایە، ئەویش ئەوەیە كە تۆ بڕوات وابێ: خوا خاوەنی هەموو سیفەتێكی بەرزو چاكە، ئەو سیفەتانەی كە لە قورئانو سوننەتدا هاتوون، خوا ئەو سیفەتانەی هەموو هەن، بەڵام بە شێوەیەك كە لە خۆی دەوەشێتەوە، بۆ وێنە: چوونە سەر عەرش (الإستواء على العرش) دەڵێین: بەڵێ، خوا چۆتە سەر عەرش، بەڵام بەو شێوەیەی كە لە خۆی دەوەشێتەوەو بەو چۆنییەتیەی كە لە خۆی دەوەشێتەوە، خوا دەستی هەیە، بەڵێ، بەڵام دەستێك كە لە خۆی دەوەشێتەوە، هەروەها گشت سیفەتەكانی دی بە هەمان شێوە، یانی: ئێمە دان بە ئەسڵی سیفەتەكەدا دەهێنین، بەڵام چۆنییەتییەكەی حەواڵەی خوای دەكەین، مادام زاتی خوا، وەك زاتەكانی دیكە نەبێ، سیفەتەكانیشی وەك سیفەتەكانی دیكە نین، وەك چۆن زاتی وەك زاتی مەخلووقەكانی نین، سیفەتەكانیشی وەك سیفەتەكانی وان نین.

شایانی باسیشە ئەم ڕستە قورئانییە كە دەفەرموێ: ﴿...لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى، زانایانی ئیسلام ئەوانەی كە لە عەقیدەی ئیسلامییان توێژیوەتەوە، زۆر گرنگییان پێداوە، چونكە بەشی یەكەمی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾، ئەوە بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە كە پێیان دەگوترێ: وێچوێنەرانو جەستێنەران: (مُشَبِّهَة)و (مُجَسِّمَة) كە ئەوانەن خوا ﷻ بە مەخلووقەكانی دەچوێنن، جا چ لە ڕووی (ذات)ەوە، چ لە ڕووی (صفات)ەوە، ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾، یانی: هیچ شتێك وەك خوا نیە، ئەوە بەرپەرچی ئەوان دەداتەوە كە خوا نەلە زاتیدا، نەلە سیفەتیدا،وەك هیچ كام لە دروستكراوەكانی نیە، ، چونكە هەرچی شتێك هەبێ، دروستكراوی خوایە، هیچ كام لە دروستكراوەكانی خوا وەك وی ناچن، ئەویش وەك هیچیان ناچێ. بەشی دووەمی ئەو ڕستە قورئانییە كە دەفەرموێ: ﴿...وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾، ئەو، بیسەری بینەرە، ئەویش بەرپەرچی قسەی ئەوانە دەداتەوە كە پێیان دەگوترێ: پەككخەران، داڕنەران

(مُعَطِّلَـة)، ئەوانەی کە بە حیسابی خۆیان دەیانەوێ خوای بەرز، زۆر (تَقْـدِیس)و (تَنْزِیـه) بکەن، دێنن هەموو سیفەتەکانی لێ دادەڕنن، بۆ وێنە: دەڵێن: خوای زانا کە دەفەرموێ: ﴿ ... ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ... ﴿٥٤﴾ ﴾الأعراف، دەڵێن: نەخێر خوای پەروەردگار نەچۆتە سەر عەرش، هەروەها دەڵێن: خـوای بـێ وێنـە دیـتنی نیـە، بیسـتنی نیـە، هـەروەها سیفەتەکانی دیکەش ... هتد، بە حیسابی خۆیان ئەو سیفەتانە دەبنـە هـۆی وێچـواندن (تَشْبیه) و جەستاندن (تَجْسِیم) بۆ خوای پەروەردگار!!

بەڵام لە حەقیقەتدا ئەوەی کەئەهلی سوننەتو جەماعەت دەیڵێن، لە نێوان ئەو دوانە دایە، لە نێوان (تَشْبیه) و (تَعْطِیل) دایە، هەروەك چۆن شـوبهاندنی خـوا بـە یـەکێ لـە مەخلووقەکانی هەڵەیە، بە هەمان شێوە: لابردنی یەکێ لەو سیفەتانەی کە لـە قورئـانو سوننەتدا خوا بۆ خۆی بڕیاری داون، دیسان ئەویش هەڵەیە.

دەمێنێتەوە ئەوە کە ئایا ئەو بەپاکگرتن (تنزیە)ە، چۆن بکرێ؟

خوای پەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ ... ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ... ﴿٥٤﴾ ﴾الأعـراف، یـان دەفـەرموێ: ﴿ ... وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ... ﴿٧﴾ ﴾هـود، یـان دەفــەرموێ: ﴿ ... يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ... ﴿١٠﴾ ﴾الفـتح، یـان دەفـەرموێ: ﴿ ... فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا .. ﴿٤٨﴾ ﴾الطور، یان لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هاتوە، کە دەفەرموێ: { يَنـزِلُ رَبُّنَـا تَبَـارَكَ وَتَعَـالَى كلَّ لَيْلَـةٍ إِلَـى السَّـمَـاءِ الدُّنْيَـا، حِيـنَ يَبْقَى ثُلُـثُ اللَّيْـلِ الآخِـرِ، يَقُـولُ: مَـنْ يَدْعُـونِي فَأَسْـتَـجِيـبَ لَـهُ، مَـنْ يَسْـأَلُنِي فَـأُعْـطِيَـهُ، مَنْ يَسْتَـغْـفِرُنِي فَـأَغْفِـرَ لَـهُ} حديث صحيح.[1]

١) أَخْرَجَهُ مَالِك برقم: (٤٩٨)، وَأَحْمَد برقم: (١٠٣١٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٠٩٤)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٧٥٨)، وَأَبو دَاوُدَ برقم: (١٣١٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٤٩٨) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٣٦٦).

واتە: خـوا (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی یەكەم، كاتێك سێیەكی كۆتایی شـەو دەمێنێ، دەفەرموێ: كێ داوام لێدەكات، وەڵامی دەدەمەوە؟ كـێ داوای شتێكم لێدەكات، پێی دەبەخشم؟ كێ داوای لێخۆشبوونم لێدەكات، لێی خۆشدەبم؟

جا ئایا ئێمە چۆن بتوانین بڕوا بەو ئایـەت و فـەرموودەو هاوشـێوەكانیان بێنـین‌و سیفەتەكانی خوا بۆخوا بچەسپێنین، لە هەمان كاتدا خوای بەرزیش بە پـاكگیراو (مُنَزَّه) دابنێین‌و، وەك دروستكراوەكانی تەماشای نەكەین؟

لێرەدا دەڵێین: زانایانی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت بنچینەیەكیان دانـاوە، ئـەویش ئەوەیە، كە ئەو سیفەتانەی خوا بۆ خۆی باسیان دەكات، چ لە قورئاندا، چ لە سـوننەتی پێغەمبـەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ئێمـە دێـنین ئـەو سـیفەتانە هـەموویان بـۆ خـوای پەروەردگار بڕیار دەدەین، بەڵام دەربارەی چۆنییەتییەكەیان ڕادەوەستین، لـەو بـارەوە لـە هەموو كتێبەكانی عەقیدەدا ئەو مەسەلەیە لە پێشـەوا مالیـك ڕیوایـەت دەكـەن، كـە پرسـیاری لێـدەكرێ دەربـارەی: ﴿... ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ... ﴿٤﴾﴾ السـجدة، وەڵامدەداتەوە دەڵێ: (الإِستوَاء مَعْلُومٌ وَالكَيفيَة مَجْهُولة وَالسؤال عَنْهُ بِدْعَة والإِيمانُ بهِ واجب)، واتە: (إستوى عَلَى العَرْش) یانی: چووە سەر عەرش، یان بـەرز بـۆوە بـۆ سـەر عەرش، ئەوە ماناكەی زانراوە، بەڵام چۆنییەتییەكەی نەزانراوە بۆ ئێمـە، بۆچـی؟ ئێمـە دڵنیاین كە (إستوى عَلَى العَرْش) وەك من ئێستا لەسەر ئەو كورسیەدا دانیشتووم، خوای بەرزو مەزن ئاوا لەسەر عەرش دانەنیشتوە، ، چونكە ئەوە جەستەبوون دەگەیەنێ، ئەوەش وێچواندن (تشبیه)ە كەواتـە: (إسـتواء)ی خـوا لەسـەر عەرشـی خـۆی، وەك دانیشـتن‌و ڕاوەستانی ئێمە لەسەر تەخت‌و بارەگا نیە، ، چونكە ئەوە چەسپاندن‌و شوبهاندنی خوایـە بە مەخلوقەكانی. كەواتە: ئێمە ئەسڵی مانای (الإستواء) دەزانین چۆنە، بەڵام تەنیا بـۆ دروستكراوەكان مەعلومە، بۆ ئێمەو لە فەرهەنگی مێشكی ئێمەدا مەعلومە، ئەگـەرنا (والكیفیة مجهولـة)، چۆنییەتییەكەی شتێكی نەزانراوەو ئێمـە نـایزانین، بۆچـی نـایزانین؟ چونكە سیفەتی خواش هەروەك زاتییەتی، سیفەت لقی زاتە، ئنجا ئایا زاتی خـوای بـێ

وێنە بۆ ئێمە شتێکی زانراو (معلوم)ە؟ نەخێر، دەجا سیفەتەکانیشی بەهەمان شێوە. بەڵام بەهۆی شوێنەوارەکانییەوە زاتی خوا دەناسین، بە هۆی کردەوەکانییەوە کە بەرهەمی سیفەتەکانیو بەرهەمی ناوە بەرزەکانی، ئێمە دەزانین کە پەروەردگارێك هەیە، بوونەوەرو کائیناتێك دەبینین، ناتوانین پەیدابوونەکەی تەفسیر بکەین، بەبێ دانهێنانو بڕوا هێنان بە زاتێکی زاناو تواناو بێ وێنەدا کە خوایە، بەڵێ، ئێمە بە هۆی کردەوەکانی خواو بە هۆی مەخلوقەکانی خواوە، پەی بە سیفەتەکانی دەبەین، ئنجا وەك چۆن چۆنییەتی زاتی خوا بۆ ئێمە زانراو (معلوم) نیە، بە هەمان شێوە سیفەتەکانیشی بۆ ئێمە مەعلووم نین، دوایی ئیمام مالیك گوتوویەتی: (والإيمان به واجب)، بڕوا هێنانیش بەوەی کە خوا چۆتە سەر عەرش واجبە، چونکە خوا بۆ خۆی دەفەرموێ: ﴿... ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ... ﴿٤﴾﴾ السجدة، دەبێ ئیمانی پێ بێنین، بەڵام (والسؤال عنه بدعة)، چۆن چۆتە سەر عەرش؟ دەڵێ: پرسیار لەبارەوە کردنی بیدعەتەو شتێکی داهێنراوە، لە سەردەمی هاوەڵانو پێشینە چاکەکاندا شتی وا نەبووە، بەڵکو ئەوان گوتوویانە: خوا کە دەفەرموێ: خوا چووە سەر عەرش[١]، عەرشی خوا لەسەر ئاوێیە[٢]، دەستی خوا لەسەر دەستی وانەوەیە[٣]، تۆ لە ژێر چاودێریی ئێمە دای[٤]، ڕووی خوا دەمێنێتەوە[٥]، ئەوان گوتوویانە: دەزانین ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە: خوا دەستی هەیە، وەك دەستی ئێمە، ڕووی هەیە وەك ڕووی ئێمە، چۆتە سەر عەرش وەك چوونە سەر کورسی ئێمە، دەزانین کە ئاوا نیە، بەڵام دەشڵێین: ئەو سیفەتانە مادام خوا بۆ خۆی فەرموونی، دانیان پێدا دەنێین، بەڵام

---

١) ﴿... ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ... ﴿٤﴾﴾ السجدة.

٢) ﴿... وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ ... ﴿٧﴾﴾ هود.

٣) ﴿... يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ... ﴿١٠﴾﴾ الفتح.

٤) ﴿... فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ... ﴿٤٨﴾﴾ الطور.

٥) ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ... ﴿٢٧﴾﴾ الرحمن.

چۆنییەتییەکەیان حەواڵەی خوا دەکەینەوە، هەروەك چۆن زاتی خوا بۆ ئێمە شتێکی زانراو (معلوم) نیە، بەڵام بڕواشمان پێی هەیە، سیفەتەکانیشی، چ سیفەتی (ذات) بن، چ سیفەتی کردار (فعل) وەك چوونە سەر عەرش، یان ئەوە کەخوای بەرز، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەخاتە ژێر چاودێریی خۆیەوە: ﴿..فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ...﴿٤٨﴾﴾الطور، ئەوە سیفەتی کردارە، هاتنە خوارەوەی خوا بۆ ئاسمانی یەکەم، سیفەتی کردارە، بەڵام تواناو زانستو ویستو حیکمەت و بەزەیی ئەوانە سیفەتی زاتن، جا ئێمە سیفەتی کردار، یان سیفەتی زات، هەردووکیان چۆنییەتییەکەیان حەواڵەی خوا دەکەینەوە، خوا بۆخۆی چۆنییەتییەکەیان دەزانێ.

ئێمە دەڵێین: ئیمانمان بەوە هەیە کە خوا هەموو شتێك: دەزانێ، دەتوانێ، دەبینێ، دەبیستێ، چۆتە سەر عەرش، خوا دەستی هەیە، ڕووی هەیە، بەڵام بە شێوەیەك کە لە خۆی دەوەشێتەوە.

*******

## هاوسەنگیی (إعتدال)ی ئەهلی سوننەت و جەماعەت

ئنجا لە ڕاستیدا ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت، یانی: ئەوانەی کە خەتی پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) و جێنشینە سەرڕاستەکانیان درێژە پێداوە کە ئێمەش ئومێدەوارین، خوا لەگەڵ ئەوانمان حسێب بکات، ئەوانە بەردەوام لە هەموو کارەکاندا، خەتی نێوەڕاستیان گرتوە:

أ- **لە بواری مامەڵە کردن لەگەڵ سیفەتەکانی خوادا:** لە نێوان (تشبيه)و (تعطيل)دا، (تنزيه)یان هەڵبژاردوە، (تشبيه) ئەوەیە کە خوا وەك دروستکراوەکان تەماشا بکەی، (تعطيل)یش ئەوەیە کە سیفەتەکانی لێ دابڕنی، (تنزيه) ئەوەیە کە هەرچی خوا بۆ خۆی بڕیاریداوە، لە بارەی زات‌و سیفەتیەوە بۆی بڕیار بدەی، بەڵام نەك وەك دروستکراوەکان تەماشای بکەی.

ب- **لە بواری قەزاو قەدەردا:** هەروەها ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت لەبواری قەزاو قەدەریشدا، لە نێوان قەدەریی‌و جەبرییەکاندان، جەبرییەکان دەڵێن: ئینسان هیچ شتێکی بەدەست خۆی نیەو، خوا هەموو شتێکی پێدەکات، هەرچی ئینسان دەیکات، خوا پێی دەکات، قەدەرییەکانیش دەڵێن: نەخێر، ئینسان بۆ خۆی کردەوەکانی خۆی دروست دەکات‌و، خوا هیچ حەقی بەسەر کردەوەکانی ئینسانەوە نیە، خوا دەیەوێ ئینسان چاکە بکات، بەڵام ئینسان دەیەوێ خراپە بکات، ئیرادەی ئینسان بەسەر ئیرادەی خوادا زاڵ دەبێ، موعتەزیلە (قَدَرِيّة) وا دەڵێن، بەحیسابی خۆیان دەیانەوێ دیفاع لە دادگەریی خوای دادگەر بکەن، دەڵێن: چۆن دەبێ خوای پەروەردگار کردەوەی خراپ بە ئینسان بکات‌و کردەوە خراپەکانی ئینسان دروست بکات، دواییش سزای بدات!؟ بە حیسابی خۆیان دەڵێن: ئەوە پێچەوانەی عەدالەتە، بۆ ئەوەی کەدیفاع لە عەدالەتی خوا بکەن، دێنن ئیرادەی خواو دەسەڵاتی خوا تەسك دەکەنەوە!

جەبرییەکانیش بۆ ئەوەی دیفاع لە زانستی خواو دەستەڵاتو ئیرادەی خوا بکەن، دێنن عەدالەتی خوای پەروەردگار دەڕووشێنن، بەڵام ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەڵێن: نەخێر، نە بەو شێوەیەیە کە ئینسان هیچی بە دەست نەبێ، نە ئەوەشە کە ئینسان دروستکەرو بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆی بێ، بەڵکو ئینسان بەدەست هێنەر (کاسب)ی کردەوەکانی خۆیەتی، کردەوەکانی خۆی بەدەست دێنێ، خوا بۆی دەخولقێنێ، بەڵام بۆ خۆی بەدەستی دێنێ، بۆچی خوا بۆی دەخولقێنێ؟ چونکە ئینسان خالیق نیە، بەڵکو مەخلووقە، ئینسان ناتوانێ بخولقێنێ، بەڵکو دەتوانێ هەڵبژێرێ، توانای هەڵبژاردنی هەیە، توانای بەدەستهێنان (كَسْب)ی هەیە، بەڵام توانای بەدیهێنانی نیە، چونکە بەدیهێنان (خلق) سیفەتی خوایە: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٖ ...﴿٦٢﴾ ﴾ الزمر، (شيء) یانی: هەر شتێك، کردەوەی ئینسانەکانیش (شيء)ە[1] کەواتە: خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) دەیخولقێنێ، ئەدی دەوری ئینسان لێرەدا چیە ؟ ئینسان بەدەستی دێنێو هەڵیدەبژێرێ، خواش بۆی دەخولقێنێ.

ج- **لە بواری مامەڵەکردن لەگەڵ قورئانو سوننەتو لەگەڵ زانایاندا:** ئەهلی سوننەتو جەماعەت، لە هەموو شتێکدا هەر خەتی نێوەڕاستیان گرتوە، کەسانێك دەڵێن: بە دوای قورئانو سوننەت دەکەوین، بەڵام بەرهەمو تێگەیشتنی زانایان سەبارەت بە قورئان و سوننەت وەلا دەنێین! وە خۆیان بێبەش دەکەن لە بواری فیقهدابێ، لە بواری تەزکیەی نەفسدا بێ، لە بواری سیاسەتی شەرعییدا بێ...هتد. کەسانێکی دیکەش دێن بە بەهانەی ڕێزگرتن لە زانایان و شەرعزانانو پێشەوایان، خۆیان مەحرووم دەکەن لە قورئان و سوننەتو، دەڵێن: هەرچی هەبێ ئەوان دەریان هێناوە، بەڵام ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەڵێن: نەخێر، دەبێ ئێمە بە دوای

---

١) پێشتریش لەو بارەوە قسەم کرد، دیارە کردەوەکانی مرۆڤیش شتە (شيء)ن بەڵام شتێکی وەدەستهێنراو (مکسوب)و ئەنجامدراو (مفعول)و گێڕراو (مجعول) هەموو ئەو سیفەتانەش لە مرۆڤدا هەنو مرۆڤ (کاسب و فاعل و جاعل)ە ئەوەندەش بەسسە بۆ ئەنجامدانی کردەوەکانی.

قورئـانو سـوننەت بكـەوین، بـەڵام ڕێزیشـمان بـۆ زانایـانو شـەرعزانان هەیـەو بەرهەمەكانیشیان لەسەر سەرو چاو دادەنێینو ڕێزی لێ دەگرین، بەڵام لەبەر تیشكی قورئانو سوننەتدا سوودیان لێ دەبینینو، قورئانو سوننەت دەكەینە حاكم بەسەر ئەو بەرهەمو كەلەپوورەدا، ئەگەرنا لە لامان بەڕێزنو پێشەوای ئێمەنو ڕابەرو چاوساغی ئێمەبوون، خوا پاداشتیان بداتەوە، زۆریش بە ئەدەبو ڕێزدەبین لەگەڵیاندا، خەتی نێوەڕاست دەگرین: نە قورئانو سوننەت واز لێ دەهێنین بۆ بەرهەمی زانایان، نە بەرهەمی زانایان پشت گوێ دەخەین، بۆچی بەدوای قورئانو سوننەت دەكەوین؟ چونكە هەر قورئانو سوننەت پێمان دەڵێن بەدوای قورئانو سوننە بكەون، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ ...أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ... ﴿٥٩﴾ ﴾النساء، واتە: گوێڕایەڵیی خوا بكەن (كتێبی خوا)، گوێڕایەڵیی پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بكەن (سوننەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)) ئنجا هەرئەوانیش پێمان دەفەرموون: ﴿ ...فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾النحل، واتە: لە زانایان بپرسن، ئەگەر نازانن. كەواتە: ئەو قورئانەی كە پێمان دەڵێ: بە دوای قورئانو سوننەت بكەون، هەر ئەو قورئانەش پێمان دەڵێ: لە زانایان بپرسن، ئنجا ئەو زانایانەش كە ئێمە بە دوایان دەكەوینو ڕێزیان لێ دەگرین، هەر ئەوانیش پێمان دەڵێن بە دوای قورئانو سوننەت بكەون.

*****

## خوێنەری بەڕێز!

لە خاڵی هەژدەیەم (١٨)ەوە، هەتا خاڵی بیستو هەشتەم (٢٨) واتە: یازدە (١١) خاڵ نووسەر بۆ خستنەڕووی، یەك بابەتی تەرخان كردوە كە بابەتێكە لەو بابەتانەی لە مێژووی مسوڵمانانداًً، زۆرترین مشتو مڕو قسەو باسیان لەبارەوە كراوە، ئەویش بابەتی (قەدەر) یان (قەزاو قەدەر)ە.

شایانی باسیشە كە ئەوەی نووسەر لەو یازدە خاڵـەش (١٨-٢٨)دا باسـی دەكـات، هەرچەندە لەژێر ناوو نیشانی: (قەزاو قەدەر)دایە، بەڵام هەموویشـی دیسـان پەیوەستە بەبابەتی پێشووەوە، بابەتی: باسی خوای بێ هاوەڵو سـیفەتو كردەوە بـێ وێنـەكانی، چونكە مەسەلەی قەدەریش ڕاستەوخۆ پەیوەستە بەسیفەتەكانی خواوە، بەتایبەت: ویستی خوا، زانیاریی خوا، دەستەڵاتی خوا، دادگەریی خوا...

سەرەتا نووسەر لە خاڵی (١٨)دا باسی زانیاریی ڕەهاو بێ سنووری خوا دەكات كە خوا هەموو شتێكی بە پێی ئەو زانیارییە وەدیهێناوەو، دەڵێ:

١٨) ( خَـلَـقَ الـخَـلْـقَ بِـعِـلْـمِـهِ ):

واتە: خوا ﷻ بە زانیاری خۆی، دروست كراوەكانی دروسـت كـردوە ، (خَلْـق) لێـرەدا چاوگ (مصـدر)ە، بە مانـای بـەركار (مفعـول)، یـانی: (خلـق المخلوقـات)، یـان (خلـق المخلوق)ە، خوا دروست كراوەكانی دروست كردوە، (بعلمه). لێرەدا (منصوب)ە بە (حال) یانی: (حال كونه عالما بهم) لە حاڵێكدا كە خوا پێیان زانا بووە كە دروستی كردوون، دواتر ئەو مەسەلەیە زیاتر ڕوون دەكاتەوە، بۆیە لێرەدا زۆری لەسـەر ناوەسـتین، دیـارە خـوای پەروەردگار، هەر شتێكی خوڵقاندوە، زانیاری پێی هەبووەو لە ڕووی زانیارییەكـەوەو لـە ڕووی نەخشەو بەرنامەیەكەوە، ئەو دروستكراوانەی خوڵقاندوە.

لە خاڵی (١٩)دا باسی ئەندازەگیریی (تقدیر)ی خوا دەكاتو دەڵێ:

١٩) ( وَقَــــدَّرَ لَــهُــــمْ أَقْــــدَارًا ):

واتە: ئەندازەگیریی بۆ كردوون بە ئەندازەگیریی، یانی: بۆ هەر شتێك ئەندازەگیرییەكی كردوە، ئەندازەو چۆنییەتییو چەندێتیی بۆ بڕیارداوە.

پاشان باسی (أَجَل)ەكانیان دەكاتو، دەڵێ:

٢٠) ( وَضَــــرَبَ لَــهُــــمْ آجَــــالاً ):

(آجال) كۆی (أَجَلْ)ە، واتە: كاتی شتێك، یان: كاتی دیاریكراو بۆ هاتن، یان كۆتـایی هاتنی شتێك. یانی: بۆ هەر هەموویان كاتێكی دیاریی كردوە كە تێیدا دەمرنو لە بەین دەچن، (أَجَلْ) یانی: ئەو كاتە دیاریی كراوەی كە ئینسان تێیدا دەمرێ، یان ئەو مەخلووقە تێیدا لە بەین دەچێ [1]، (ضَـرَبَ لَهُـمْ) لێرەدا یانی: (عيَّـنَ لَهُـمْ) بۆی دیاریی كـردوون، ئەو كاتانەی بۆ دیاریی كردوون كە تێیدا لە بەین دەچن، لە خاڵەكانی دواییدا زیاتر ئـەو مـەسەلەیە ڕوون دەكاتەوە.

لەخاڵی (٢١)دا ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو ،كە خوا هیچ شتێكی دروستكراوەكانی لـێ شێرراوە نیەو، دەڵێ:

٢١) ( وَلَــمْ يَخْــفَ عَلَيْــهِ شَيْءٌ قَبْــلَ أَنْ يَخْلُــقَــهُــمْ ):

واتە: خوا پێش ئەوەی بیانخولقێنێ، هیچ شتێكی ئەو دروسـتكراوانەی لـێ شـارراوەو پەنهان نەبووە، یانی: پێش ئەوەی منو تۆو غەیری ئێمە بخـولقێنێ، پـێش ئـەوەی هــەر

١) الـمعجم الوسيط، ص٧.

مەخلووقێك بخوڵقێنێ، هیچ شتێكی ئەو مەخلووقەی لێ شاررراوەو پەنهان نەبووە، زانیویەتی كێ دەبێ؟ چی دەكات؟ چۆن دەكات؟ چاكە دەكات؟ خراپە دەكات؟ هەمووی زانیوەو هەمووی لەبەر چاو بووە، (وَعَلِمَ مَا هُمْ عَامِلُونَ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَهُمْ)، زانیویەتی ئەوەی كە دەیكەن، پێش ئەوەی بیانخوڵقێنێ، پێش ئەوەی دروستیان بكات، زانیویەتی چی دەكەنو چۆن دەكەن؟!.

لە خاڵی (٢٢)دا ئەو ڕاستییە دەخاتە ڕوو كە خوای كاربەجێ فەرمانی فەرمانبەریی (طاعـة)و چاكە كردنی بە بەندەكانی كردوەو، خراپەو سەرپێچیشی لێ قەدەغە كردوونو، دەڵێ:

**٢٢) ( وَأَمَرَهُمْ بِطَاعَتِهِ، وَنَهَاهُمْ عَنْ مَعْصِيَتِهِ ):**

واتە: فەرمانی پێكردوون، بە فەرمانبەریی‌و گوێڕایەڵیی خۆی، ڕێگاشی لێگرتوون لە سەرپێچییكردن لە فەرمانەكانی، لێی قەدەغە كردوون، كە لە قسەی دەربچنو فەرمانیشی پێكردوون، كە بە پێی فەرمانی ویو بە فەرمایشتی وی بەڕێوە بچن.

******

## زانیاریی بێ سنووری خـوا

## بەڵگەی دەستەپاچەیی مرۆڤ نیە لە بەرانبەر قەدەردا

طه‌حاویی كه‌ ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌ له‌ چه‌ند خاڵێكدا باس ده‌كات‌و، خاڵه‌كان زۆریان ته‌ئكید كردنه‌وه‌ن، پاساوو هۆكاره‌كه‌ی ئه‌وه‌یه‌ كه‌ موعته‌زیله‌كان (قه‌ده‌رییه‌كان)، به‌شێكیان ڕایان وایه‌، هه‌روه‌ها زۆرێك له‌ فه‌یله‌سووفه‌كان ڕایان وایه‌ كه‌خوا زانیاریی (علم)ی به‌ ورده‌كارییه‌كان (الجزئیات) نیه‌، یانی خوا نازانێ كه‌ من چی ده‌كه‌م‌و چۆن ده‌كه‌م؟ چونكه‌ ئه‌وه‌ شتێكی زۆر بچووكه‌و شایسته‌ی مه‌زنیی خوا نیه‌! ئه‌مه‌ به‌خه‌یاڵی فه‌یله‌سووفه‌كان، موعته‌زیله‌ش بۆ ئه‌وه‌ی به‌ حیسابی خۆیان دیفاع له‌ عه‌داله‌تی خوای دادگه‌ر بكه‌ن، به‌ حیسابی خۆیان، گوتوویانه‌: ئه‌گه‌ر بڵێین: خوا زانیویه‌تی فلاَن كه‌س ئه‌و كرده‌وه‌ خراپه‌ ده‌كات، كه‌واته‌: ئه‌و كه‌سه‌ هیچ به‌ده‌ست خۆی نامێنێته‌وه‌، چونكه‌ مادام خوا زانیویه‌تی، هه‌ر ده‌بێ بیكات، ئه‌گه‌ر نه‌یكا، زانینی خوا ده‌بێته‌وه‌ به‌نه‌زانیی (جهل)، ئه‌وه‌ش نابێ! بەڵێ، ئه‌وانه‌ی ویستوویانه‌ نكوولْیی له‌ زانیاریی خوای زاناو شاره‌زا بكه‌ن، (زانیاریی به‌ ورده‌كارییه‌كان) له‌به‌ر ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌یه‌، بۆ ئه‌وه‌ی به‌رگریی له‌دادگه‌ریی خوای كاربه‌جێ بكه‌ن‌و، بۆ ئه‌وه‌ی ئینسان تووشی جه‌برو تۆبزیی لێكردن نه‌بێ، وایانكردوه‌، چونكه‌ كه‌ ئینسان تووشی جه‌بر بوو، خوای به‌رزیش سزای بدات، ده‌كا بێ عه‌داله‌تیی!

### ئایا ئه‌هلی سوننه‌ت و جه‌ماعه‌ت ده‌ڵێن چی ؟!

ده‌ڵێین: ئێوه‌ بێ سه‌روبه‌ری لێ حاڵی بوون! ئه‌وه‌ كه‌خوای زاناو شاره‌زا زانیویه‌تی من چاكه‌ ده‌كه‌م، ئه‌وی دیكه‌ خراپه‌ی ده‌كات، عه‌مر به‌شێوه‌یه‌ك به‌ڕێوه‌ده‌چێ كه‌ خوا لێی ڕازی بێ، زه‌ید به‌ شێوه‌یه‌ك به‌ڕێوه‌ده‌چێ كه‌ خوا لێی بره‌نجێ، ئه‌و زانینه‌ی خوا نابێته‌ هۆی ئه‌وه‌ كه‌ ئینسان جه‌بری لێ بكرێ‌و تۆبزیكاریی لێ بكرێ، بۆچی؟ له‌به‌ر یه‌ك وشه‌، چاكی لێ وردبنه‌وه‌! خوا زانیویه‌تی كه‌: من، تۆ، هه‌ر ئینسانێكی دیكه‌، چاكه‌، یان خراپه‌ ده‌كه‌ین، به‌ڵام (به‌ ویستی خۆمان) وه‌ (به‌ هه‌ڵبژاردنی خۆمان).

ئەو وشەیە كە ئەگەر موعتەزیلەكان بەكاریان هێناباو ئاگایان لێبایە، ناچاری ئەوە نەدەبوون، جارێك بڵێن: ئینسان دروستكەری كاری خۆیەتیو كردەوەكانی خۆی بۆ خۆی دەخوڵقێنیو، خوا هەقی نیە، جارێكیش بڵێن: خوا عیلمی بە وردەكارییەكان نیەو ئینسانەكان بۆخۆیان كردەوەی خۆیان دروست دەكەنو، خوا هەر نەشیزانیوە! بۆ ئەوەی دیفاع لە عەدالەتی خوا بكەن!! بەلاَم نەء، خوا لە ئەزەلەوە زانیویەتی من چی دەكەم؟ تۆ چی دەكەی؟ ئەو چۆن دەكات؟ باش، یان خراپ؟ بەلاَم زانیویەتی كە ئێمە بە ئیختیارو هەڵبژاردنو ویستی خۆمان ئەوە دەكەین، ئەو هەڵبژاردنو ویستەش، هەر لە ژێر حوكم و لەژێر ركێفی ویستی گشتگیری خوا دایە، وەك خوا تبارك و تعالى دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ... ﴿٣٠﴾﴾ الإنسان، بەلاَم لەو لاشەوە تەماشا دەكەین، خوا ویست (مشیئة)ێكی بۆ ئێمە بڕیارداوە: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ﴾، ئێوە ناتانەوێو ناتوانن بتانەوێ، مەگەر خوا بیەوێ كە بتانەوێ. كەواتە: خوا ویستێكی بۆ ئێمە بڕیارداوە، ﴿... فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ... ﴿٢٩﴾﴾ الكهف. كەواتە: من دەتوانم ئیمان بێنم، بەلاَم بەویستی خوا دەتوانم ئیمان بێنم، تۆی مرۆڤ دەتوانی مەشیئەتت بەرەو ئیمان بچیو بەویستەكەت ئیمان هەڵبژێری، ﴿...وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ﴾، دەشتوانی كوفر هەڵبژێری، خوای پەروەردگار بۆ ئێمەی ڕوون كردۆتەوە كە ئێمە دەتوانین كوفر هەڵبژێرین، یان ئیمان هەڵبژێرین، بەلاَم ئەو هەڵبژاردنەی ئێمە، لە ژێر چەتری ویستی خوا دەرناچێ، یانی خوا ویستوویەتی كە من بمەوێ، خوا ویستوویەتی كە من توانای هەڵبژاردنم هەبێ، بەلاَم هەڵبژاردنەكە بە دەست خۆمە، دەتوانین وێنەیەك بهێنینەوە بۆ مەسەلەی قەزاو قەدەریش وەك لە ئەڵقەی چوارەمی زنجیرەی: (با چاكتر ئیسلام بناسین!)دا[1] ئەو وێنەیەم هێناوەتەوە:

---

١) ئەو كتێبە دوایی خرایە نێو بەرگی پێنجەمی كتێبی: ( ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی )یەوە كە

کورسییەکی کارەبایی بێننە بەرچاوی خۆتان، پلاکەکەی بە دەست ئینسانێکەوە بێ، بڵێ: هەر کەسێك بچێتە سەر ئەو کورسیە، من پلاکەکەی بۆ دادەگیرسێنم‌و سووکان بە دەست خۆیەتی، دەتوانێ پێی بچێتە بارێك‌و شەڕاب بخواتەوەو قومار بکاو خراپە بکات، دەشتوانێ پێی بچێتە مزگەوت‌و خوا پەرستیی بکات، دەتوانێ پێی بچێتە مەیدانی خەبات‌و جیهادو بەرگریی لە دینی خوای بەرزو مەزن‌و، لە مەزڵوومان بکات، بەس پلاکەکەی بەدەستی منەوەیە، من بۆی پێدەکەم‌و کارەبای بۆ دەخەمە سەرو، کورسیەکە بۆخۆی حەرەکە دەکات، بەڵام سووکانەکەی بەدەست ئەو ئینسانەیە کە سواری کورسیەکە دەبێ، ئایا لێرەدا چ سووچ‌و بەرپرسیارێتییەك دەکەوێتە ئەستۆی ئەو کەسەی پلاکەکەی بە دەستە؟ بێگومان هیچ، ، چونکە تۆ بۆ خۆت سووکانەکە بە دەست خۆتە، دەتوانی بۆ هەر کام لا بتەوێ بڕۆی، قەزاو قەدەریش ئاوایە!

بەڵێ، خوای گەورە منی خولقاندوەو، ئەو دنیایەی بۆ خولقاندووم‌و، هەرچی پێداویستی ژیان هەیە بۆی دابین کردووم، ئەندامەکانی بۆ خولقاندووم کە دەتوانم چاکەیان پێ بکەم، خراپەیان پێ بکەم، ئەوەتا ئینسان بۆ خۆی دیارە، ڕۆژی وا هەیە چاکە دەکات‌و، ڕۆژی وا هەیە خراپە دەکات، هەردووك لای هەر بە دەست خۆتە، بەڵێ، خوا هەموو شتەکانی بۆ تۆ خولقاندوون‌و، بە ویستی خوا ئەو هۆکارو ئامرازو ئەندامانە بە تۆ دراون کە چاکەو خراپەیان پێ دەکرێ، بەویستی خوا ئەو هەڵبژاردن‌و ویستە بە تۆ دراوە کە دەتوانی بەرەو شەڕ پێی بڕۆی، یان بەرەو خێر پێی بڕۆی.

کەواتە: خوا لە ئەزەلەوە زانیویەتی کە من چی دەکەم، بەڵام زانیویەتی بە ویستی خۆم ئەو شتە دەکەم، هەر بۆیەشە لە کاتێکدا ئینسان ویست‌و خواستی نەبێ، نەپاداشتی دەدرێتەوە، نەسزای دەدرێ، وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: {إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ} حديث صحيح[1].

---

بۆ (ئیمان بە ڕۆژی دوایی‌و ئیمان بە قەزاو قەدەر) تەرخان کراوە.

١) رَوَاهُ إِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٢١٩)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط البخاري، وَابْنُ مَاجَه برقم: (٢٠٤٥) قال الشيخ الألباني: صحيح، عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ.

واتە: بێگومان خوا لەسەر ئوممەتەکەمی لابردوە، سزای هەر شتێك کە بە هەڵەو، بە لە بیرچوونەوەو، بەتۆبزیی لێکردن دەیکەن.

کەسێك بە تۆبزیی شەرابی پێ بخۆنەوە، بەتۆبزییەکی جیددیی وا کە ئەگەر نەیخواتەوە، بیکوژن، ئەوە ئەگەر بیخواتەوە گوناهبار نابێ بۆچی؟ چونکە لەو کاتەدا ویستو هەڵبژاردنی نیە. کەواتە: لەسەر ویستو هەڵبژاردنەکەیە کە ئێمە لێمان دەپرسرێتەوە، هەروەها بە پێی ویستو هەڵبژاردنەکەشە کە پاداشتمان دەدرێتەوە، کەسێك بە تۆبزیی بچن نوێژی پێ بکەن، پاداشتی نادرێتەوە، بەتۆبزیی ڕۆژووی پێ بگرن، پاداشتی نادرێتەوە، چونکە ویستی نەبووە.

دیارە مەسەلەی قەزاو قەدەر، نووسەر لە چەند شوێنی دیکەش دێتەوە سەری،

ئنجا دەڵێ: (وَأَمَرَهُمْ بِطَاعَتِهِ، وَنَهَاهُمْ عَنْ مَعْصِيَتِهِ)، لێرەدا (طحاوي) ڕەحمەتی خوای لێبێ مەبەستی هەیە کە دەڵێ: خوا فەرمانی پێکردوون کە گوێڕایەڵیی بکەنو فەرمانبەریی بکەن، لێشی قەدەغە کردوون کە سەرپێچیی بکەن، یانی چی؟

یانی: بەڵێ، خوا لە ئەزەلەوە دەزانێ تۆ چی دەکەی! بەڵام بۆی دیاریی کردووی کەچی پێخۆشە، خوای بەبەزەیی بۆی دیاریی کردووی کە حەز بەچی دەکاو چی پێخۆشە، بۆشی دیاری کردووی کە چی پێناخۆشە. کەواتە: تۆ نازانی خوا چی بۆتۆ ویستوەو، نازانی خوا چی بۆتۆ بڕیار داوە،نازانی خوا چی دەربارەی تۆ زانیوە، بەڵام دەزانی خوا چی لەتۆ ویستوەو، دەزانی خوای کاربەجێ چ فەرمانێکی بەتۆ کردوەو بەچی لەتۆ ڕازی دەبێ، نازانی خوای بەرزو مەزن چی دەربارەی تۆ زانیوە، بەڵام دەزانی چی لەتۆ داواکردوە، جا تۆ ئەوەی داوای لێکردووی بیکە، دوایی بۆت دەردەکەوێ کە هەر ئەوەشی لەبارەی تۆوە زانیوە، تۆ چاکە بکە، بۆت دەردەکەوێ، خوای بەبەزەیی هەر چاکەی لە تۆ زانیوە لە ئەزەلەوە، یانی تۆ بە هۆی هەڵبژاردنەکەی خۆتو کردەوەکانی خۆتەوە، بۆت دەردەکەوێ کە خوا چی دەربارەی تۆ زانیوە؟ چی لە تۆ ویستوە؟ تۆ وەرە هەر چاکە بکە، مانای وایە بۆت دەردەکەوێ. کە خوا هەر چاکەی دەربارەی تۆ زانیوە، بەڵام هەر

خراپە بکەی، بۆت دەردەکەوێ کە خوا هەر خراپەی دەربارەی تۆ زانیوە کە بەویستو هەڵبژاردنی خۆشت دەیکەی.

پاشان لە خاڵی (٢٣)دا دێتە سەر ئەسڵی مەبەستی قەدەرو دەڵێ:

**٢٣) (وَكُلُّ شَيْءٍ يَجْرِي بِتَقْدِيرِهِ وَمَشِيئَتِهِ، وَمَشِيئَتُهُ تَنْفُذُ، لا مَشِيئَةَ لِلْعِبَادِ، إلاَّ مَا شَاءَ لَهُمْ، فَمَا شَاءَ لَهُمْ كَانَ، وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ):**

واتە: هەموو شتێك بە ئەندازە گیرییکردنو بە ویستی خوا بەڕێوەدەچێ، هەر ویستی خواش جێبەجێ دەبێ، بەندەکان ویستو ئیرادەیان نیە، مەگەر ئەوەی خوا بۆی ویستبێ، (یانی: خوا ویستوویەتی کە تۆ ویستت هەبێ، بۆیە ویستت هەیەو توانای هەڵبژاردنت هەیە) (فَمَا شَاءَ لَهُمْ كَانَ) ئەوەی کەخوا بۆ ئەوانی ویستبێ، دەبێ (بەڵام بەویستی خۆیان دەبێ) (وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ)، ئەوەی کە خوا بۆ ئەوانی نەویستبێ، نابێ، (بەڵام بە ویستی خۆیان نابێ).

لێرەدا یەکێ بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی خوای زاناو توانا، لە سوورەتی (الأنعام)دا، ڕەخنە لەهاوبەش پەرستەکان دەگرێ ، وەك دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ... ١٤٨ ﴾الأنعام، هاوبەشدانەران گوتیان: ئەگەر خوا ویستبای، ئێمەو بابو باپیرمان، هاوبەشمان بۆ خوا بڕیار نەدەدا و هیچ شتێکیشمان قەدەغە نەدەکرد، (واتە: ئەو شتانەی حەڵاڵن، حەرامان نەدەکردن) خوای پەروەردگار دەفەرموێ چی؟ دەفەرموێ: ﴿ ... كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ...

﴿١٤٨﴾ الأنعام، واتە: هەر ئاوا، ئەوانەی پێش ئەوانیش درۆیان پاڵدایە لای خواو دینی خوا، ﴿... قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا... ﴿١٤٨﴾﴾ الأنعام، بڵێ: ئایا هیچ زانیارییتان لەبەر دەست دایە، بۆمانی بێننە دەرێ، ﴿...إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾﴾ الأنعام، ئێوە بەس بە دوای گومان کەوتوونو، بەس درۆ دەکەن، ﴿ قُلْ فَلِلَّهِ الْحُجَّةُ الْبَالِغَةُ فَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾﴾ الأنعام، واتە: بڵێ: خوا بەڵگەی زاڵی لەسەر ئێوە هەیە، ئەگەر ویستبای هەمووتانی هیدایەت دەدا، یەکێ بۆی هەیە بڵێ: بۆ خوا ڕەخنە لە موشریکەکان دەگرێ، دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای، ئێمە هاوبەشدانەر نەدەبووین، ئەدی ئێوە ناڵێن: هەر شتێك خوا نەیەوێ نابێ؟

ئەوە نیە موشریکەکانیش هەروا دەڵێن، دەڵێن: خوا ویستوویەتی ئێمە موشریك بین بۆیە موشریکین، لە وەڵامدا دەڵێین: خوای پەروەردگار بۆیە لێرەدا ڕەخنە لەوان دەگرێ، چونکە ئەوان ویستوویانە بڵێن: خوا ویستوویەتی کە ئێمە موشریك بینو پێشی خۆشبووە، ویستوویانە ڕەزامەندیی خواو ویستی خوا تێك ببەستن، بەڵام وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە: ویستی خواو ڕەزامەندیی خوا، تێك نەبەستراون، (خلق)ی خواو (أمر)ی خوا تێك نەبەستراون، جاری وا هەیە خوا شتێك دەخوڵقێنێ، بەڵام مەرج نیە ڕەزامەندیی لەسەربێ، شەیتانی خوڵقاندوە، بەڵام لە کردەوەکانی ڕازی نیە، ویستی خواو ڕەزامەندیی خوا تێك نەبەستراون، خوا قەتڵ لەسەر دەستی ئینسانێك دێنێتەدی، بەڵام بە قەتل ڕازی نیە، بە کورتیی: هەرچی گوناهە بە ویستی وی دێتە دی، بەڵام لێی ڕازی نیە، ئنجا موشریکەکان لێرەدا ویستوویانە بڵێن: مادام ئێمە موشریکین، دیارە بە ویستو خواستی خوایەو ڕەزامەندیی خواشی لەسەرە، خواش دەفەرموێ: نەخێر، بەڵێ، بە ویستی منە، بەڵام ڕەزامەندیی منی لەسەر نیەو لێی ڕازی نیمە، بۆچی؟ ، چونکە خوای پەروەردگار پێی فەرموون: موشریك مەبن، شەریك بۆ خوا بڕیار مەدەن کەواتە: بەڵێ، بەویستی منەو بۆ

خۆشتان هەڵتانبژاردوە، بەڵام من لێی ناڕازیم، چونكە ئەوەتا لە كتێبی خۆمدا بۆم ڕوون كردوونەتەوە كە من بە شیرك ڕازی نیمو فەرمانم لەسەر شیرك نیە، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ ... وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ... ﴿٧﴾ ﴾الزمر، خوا ڕازی نیە كە بەندەكانی كوفر بكەن، هەروەها شەیتان كە ڕەخنە لە خوای بەرزو مەزن دەگرێ، وەك خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) بۆمان باس دەكات، لەسەر زمانی شەیتان: ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى ... ﴿٣٩﴾ ﴾الحجر، گوتی: خوایە! چونكە تۆ منت گومڕا كرد، لێرەدا خوای دادگەر وەك زەم دەیگێڕێتەوە كە شەیتان ئیغرا بوونو سەر لێشێواویی خۆی پاڵدەداتە لای خوای كاربەجێ كەچی لە شوێنی دیكە، خوای زانا لەسەر زمانی پێغەمبەر نووح (علیه السلام)، دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ هود. واتە: دڵسۆزیی من، سوود بە ئێوە ناگەیەنێ، ئەگەر ویستم دڵسۆزییتان بۆ بكەم، ئەگەر خوا بیەوێ گومڕاتان بكات، لێرەش پێغەمبەر نوح (علیه السلام)، گومڕاكردنەكە پاڵ دەداتەلای خوا، بەڵام خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) وەك مەدح دەیگێڕێتەوە كەچی لە ئایەتەكەی دیكەدا كە شەیتان گومڕابوونی خۆی دەداتە پاڵ خوای پەروەردگار، وەك زەم دەیگێڕێتەوە، ئەوە یانی چی؟ شەیتان دەیەوێ بڵێ: چونكە تۆ منت گومڕا كردوە، دیارە گومڕا بوونت پێخۆشەو لێشی ڕازی بووی، بۆیە خوای بێ وێنە ڕەخنەی لێ دەگرێ، بەڵام نووح (علیه السلام)، تەنیا مەبەستی ئاماژە كردن بووە بە ڕەهایی كەواتە: بەڵێ، چاكەو خراپە هەمووی بە ویستی خوایە، بەڵام خوا لەگەڵ چاكە دایەو، دژی خراپەیەو، خوا لە چاكە ڕازییەو، خراپەشی پێناخۆشە.

ئنجا لەخاڵی (٢٤)دا ڕاستییەك دەخاتە ڕوو كە شێوازی دەربڕینەكەی كاردانەوە (ردّ فعل)ی موعتەزیلەی پێوە دیارەو، لە ئەنجامدا - بەڕای من - لە ڕای جەبرییەكان نێزیك كەوتۆتەوە، وەك گوتوویەتی:

**٢٤) (يَـهْدِي مَنْ يَشَـاءُ، وَيَـعْـصِمُ وَيُـعَـافِي فَضْـلاً، وَيُـضِـلُّ مَنْ يَشَـاءُ، وَيَخْـذُلُ وَيَـبْتَـلِي عَـدْلاً):**

واتە: خوا هەر کەسێکی بیەوێ، دەیخاتە سەر ڕێی ڕاست، (وَيَعْصِمُ وَيُعَافِي فَضْلاً) خوا لە چاکەی خۆیەوە (هەرکەسێکی بوێ) لە گوناحو خراپە دەیپارێزێو سەلامەتی دەکات. (وَيُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ) خوا هەر کەسی بیەوێ، گومڕای دەکاتو ونی دەکات لە هەق، (وَيَخْذُلُ وَيَبْتَلِي)، زەبوون دەکاو گرفتار دەکات، بە گوناهان بەدادگەریی خۆی.

ئنجا دێتە سەر خاڵی (٢٥) کە هەر تەواوکەری خاڵی پێشوویەو، دەڵێ:

**٢٥) (وَكُـلُّـهُـمْ يَـتَـقَـلَّبُونَ فِـي مَـشِيـئَـتِهِ، بَـيْـنَ فَـضْـلِـهِ وَعَـدْلِـهِ):**

واتە: هەر هەموو بەندەکان (چاکەکانو خراپەکان) لە ویستی خوادا دێنو دەچن، (لە ژێر ڕکێفی حوکمی ئیرادەی زاڵی خوادا دێنو دەچن) لە نێوان چاکەو لوتفی (خوا) و، دادگەرییەکەیدا.

کەواتە: خوا ئەوەی کە هیدایەتی دەدا، بە فەزڵو لوتفو چاکەی خۆیەتی، وە ئەوەی کە گومڕاشی دەکاتو خراپەی لەسەر دەست ئیجرا دەکات، ئەویش بە دادگەریی خۆی، وای بەسەر دێنێ.

## ڕەواندنەوەی تەم و مژی ئیشکالێک

هەندێ کەس ئیشکالیان بۆ پەیدا بووە لەو خاڵەدا کە نووسەر دەڵێ: (يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ، وَيَعْصِمُ وَيُعَافِي فَضْلاً، وَيُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ، وَيَخْذُلُ وَيَبْتَلِي عَدْلاً) کە پێشتر مانامان کرد، بەڵام پێویستە بزانرێ کە مەبەست لە (يَهدي) لێرەدا یانی: هەر کەسێکی کە بیەوێ بە

مەنزڵی دەگەیەنێ، چونکە هەرچەندە لە ئەسڵدا (هدایة) بەمانای ڕێ پیشاندانو ڕێ ڕوونییکردنو ڕێنمایییکردنە، بەڵام ئەوە مانای گشتیی (عام)یەتیو،مانایەکی تایبەت (خاص)یش هەیە کە بریتیە لەوەی خوا دەستی مرۆڤ بگرێو بە مەنزڵی بگەیەنێ.

لێرەدا نووسەر مەبەستی لەو جۆرە هیدایەتەیە، وەك خوای بەخشەر لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ﴾، واتە: ئەلیف، لام، میم، ئەو کتێبە هیچ گومانی تێدا نیە، ڕێنمایییە بۆ پارێزکاران. لێرەدا تەماشا دەکەین، خوا ڕێنمایی قورئان تایبەت دەکات بە پارێزکاران (متقین)ەوە، وەك بڵێی تەنیا بۆ ئەوان هاتبێ!

ئنجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی لە شوێنی دیکە خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ۝٢٧ ﴾التكویر، واتە: قورئان تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، ئەدی بۆچی لەوێ تایبەتی کردوە بە ئەهلی تەقواوە، ئایا تەنیا بۆ وان هیدایەتو ڕێپیشاندانە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: هیدایەت دوو هیدایەتە:

١) هیدایەتێکی گشتیی (عام): کە قورئان بۆ هەموو کەس هیدایەتێکی گشتییە، قورئان زیکرو هیدایەتو بەرنامەیە بۆ هەموو خەڵکی، بەڵام ئەو هیدایەتە گشتییەی هەموو کەس تێیدا بەشدارە، یانی: ڕێ پیشادانو بەرچاو ڕوونیی.

٢) هیدایەتێکی تایبەت (خاص): هیدایەت بە مانای تایبەت ئەوەیە کەسێك بگەیەنیە مەنزڵ، ئنجا ئایا کێن بەو شێوەیە لە قورئان بەهرەمەند دەبنو بۆیان دەبێتە هیدایەت؟ ئەوانەن کە ئەهلی تەقوان.

بۆ وێنە: کابرایەك لێت دەپرسێ: (قەڵادزێ) لە کوێیە؟ دەتوانی لێرەوە پێشانی بدەیو بڵێی: ئەو جادە بگرە دەیگەیتێ، یان لە فلاَن شوێن و فلاَن شوێنەوە دەڕۆی، بۆی وەسف دەکەی، ئەوە ڕێنمایییەکی گشتییە، دەشتوانی دەستی بگریو لەگەڵ خۆت سواری

سەیارەی بکەی‌و بیبەی، تا دەگەیە نێو (قەلاّدزێ)و بلێی: ئەمە قەلاّدزێیە! دیارە ئەوەی دووەمیشیان هەر ڕێ پیشاندانە، بەڵام ڕێ پیشاندانێکی تایبەتی، ئنجا قورئانیش هیدایەتە بە گشتیی بۆ خەڵکی، ڕێ پیشانی خەڵکی دەدات،کە ئاوا بکەن‌و ئاوا مەکەن، ئەوە چاکەو ئەوە خراپە، بەڵام ئەوانەی بە شێوەیەکی تایبەتی لە قورئان بەهرەمەند دەبن‌و پێی دەگەنە مەنزڵ‌و هەواری سەرفرازیی، ئەوانەن کە پارێزکارن.

ئنجا لێرەدا نووسەر کە دەڵێ: (يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ)، هەرکەسێ بیەوێ هیدایەتی دەدا، مەبەست هیدایەتی تایبەتییە، ئەگەرنا، خوا هیدایەتی هەموو خەڵکی داوە، بە مانای گشتیی، قورئانی بۆ هەموو کەس ناردوە، بەڵام بە مانای تایبەتی،خوا هیدایەتی کێ دەدات بە تایبەتی؟ ئەوەی کە بیەوێ، کە دیارە ئەوەش بەگۆترەکاریی نیە، وەك دوایی باسی دەکەین.

ئنجا دەڵێ: (وَيَعْصِمُ وَيُعَافِي) ئەو کەسانە کە هیدایەتیان دەدات، دەیانپارێزێ‌و سەلامەتیان دەکات لە گوناح‌و خراپە، بەڵام بەچی؟؟ (فَضْلاً)، یانی: (لُطْفَاً)، بە فەزڵ‌و لوتف و بەخشش‌و کەرەمی خۆی‌و، لە چاکەی خۆیەوە هەر کەسێکی بیەوێ هیدایەتێکی تایبەتی دەداو، دەشیپارێزێ لە گوناهو تاوان‌و خراپە، ئنجا کەم یان زۆر، (وَيُضِلُّ مَنْ يَشَاءُ)، هەر کەسێکیشی بوێ، ونی دەکاو ڕێی لێ تێکدەدات، (وَيَخْذُلُ وَيَبْتَلِي عَدْلاً)، سەرشۆڕیی دەکات (بەهۆی گوناح‌و خراپەکانییەوە)و تووشی بەڵای دەکات، بەڵام چۆن‌و بۆچی؟ (عَدْلاً)، ئەویش لە ڕووی دادگەریی خۆیەوە، نەوەك لە ڕووی ستەم‌و بێدادییەوە (ظُلْمَاً وَجَورَاً)، ئنجا لێرەدا هەندێك کەس ئیشکالیان هاتۆتە پێشێ کە ئەوە چۆن وایە؟ لەوەڵام دا دەڵێین: مەسەلەیەکی کوردی هەیە کە پیرەمێردی شاعیر کردوویەتی بەشیعردەڵێ:

کاکە خوا کاری نابەجێ ناکا       تا کێو نەبینێ بەفری تێناکا

خوا هیدایەتی كەسێك دەدات بە شێوەیەكی تایبەتی كە شایستەی ئـەوەبێ، چـونكە خوا كارزانو كاربەجێیە (حكیم)ە، وەخوا كەسـێك زەبـوونو سەرشـۆڕ دەكـات، بـەهۆی گوناهانەوە كە ئەوە هەڵبگرێت، خۆ خوای دادگەر، شتی بێ جێ ناكات، بەڵكو بەپێی ئەو شیاویی‌و ئامادەییە كە ئەو ئینسانانە هەیانە، هیدایەتی خوا، یان سەر لێ تێكدانی خوا، ڕوویان تێدەكات! دەتوانین لەو بارەوە وێنەیەك بهێنینەوە:

باران كە دەبارێت، یەك جۆرە بارانە، بەڵام بەسەر چەندان جۆرە زەوی دادەبارێ: ئنجا زەوی وا هەیە گوڵو گوڵاڵەی لێ دەڕوێ، زەوی واش هەیە، هەر بەو بارانە دڕكو داڵی لێ دەڕوێ، هەر یەك بارانە، بەڵام سروشتی زەوییەكان گۆڕانكاریی دەكات لەوەدا كـە چـۆن كارلێك (تفاعل) لەگەڵ بارانەكەدا دەكاتو چی بەو ئاوە دەكات؟ هیدایەتی خواش یـەك هیدایەتە، بەڵام ئەوكەسەی كە بەسینەیەكی فراوانەوەو بە تەسلیم بوونـەوەو بـە دڵێكـی خاوێنەوەو بە متمانە بە خوا كردنەوە وەری بگرێ، دیارە ئەوە نەمامی گەردن كەچـیی‌و چاكەكاریی لە زەوی دڵو مێشكیدا دەڕوێو، دەبێتە باخێكی پڕ بەرو بووم، بەڵام كەسێك كە بەسەرەخەریی‌و نەسەلماندنو كەللە ڕەقیـی‌و خۆبـەزلگریی لەگـەڵ هیدایـەتی خـوادا ڕووبەڕوو بێتەوە، هەر یەك هیدایەتە، بەڵام پێی تووشـی بەدبـەختیی دەبـێ، وەك خـوا دەفەرموێ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ ﴾ الإسراء، واتە: ئەوەی لە قوڕئان دەینێرینە خوارێ، شیفایەو بەزەیی خوایە بۆ ئیمانداران، بەڵام ستەمكاران (یانی: هاوبەشدانەرو كافرەكان، چونكـــە گەورەترین زوڵم بریتیە لە كوفرو هاوبەش بۆ خوا بڕیـاردان)[1]، هەر زیاتر پێـــی تووشـــی زیانباریی دەبن، خـــوا دەفـــەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا

---

١) خوا فەرموویەتی: ﴿ ...وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ﴾ البقرة، وە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾ لقمان.

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ١٢٤ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ١٢٥﴾ التوبة، واتە: ئەو ئایەتانە كە دێنە خوار بۆ ئیمانداران، ئیمانیان پێی زیاد دەكات، بەڵام بۆ دڵنەخۆش‌و خراپەكاران، هەر زیاتر خراپەو تاوانیان پێ زیاد دەكات، بۆچی؟ چونكە بە لووت بەرزیی‌و خۆ بەزلگرییەوە، لەگەڵ ئایەتەكان ڕووبەڕوودەبنەوەو، ئەوەش دەبێتە هۆی زیاتر گوناهبار بوون‌و زیاتر بەدبەخت بوونیان.

كەواتە: نهێنیی مەسەلەكە لوتف‌و بەخششی خوایە، بۆ كەسێك كە شایستەی لوتف‌و بەخشش بێ، وەدادگەریی خوایە بۆ كەسێك شایستەی دادگەریی بێ، بۆیەش بەندە صاڵحەكان بەردەوام لە خوا دەپاڕێنەوە، دەڵێن: خوایە! بە لوتف‌و بەخششی خۆت لەگەڵمان بكە، نەك بە دادگەریی خۆت، چونكە ئەگەر بە دادگەریی خۆت لەگەڵمان مامەڵە بكەی، ئێمە زۆر خراپین، بەڵام خوایە! بە لوتف‌و بەخششی خۆت، یان خوایە! بە چاكەی خۆت لەگەڵمان ڕەفتار بكە، نەك بە خراپەی خۆمان، تەنانەت پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، هەر دڵی بە ڕەحمەت‌و لوطف و بەخششی خوا خۆشبووە، وەك: (أبو سعيد الخدري) خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: {لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ أَحَدٌ إِلاَّ بِرَحْمَةِ اللهِ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ وَلاَ أَنْتَ؟! قَالَ: وَلاَ أَنَا إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللهُ بِرَحْمَتِهِ} حديث صحيح[1].

واتە: هیچ كەسێك (بە كردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشت)، مەگەر بە ڕەحمەت‌و بەزەیی خوا، گوتمان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)؟ فەرمووی: بەڵێ، منیش، مەگەر خوا بە ڕەحمەتی خۆی دامپۆشێ، (دەنا كردەوەكانی منیش بایی ئەوە ناكەن پێیان بچمە بەهەشت).

ئنجا لێرەدا نووسەر كە ئەوەی گوتوە، ئەوە بەرپەرچ دانەوەی قسەیەكی هەڵەی

١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١١٥٠٤)، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

موعتەزیلەیە، كە قسەیەكیان هەیە دەڵێن: لەسەر خوا پێویستە چ شتێك بۆ بەندەكەی چاكتر (أصلح)ە، ئەوەی بۆ بكات: (وجوب الأصلح على الله للعبد)، ئەوە بنچینەیەكی موعتەزیلەكانە، نووسەریش لێرەدا بەرپەرچی ئەوە دەداتەوە كە نەخێر وانیە، خوا هیچ شتێكی لەسەر واجب نیە، مەگەر ئەوەی بۆ خۆی لەسەر خۆی واجب كردبێ، لەڕووی بەزەیی خۆیەوە، ئەگەرنا، هیچ كەس هەقی بەسەر خواوە نیە، تاكو خوا شتی بەسەرەوە واجب بێ، ئێمە هەمووی بەندەی خواین‌و ئاتاجی خواین، دەبێ چ مافێكمان بەسەر خواوە هەبێ؟ بەڵام ئەوەی خوا بۆ خۆی لەسەر خۆی كردوویەتە هەق، ئەوە شتێكی دیكەیە، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتوە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە (معاذ)ی فەرموو: {«يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ» ! قُلْتُ لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ، ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: «يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ»، قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللهِ عَلَى الْعِبَادِ»؟ قَالَ: قُلْتُ اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «فَإِنَّ حَقَّ اللهِ عَلَى الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا»، ثُمَّ سَارَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: «يَا مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ»، قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ»، قَالَ: قُلْتُ اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «أَنْ لاَ يُعَذِّبَهُمْ»} حديث صحيح.[1]

واتە: ئەی موعازی كوڕی جەبەل! گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! لە خزمەتت دام‌و بۆ هەرچی مایەی خۆشحاڵییت بێ ئامادەم. ئنجا ماوەیەك ڕۆیشت‌و دوایی فەرمووی: ئەی موعازی كوڕی جەبەل! گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! لە خزمەتت دام‌و بۆ خۆشحاڵییت ئامادەم، فەرمووی: دەزانی حەقی خوا لەسەر بەندەكانی چییە؟ گوتم: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: مافی خوا لەسەر بەندەكانی ئەوەیە كە بیپەرستن‌و هاوبەشی بۆ پەیدا نەكەن، ئنجا ماوەیەك ڕۆیشت‌و فەرمووی: ئەی موعازی كوڕی جەبەل! گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! لە خزمەتت دام‌و بۆ هەرچی مایەی خۆشحاڵییت بێ ئامادەم، فەرمووی: دەزانی حەقی بەندەكان بەسەر خواوە چییە، ئەگەر ئەوەیان كرد؟ گوتم: خواو

---

١) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٩١٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٢).

پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: ئەوەیە کە خواش بیانباتە بەهەشتو ئازارو سزایان نەدات. دیارە ئەوە هەقێکە خوا لەسەر خۆی واجب کردوە، ئەگەرنا کەس هەقی بەسەر خواوە نیە.

ئنجا سەبارەت بەو مەسەلەیە موناقەشەیەك بووە لە نێوان ئەبو حەسەنی ئەشعەرییو[1] یەکێ لە سەرکردەی موعتەزیلەکاندا: کە ئەمە کورتەکەیەتی:

ئەبو حەسەنی ئەشعەریی دەڵێ: ئایا ئێوە پێتان وایە کە لەسەر خوا واجبە چ شتێك بۆ عەبدەکەی چاکە، ئەوەی بۆ بکا؟

دەڵێ: بەڵێ.

دەڵێ: من دەڵێم وانیەو، باقسەی تێدا بکەین:

ئەبو حەسەن دەڵێ: باشە بابێك سێ کوڕی هەن، یەکێکیان بە کافریی دەمرێ، گەورە دەبێ و کافر دەبێو دەمرێ، دووەمیان، بە منداڵیی دەمرێ، سێیەمیان گەورە دەبێو مسوڵمان دەبێ و بە مسوڵمانیی دەمرێ، ئنجا ئەگەر منداڵەکەیان بە خوای پەروەردگار بڵێ: خوایە! بۆچی نەتدەهێشت منیش گەورە ببمو ببمە مسوڵمانو کردەوەی چاك بکەمو جیهاد بکەمو نوێژ بکەمو ڕۆژوو بگرم، بۆچی بە منداڵی مراندمت؟ خۆ بە منداڵییش هەر لە بەهەشتم، بەڵام ئەگەر گەورە ببوومایەو خزمەتێکم بە ئیسلام کردبایە، پاداشتم زیاتر دەبوو؟ ئایا خوا وەڵامی ئەو منداڵە چۆن دەداتەوە، بەگوێرەی بنچینەی (وجوب الأصلح للعبد على الله) پێویستبوونی باشتر بۆ بەندە لەسەر خوا؟!

کابرای موعتەزیلە گوتی: خوای پەروەردگار وەڵامی دەداتەوەو دەفەرموێ: دەمزانی ئەگەر گەورەبووبای دەبوویە کافر، بۆ تۆ وا چاکتر بوو بە منداڵیی بتمرێنم! ئەبو حەسەن گوتی: باشە، ئەوجارە ئەوەی کافریان دێتە قسەو دەڵێ: خوایە! ئەدی بۆچی وەك ئەو

---

١) ئەبوحەسەنی ئەشعەریی پارێزەرێکی زۆر گەورەی عەقیدەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت بووە، بە پێچەوانەی حاڵی بوونی هەندێ کەس، کە دوو سێ کتێبی بچووکیان خوێندۆتەوەو شارەزای مێژووی عەقیدەی ئیسلامیی نین.

منداڵە، بە منداڵیی منیشت نەدەمراند، بۆچی دەتهێشت گەورە ببم‌و بە کافریی بـــمرم؟ ئایا بۆ من وا چاکتر نەبوو کە منیش وەك ئەو منداڵە بە منداڵیی بــمردمایە.

کابرای موعتەزیلە: دۆش داماو زاری بووە تەڵەی تەقیو[1]!!

کەواتە: بە حەقیقەت هیچ شتێك لەسەر خوا واجب نیە، مەگەر ئەوەی خوا لەسەر خۆی واجب کردبێ، لە ڕووی لوتف‌و بەزەیی خۆیەوە، جا لێرەدا نووسەر وەڵامــی ئــەو قســەیە دەداتەوە.

شــایانی باسیشــە کــە ئێمــە لــە هــەرکام لــە بــەرگی (٥)ی: (ئیمــان‌و عەقیــدەی ئیســـلامیی...)داو بەرگــەکانی (٢)و (٥)ی: (الإســلام کمــا یتَجلّــی فِي کتــاب الله)دا لێکۆڵینەوەیەکی وردمان لەبارەی بابەتی: (قەزاو قەدەر)ەوە کردوە.

ئنجا نووسەر لە خاڵی (٢٦)یش دا، هەر لەســەر باســی مەســەلەی قــەدەر بــەردەوام دەبێ‌و، دەڵێ:

(٢٦) ( وَهُــوَ مُــتَــعَــالٍ عَنِ الأَضْــدَادِ وَالأَنْـــــدَادِ ):

واتە: خوا بەرزە لە ئاست دژەکان‌و وێنەکان، واتە: خوا بەرزە لەوەی، کە هیچ شــتێك بتوانێ دژی بێ، (الأضداد) کۆی (ضِدٌّ)ە، (الأنـداد)یش کــۆی (نـدٌّ)ە، (ضِـدٌّ) یــانی: دژ، (ندٌّ)یش یانی: وێنە (مـثل)[2]، خوا بەرزە لەوەی کە هیچ شتێك دژی بێ، یان هیچ شتێك وێنەی بێ، چونکە هەر شتێ هەبێ، هەر دروست کراوی خۆیەتی، ئنجا شــتێك دروســت کراوی خوابێ، چۆن دەتوانێ دژایەتیی خوا بکات، شتێك دروســتکراوی خــوا بــێ، چــۆن دەتوانێ وێنەی خوا بکات، لە هیچ شتێکیدا.

---

١) لە سەرچاوەکانی مێژوودا هاتوە کە ئەو دەمڕاستەی موعتەزیلە (أبو علی الجبائي) بووە، وە (أبو حسـن الأشعري) کەسێکی نەناسراوی لێڕاسپاردەوە ئەو وتووێژەی لەگەڵ کردوە.

٢) بڕوانە: المعجم الوسیط، ص٥٣٦ (الضِّدّ: المخالف والـمنافـي... الـمِثْلُ والكُـفـءُ والنظیـر). وە ص٩١، (النِدّ: الـمِثل والنظیـر).

لێرەشدا وا پێدەچێت نووسەر مەبەستی ئەوە بێت، کە هەندێك لە خەڵکی خاوەن بیروڕای لادەر (مُنْحَرِف) پێیان وایە کە: خوای خێرو خوای شەڕ هەن، یان پێیان وایە،کە شتێکی دیکە هەیە،دەتوانێ پێچەوانەی ویستی خوا بجووڵێتەوە، یان دژایەتیی خوا بکات، یان وێنەی خوا بکات، ئەوە نەفی دەکات لە خوای بەرزو دەڵێ: نەخێر، نەهیچ شتێك دژی خوایەو، نەهیچ شتێکیش وێنەی خوایە.

ئنجا نووسەر لە سێ سیفەتدا لە خاڵی (٢٧)دا پوختەی قسان لە بارەی قەدەری خواوە دەکاتو، دەڵێ:

> ٢٧) (لا رَادَّ لِـقَضَـائِـهِ، وَلا مـُعَـقِّـبَ لِـحُـكْمِـهِ، وَلا غَـالِبَ لأَمْـرِهِ):

واتە: هیچ شتێك بڕیاری خوا بەرپەرچ ناداتەوە، (قَضَاء) یانی: ئەو شتەی، کەخوا بڕیاری لەسەر داوە، بەرپەرچ دەرەوەو ڕەت کەرەوەی نیە، (وَلا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ)،گێڕەرەوە نیە بۆ حوکمی خوا، (وَلا غَالِبَ لأَمْرِهِ) هیچ زاڵێك نیە بەسەر فەرمانی خوادا، ئەوانە هەرسێکیان: (قَضَاء، حُكْم، أَمْر) لە یەکدی نێزیکن، وشەکانی: (رَدّ، تَعقيب، غَلب) لە مانادا لە یەکدی نێزیکن.

بەڵام نووسەر (خوا لێی خۆش بێ) عادەتی وایە، یەك مانا بە سێ چوار شێواز دەهێنێو، یەك مانا دەهاوێتە نێو قاڵبی چەند شێوە دارشتنێکەوە، تاکو باشتر ڕوون بێتەوە کەواتە: بڕیاری خوا، هیچ کەسێ ناتوانێ بەرپەرچی بداتەوە، وە حوکمی خوا، هیچ کەس ناتوانێ بیگێڕێتەوە بەرەو دوا (عَقَب)، فەرمانی خواش (واتە: فەرمانی قەدەریی‌و تەکوینی، نەك تەشریعی، چونکە زۆر کەس فەرمانی شەرعیی خوا فەرامۆش دەکات!) هیچ کەس بەسەریدا زاڵ نیە کە خوا بیەوێ شتێك بکاتو فەرمانی بە شتێك کرد، هیچ

كەس ناتوانێ بەسەریدا زاڵ بێ‌و، نەهێڵێ ئەو شتە بكرێ [١]، ئەو خاڵانە زیاتر پەیوەندییان بە قەزاو قەدەرەوە هەیە.

لە كۆتایی باسی قەدەر لەم بڕگەیەدا دەڵێ:

**٢٨) (آمَـنَّـا بِـذَلِكَ كُـلِّـهِ، وَأَيْـقَـنّـا أَنَّ كُـلاًّ مِـنْ عِنْـدِهِ):**

واتە: بڕوامان بە هەمووی هێنا، یەقینمان هەیە كە هەمووی لەوەوەیە. (واتە: لە خواوە). ئەسڵی یەقین، دەڵێ: (يَقِنَ الـمَاءُ: ثَبَتَ وَقَرَ فِي الحَوْضِ)، (يَقِنَ الـمَاء) یانی: (ثَبَتَ، وَقَرَّ)، ئاوەكە ڕاوەستا، یان داوەستا، یەقین یانی: ئەوە كەئینسان بگاتە حاڵەتێكی ئیمانیی كە دڵەكەی دابمەزرێ‌و بچەسپێ‌و جێگیر بێ‌و جووڵە جووڵ نەكات، (وَأَيْقَنَّا) یانی: دڵمان دامەزراوەو سەقامگیر بووە (أَنَّ كُلاًّ مِنْ عِنْدِهِ) كە هەموو ئەو شتانە خێرو شەڕ، زەرەرو قازانج، ژیان‌و مردن، ...هتد، هەمووی لەخواوەیە.

لێرەدا نووسەر كۆتایی بە باسی (معرفة الله)و باسی قەزاو قەدەر (القضاء والقدر) دێنێ، هەرچەندە چەند جارێكی دیكەش، هەر دەگەڕێتەوە سەریان، بەبۆنەی باسكردنی سیفەتەكانی خوای بەرزو مەزن‌و، بەرپەرچدانەوەی هەندێك بیرو بۆچوونی تاقمە داهێنەر (مبتدع)و لاڕێیەكان.

******

---

١) وەك گوتمان مەبەست لە (أمر) لێرەدا، هەروەها (قضاء) و(حكم)یش، هی (قدري و تكويني)یە، نەك (تشريعي).

ئەمجارە نووسەر (خوا لێی خۆش بێ) دێتە سەر باسی بابەتێكی تازە، كە بریتیە لە باسی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەری كۆتایی، موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) (نبوَّة النبَّيٍّ الخاتَم مُحَمـد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)) چوار (٤) خاڵی بۆ تەرخان كردوە (٢٩- ٣٢)، هەرچەندە جاری دیكەش، هەر دەگەڕێتەوە سەر باسی پێغەمبەرایەتیی‌و پێغەمبەران (عَلَيهمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) بەگشتیی‌و، پێغەمبەری خاتەم (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەتایبەت.

**٢٩)- ( وَإِنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ الْمُصْطَفَى، وَنَبِيهُ الْمُجْتَبَى، وَرَسُولُهُ الْمُرْتَضَى ):**

لێرەدا دەیگێڕێتەوە بۆ پێشەوە، یانی: ئێمە بڕوامان وایە كەموحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەندەی هەڵبژێردراوی خوایە (وَنَبِيهُ الْمُجْتَبَى)، پێغەمبەری دانستەی خوایە، (وَرَسُولُهُ الْمُرْتَضَى)، ڕەوانەكراوی پەسەندكراوی خوایە، لێرەدا نووسەر سێ وشەی وەك نازناو بۆ موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەكارهێناون: (عَبْد، نَبِي، رَسُول)، سێ وەسفیشی بۆ بەكارهێناون: (مُصْطَفَى، مُجْتَبَى، مُرْتَضَى)، لە ڕاستییدا بەرزیی ئینسان‌و گەورەیی ئینسان لەوەدایە كە (بەندە)تر بێ بۆ خوای پەروەردگار، هەندێ كەس وا دەزانێ گەورەیی ئینسان لەوەدایە كە پێشەوایەك بێ، زانایەك بێ، نەخێر، عەزەمەتی پێغەمبەری خاتەم‌و هەموو پێغەمبەرانی دیكەش لەوە دابووە، كە لە خەڵكی عەبدتر بوون بۆ خوای بێ هاوتا.

بەڵێ، شكۆمەندیی‌و گەورەیی ئینسان، لە عەبدایەتیی دایە، پێغەمبەران (علیهم السلام) عەبدی زۆر چاكی خوا بوون، بۆیە خوا كردوونی بە پێغەمبەرو، بە شایستەی ئەوەی زانیون كە پەیامیان پێدابنێرێ. بەڵێ، با هەموومان ئەو حەقیقەتە باش بزانین، كە ئینسان هەتا بۆ خوا بەندەی چاكتربێ، تا گەردن كەچتربێ، تا زیاتر فەرمانبەری خوا بێت،

زیاتر لە لای خوا ڕێزو قەدری پەیدا دەبێ!

دیارە نووسەریش بە خۆڕایی نیە ئاوای هێناوە: (وَإِنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ الْمُصْطَفَى)، پێشێ پێناسەی موحەممەدی بە سیفەتی (بەندەی هەڵبژاردە)، هێناوە، چونكە بەندایەتیی لە ئینسان دا لە هەموو شتێك گەورەترە، ئنجا دەڵێ: (وَنَبِيُّهُ الْمُجْتَبَى) پێغەمبەری دانستەی خوایە، دواییش دەڵێ: (وَرَسُولُهُ الْمُرْتَضَى)، ڕەوانەكراوی پەسند كراوی خوایە، خواش كەوەسفی پێغەمبەر دەكات (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە بەرزترین مەقامدا بە سیفەتی (عَبْد) ناوی دەبات، بەرزترین مەقامی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شەوی میعراج بووە كە خوا دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا ... ﴾ الأسراء، واتە: پاكیی بۆ ئەو خوایەی كە شەوڕێیی بەبەندەكەی خۆی كرد، نەیفەرمووە (برسُوله)، دیسان بەرزترین مەقامی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، مەقامی خەڵك بانگ كردن بووە، بۆ لای خوای پەروەردگار كە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴾ الجن، كاتێك بەندەی خوا هەستا خەڵكی بانگ كرد بەرەو خوا (جندەكان) خەریك بوون، (یان موشریكەكان) كەڵەكەی لەسەر بكەن،وەمەقامێكی دیكەی زۆر بەرزی پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەوەیە كە قورئانی بۆ هاتۆتە خوار، كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ ... ﴾ البقرة، واتە: ئەگەر لە گوماندان لەوەدا كە دامانبەزاندۆتە سەر بەندەكەمان، سوورەتێكی وەك وی بێنن.. دیارە هۆكاری ئەمەش ئەوەیە كە ئینسان بۆ بەندایەتیی كردن بۆ خوا دروست كراوە: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاریات، واتە: جندو مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە دروست كردوون، كە بمپەرستن. هەڵبەتە هەر مەخلووقێكی خواش كە خوڵقاندوویەتی، هەتا ئەو ئامانجەی كە بۆی خوڵقێنراوەو ئەو حیكمەتەی بۆی وەدیهێنراوە، زیاتر لە خۆیدا بهێنێتە دی، زیاتر كەسایەتیی خۆی دەسەلمێنێو دەچەسپێنێ، كەسایەتی بەرزو مەزنی ئینسانیش، بریتیە لە بەندایەتیكردنی بۆ خوای

بەرز، چونكە خوا ئینسانی بۆ عەبدایەتیی خولْقاندوە، بۆیە كێ بۆ خوا بەندەترو گەردنكەچتربێ، ئەوەیان زیاتر لە خوای بێ وێنە نێزیكەو سەرەنجام كەسایەتیی ئینسانیی خۆی زیاتر چەسپاندوە، موحەممەدیش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە هەموو كەس بەندەتر بووە بۆ خوای پەروەردگارو، لە هەموو كەس بۆ خوا گەردن كەچتر بووە، بۆیە لە هەمووكەس لەلای خوا بەڕێزترو گەورەتر بووە.

بۆ جیاوازیی نێوان (نَبِي) و (رَسُول)یش، ڕای زۆربەی زانایان ئەوەیە، كە هەردووكیان بۆ كەسانێك بەكارهێنراون كە خوا لەلایەن خۆیەوە هەواڵی تایبەتی پێداون و پەیامی بۆ ناردوون، بەڵام (نَبِي) ئەو زاتەیە، كە ڕاگەیاندن (تبلیغ)ی لەسەر پێویست نەكراوەو (مُكَلَّف) نەكراوە بەوەی، كە ئەو پەیامە بە غەیری خۆی ڕابگەیەنێ، بەڵام (رَسُول) كەسێكە (مُكَلَّف) كراوە كە ئەوەی خوا پێی ڕاگەیاندوە، بەخەڵكی بگەیەنێ، ئەوە لەسەر ڕای زۆر لە زانایان.

بەڵام پێشەوا (ئیبنو تەیمیە) (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، لە كتێبی (النبوات)دا، ڕایەكی دیكەی هەیە كە من ڕایەكەی ئەوم پێ بەهێزترە[1]، دەڵێ: نەبیی‌و ڕەسوول، هەردووكیان (مُكَلَّف)ن بەوە كە دینی خوای بێ هاوەڵ بە خەڵكی ڕابگەیەنن، بەڵام جیاوازییان ئەوەیە، (رسول) خاوەنی شەریعەتێكی سەربەخۆیە، یاخود خاوەنی پەیامێكە، كە دەبێ پێی ڕووبەڕوو بێتەوە لەگەڵ خەڵكداو لەگەڵ دەسەڵاتداراندا، بەڵام (نبي) هەر بەدوای شەریعەتی (رسول)ی پێش خۆی دەكەوێ، یاخود ئەو پەیامەی كە پێیدراوە بیگەیەنێ، هەر بە نێو خەڵكیدا بڵاوی دەكاتەوە، بەڵام (مُكَلَّف) نیە بەوەی كە پێی ڕووبەڕوو بێتەوە لەگەڵ تاغووت‌و دەستەڵاتدارەكاندا، بۆیەش وا دەڵێ، دەڵێ: ، چونكە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ ... ﴾ الحج، واتە: لەپێش تۆدا هیچ ڕەسوولێك‌و هیچ نەبییێكمان نەناردوە. كەواتە: (نبي)یش، هەر نێرراوەو خوای پەروەردگار هەر(مُكَلَّف)ی كردوە، بەوەی كە پەیام بە خەڵكی ڕابگەیەنێ.

---

١) لە بەرگی (٤)ی كتێبی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا كە تەرخان كراوە بۆ باسی ئیمان بە پێغەمبەرانی، بەوردیی باسی چەمك‌و واتای (رسول) و (نبي)مان كردوە.

ئنجا لە فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)یش دا هاتوە، فەرموویەتی: ((إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ))حديث صحيح[1].

واتە: بەدڵنیاییەوە زانایان میراتگری پێغەمبەرانن.

زانایان کاریان چیە؟ زانایان کاریان ئەوەیە، ئەوەی کەپێغەمبەران فەرموویانە، بە خەڵکی ڕابگەیەنن، ئەگەرنا هیچ شتێك لە گیرفانی خۆیان دەرناهێنن. کەواتە: (أنبیاء)یش هەرئەو بەرنامانەی (رُسُل) هێناویانەو ڕایانگەیاندوون، ئەوانیش هەر ئەوەیان بە خەڵکی ڕاگەیاندوە خەڵکی سەردەمی خۆیان، وە خۆیان بەرنامەیەکی نوێیان نەهێناوە، پێشم وایە ئەو ڕایە بەهێزترە لەوەی پێشێ، کە دەیگوت: (أنبیاء) (مكلَّف) نەبوون بەوەی کەدین بە خەڵکی ڕابگەیەنن.

**٣٠) (وَإِنَّهُ خَاتَمُ الأَنْبِيَاءِ، وَإِمَامُ الأَتْقِيَاءِ، وَسَيِّدُ الْمُرْسَلِينَ، وَحَبِيبُ رَبِّ العَالَمِينَ):**

لێرەدا نووسەر چوار سیفەت لە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هەڵدەدات، دەڵێ: {بڕوامان وایە کەموحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) }

- (خَاتَمُ الأَنْبِياءِ): کۆتایی پێغەمبەرانە.
- (وَإِمَامُ الأَتْقِيَاءِ): پێشەوای پارێزکارانە.
- (وَسَيِّدُ الْمُرْسَلِينَ) گەورەی ڕەوانەکراوانە.
- (وَحَبِيبُ رَبِّ العَالَمِينَ) خۆشەویستی پەروەردگاری جیهانەکانە.

سەبارەت بەوە کە پێغەمبەری ئێمە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کۆتایی پێغەمبەرانە، خوای زاناو شارەزا، بە ڕاشکاویی بڕیویەتەوەو دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ

[1]) رواهُ أَبو دَاوُدَ برقم: (٣٦٤١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٨٢)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح ابن ماجه) رقم: (١٨٢).

﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٤٠﴾﴾ الأحزاب، واتە: موحەممەد بابی هیچ كام لە پیاوانی ئێوە نیە، بەڵكو ڕەوانەكراوی خوایەو كۆتایی پێغەمبەرانە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەوبارەوە فەرموویەتی: {إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلُ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنى بَيْتًا فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ إِلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ، وَيَعْجَبُونَ لَهُ، وَيَقُولُونَ: هَلاَّ وُضِعَتْ هٰذِهِ اللَّبِنَةُ فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتَمُ النَبِيينَ} حديث صحيح.[1]

واتە: بێگومان وێنەی منو پێغەمبەرانی پێش من، وەك ئەوە وایە: پیاوێك خانوویێكی دروست كردوە، زۆر ڕێكی كردوەو جوانی كردوە، جگە لە شوێنی خشتێك لە یەكێك لە گۆشەكانیدا، خەڵك بە دەوری ئەو خانووەدا دەهاتنو دەچوونو، پێی سەرسام دەبوون، دەیانگوت: خۆزگە ئەو خشتەش دانرابایە، (خانووەكە تەواو دەبوو)، دەجا من ئەو خشتەمو من كۆتایی پێغەمبەرانم.

دیسان پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەو بارەوە فەرموویەتی: {فُضِّلْتُ عَلَى الأَنْبِيَاءِ بِسِتّ: أُوتِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُوراً، وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً، وَخُتِمَ بِيَ النَبِيونَ} حديث صحيح.[2]

واتە: من بەشەش شتان، بەسەر پێغەمبەراندا هەڵبژێرراومو گەورەكراوم: وتە كۆكەرەوەكانم پێدراون، {واتە: قسەی وام پێدراوە كە مانای زۆر لە خۆ دەگرێ} وە بەترس خستنە دڵی دوژمنمەوە، بەسەر دوژمندا سەرخراوم، وە غەنیمەتو دەستكەوتم بۆ حەڵاڵ كراوە، وە زەوی بۆ من گێڕدراوە بە پاكو جێگای نوێژ، (پێغەمبەرانی پێشوو لە شوێنی تایبەتی پەرستگای خۆیان نەبا، نەیاندەتوانی نوێژ بكەن، بەڵام پێغەمبەری ئێمە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و ئوممەتەكەی، لە هەموو شوێنێك بۆیان هەیە نوێژ بكەن)، وەنێردراوم بۆ

---

١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٩١٥٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٣٤٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦١٠١) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.
٢) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (١١٩٥) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

تێکڕای خەڵکی (بەڵام پێغەمبەرانی پێشتر تایبەت بوون بە گەلێکی دیاریی کراوو بە کاتێکی دیاریی کراوەوە)، وەپێغەمبەران بەمن کۆتاییان پێهاتوە.

ئنجا ئەوە کە پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) گەورەی هەموو پێغەمبەرانە، فەرموودەی زۆری لەسەرن، یەکێك لە فەرموودەکان ئەمەیە: {«أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْهُ الْقَبْرُ وَأَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ»}حديث صحيح.[1]

واتە: من گەورەی وەچەی ئادەمم لە ڕۆژی دواییدا، وە یەکەمین کەسم کە گۆڕم بۆ ئاوەڵا دەبیّو دێمە دەر، وە یەکەمین کەسم کە تکا دەکەم (بۆ ئوممەتو بۆ تێکڕای بەشەر لە ڕۆژی دواییدا)، وە یەکەمین کەسێکم کە تکام وەردەگیریّو داواکارییەکەم جێ بەجێ دەکریّ.

هەروەها پێغەمبەری ئێمە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خۆشەویستی پەروەردگاری جیهانەکانە، هێندێك لە زانایان پێیان وایە کە هەر پێغەمبەر ئیبراهیم (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خەلیلی خوایە، ، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿...وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا ﴿١٢٥﴾﴾النساء، بەڵام پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە فەرموودەیەك دا فەرموویەتی: {لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً خَلِيلاً لاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً، وَلَكِنَّهُ أَخِي وَصَاحِبِي، وَقَدْ اتَّخَذَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ صَاحِبَكُمْ خَلِيلاً}حديث صحيح.[2]

واتە: ئەگەر کەسێکم گرتبا بە دۆستی زۆر نیزیکی خۆم، ئەبو بەکرم دەکرد بە دۆستی زۆر نیزیکی خۆم، بەڵام ئەو برامەو برادەرمە، بێگومان خوا (عزّ وجل) ئەو هاوەڵەی ئێوەی (کە موحەممەدە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)) بەدۆستی خۆی داناوە.

---

١) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٠٧٩) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

٢) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٣٢٢) عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

بەڵێ، پێغەمبەری ئێمە موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خۆشەویستی خوایە، چونكە (خُلَّة) لە (محبة)ت بەرزترە[1]، یانی: خوای بەرز هیچ كەسێكی وەك موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خۆش نەویستوە،چونكە هیچ كەس لەو بەندە تر نەبووە بۆ خوای پەروەردگار.

## ٣١) ( وكُلُّ دَعْوَى النُّبُوَةِ بَعْدَهُ، فَغَيٌّ وَهَوَى ):

واتە: هەر لاف لێدانو دەعوا كردنێكی پێغەمبەرایەتیی لە دوای وی (واتە: موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)) سەرگەردانییو شوێنكەوتنی ئارەزوویە، لە فەرموودەی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هاتوە: { وَإِنَّهُ سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي كَذَّابُونَ ثَلاَثُونَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِي وَأَنَا خَاتَمُ النَبِيينَ لاَ نَبِي بَعْدِي}حديث صحيح.[2]

واتە: لە ئوممەتی من سی (٣٠) درۆزن پەیدا دەبن، كە هەموویان گومانیان وایە پێغەمبەرن، وەمن كۆتایی پێغەمبەرانم، لەدوای من هیچ پێغەمبەر نین.

كەواتە: هەر كەسێك داوای پێغەمبەرایەتیی بكات، یان داوای یەكێك لە سیفەتەكانی پێغەمبەرایەتی بكات، وەك ئەو كەسەی كە ئیددیعا بكات، كە پەیامێكی تایبەتی لەلایەن خواوە بۆ دێ، ئەوە دیارە ئیددیعا كردنو لاف لێدانی پێغەمبەرایەتیی لە دوای موحوممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، سەرگەردانییو شوێنكەوتنی ئارەزوویەو، هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نیە، ئنجا درێژترین ماوە كە كەوتبێتە نێوان پێغەمبەرانەوە، ئەو ماوە بووە كەكەوتۆتە نێوان پێغەمبەر عیساو پێغەمبەرمان (عليهما الصلاة والسلام)، پێغەمبەر عیسا لەساڵی (١)ی زایینی لە دایك بووە كە مێژووی میلادیی بە لە دایك بوونی عیسا دەستی پێكردوە، پێغەمبەریشمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە ساڵی (٥٧١)ی زایینی لە

١) الخُلّة: الصَّداقة والمحبَّة التي تخَلَّلتِ القلب فصارتْ خِلالَهُ، أي في باطنه. المعجم الوسيط ص٢٥٣.

٢) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٤٤٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٨٨٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٢٥٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٧٦) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩٥٢).

دایك بووه، واته: له دایك بوونی عیسا، تا له دایك بوونی پێغەمبەر (محمد) (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) (٥٧١) ساڵی بەین بووه، ئەوه درێژترین ماوەیه، كه كەوتبێته نێوان ئەو دوو پێغەمبەرەوه، بەڵام ئێستا له (٥٧١)ەوه هەتاوەكو (٢٠١٤) هەتا ئێستا هیچ كەسێكی دیكه نەیتوانیوه بڵێ: پێغەمبەرمو بشتوانێ پێغەمبەرایەتیی خۆی ئیسپات بكات، دیاره هەبوون وایان گوتوه، بەڵام هەموویان درۆزن بوون، بۆ وێنه: (موسەیلەمەی كەززاب، ئەسوەدی عەنسیی، سەجاحی یەمامه) بەڵام دەركەوت كه هەموویان درۆزنن.

## ٣٢) ( وَهُوَ الْمَبْعُوثُ إِلَى عَامَّةِ الْجِنِّ وَكَافَّةِ الْوَرَى، بِالْحَقِّ وَالْهُدَى، وَبِالنُّورِ وَالضِّيَاءِ ):

واته: ئەو (پێغەمبەره (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)) نێردراوه بۆ تێكڕای جندو بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، به هەقو به ڕێپوونیی كردنەوه نێرراوه، به ڕووناكییو به تیشكەوه. (النُّورِ، وَالضِّيَاءِ)، مانایان یەكه، یان زۆر لەیەك نیزیكه، دەشتوانین بڵێین: (نُور) ڕووناكییەكی كەمو، (ضِيَاء) ڕووناكییەكی بەهێزترو زیاتره، چونكه خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا ... ﴿٥﴾ ﴾یونس، واته: خوا مانگی كردوه به نوور، ڕۆژیشی كردوه به (ضیاء)، (نور) ئەوەیه كەتیشكەكەی وەدەستهێنراو (مكتَسب) بێو هی خۆی نەبێ، بەڵام (ضِيَاء) ئەوەیه كەتیشكەكەی خودیی (ذَاتِي) بێو هی خۆی بێت، (حَق)یش له بەرانبەر (بَاطل)دایەو یانی شتی چەسپاو، وەك چۆن (باطل) بەشتی پووچو بۆشو بێ نێوەڕۆك دەگوترێ.

خوای كاربەجێش له وەسفی پێغەمبەری خاتەم دا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ شَـٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَـذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ ﴾ الأحزاب، واته: ئەی پێغەمبەر! ئێمه تۆمان ڕەوانەكردوه كه چاودێرو

موژدەدەرو ترسێنەر بی و بانگخوازی بۆ لای خوا بە مۆڵەتی خۆی و، چرایەکی ڕۆشنکەرەوەی.

سوپاس‌و ستایش بۆ خوا (عزّ وجلّ) لە هەرکام لە بەرگی (٤)ی: (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی...)و بەرگی (٤)ی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا باسی ئیمان بە پێغەمبەرایەتیی‌و وەحی‌و پێغەمبەرایەتیمان کردوە، باسێکی خەست‌و خۆڵمان لەبارەی پێغەمبەری خاتەم (موحەممەد)ەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کردوە، لە بەرگی (٤): (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا لەژێر ناوونیشانی: (خاتَمُ النَبِيِّين (مُحَمَّد) وَمُوجَز سِيرَتِه وَبَراهِين نبوَّته)، هەروەها لە کتێبی: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و دەرس‌و پەندەکانی)دا زۆربەی ئەوەی کەپێویستە مسولمانان لە بارەی پێغەمبەرەکەیانەوە بیزانن خستوومانەتە ڕوو.

*****

نووسەر هەردووك خاڵی سیو سیو سیو چوار (٣٣و ٣٤)ی تەرخان كردوە بۆ قسە كردن لەبارەی قورئان، فەرمایشتی خوا (كلامُ الله)وە، شایەنی باسیشە كە كاتی خۆی زانایان كێشەو مشتو مڕی زۆریان لەبارەی قورئانەوە بووە، سەبارەت بە چۆنییەتی پەیوەندیی نێوان قورئانو سیفەتی فەرمایشتكردنی خوا (تكليم الله)و مەسەلەی ئەو پیتو دەنگانەی بوونەتە قاڵبی ماناكانی قورئانو، پاشان دروستكراو (مَخلُوق)، یان دروستكراو نەبوونی قورئانو....هتد.

تەنانەت یەكێك لە ناوو نیشانەكانی زانیاری عەقیدە بریتی بوو، لە زانیاریی كەلام (عِلمُ الكَلام) لە سۆنگەی زاڵبوونی قسەباسكردن لە بارەی قورئانەوە بەسەر بابەتەكانی دیكەدا، كە بێگومان دەستی سیاسیشی لە پشتەوە هەبووە.

دیارە ئێمەش (الطحاوي) چی گوتوە، بە ئەمانەتەوە دەیهێنینو لەبارەیەوە دەدوێین، ئەگەرنا، هەندێك مەسەلە كە لە ڕۆژگاری ئەودا باسو خواسی گەرمیان لەسەر كراوە، ئێستاكە كەمتر باس دەكرێنو شوێنی خۆیان بۆ بابەتگەلێكی دیكە چۆڵ كردوە، ئێمەش دەبێ وریای ئەو ڕاستییە بین، تاكو وا نەیەینە بەرچاو، كە لە غەیری ڕۆژگاری خۆماندا دەژین (نعيشُ في غير زماننا)!!.

٣٣)- ( وَإِنَّ الْقُرْآنَ كَلاَمُ اللهِ، مِنْهُ بَدَا بلا كَيْفِيَّةٍ قَوْلاً، وَأَنْزَلَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَحْيًا، وَصَدَّقَهُ الْمُؤْمِنُونَ عَلَى ذَلِكَ حَقًّا، وَأَيْقَنُوا أَنَّهُ كَلاَمُ اللهِ تَعَالَى بِالْحَقِيقَةِ، لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ كَكَلاَمِ الْبَرِيَّةِ، فَمَنْ سَمِعَهُ فَزَعَمَ أَنَّهُ كَلاَمُ الْبَشَرِ فَقَدْ كَفَرَ، وَقَدْ ذَمَّهُ اللهُ وَعَابَهُ وَأَوْعَدَهُ بِسَقَرَ، حَيْثُ قَالَ تَعَالَى: ﴿ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴾ (٢٦) المدثر، فَلَمَّا أَوْعَدَ اللهُ بِسَقَرَ لِمَنْ قَالَ: ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا

قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ ﴿٢٥﴾ المدثر، عَلِمْنَا وَأَيْقَنَّا أَنَّهُ قَوْلُ خَالِقِ الْبشَرِ، وَلاَ يُشْبِهُ قَوْلَ الْبَشَرِ ):

بابەتێك كە لە عەقیدەی ئیسلامییدا وەك پایەیەكی گرنگ دادەنرێ، بریتییە لە بڕوابوون بە كتێبەكانی خوا، دیارە بڕوا بوون بە قورئان، بڕوابوونیشە بە هەموو كتێبەكانی دیكە، چونكە قورئان باسی تەوراتو ئینجیلو زەبوور دەكات، بۆیە لێرەدا نووسەر زۆر بە خەستی باسی قورئان دەكاتو دەڵێ: (وَإِنَّ الْقُرْآنَ كَلاَمُ اللهِ) وە بڕوامان وایە كە قورئان قسەی خوایە، (مِنْهُ بَدَا بِلا كَيْفِيَّةٍ قَوْلاً) قورئان لەخواوە دەركەوتوە، {(بَدَا) یانی: (ظَهَر) (مِنْهُ بَدَا)، یانی: لە خواوە دەركەوتوە}، (بِلا كَيْفِيَّةٍ قَوْلاً)، بەقسە بەبێ چۆنیەتییەك (كە ئێمە بیزانین)، ئەگەرنا چۆنییەتییەكی هەر هەیە، بەڵام ئێمە ئەو چۆنییەتییە نازانین، نازانین چۆن كەلامی خوا لە خواوە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) هاتوەو دەركەوتوە!، ئێمە گوتمان: خوای بێ وێنەو بەرز وەك هیچ شتێك نیە، دیارە كەلامی خواش یەكێكە لە سیفەتەكانی، ئنجا وەك چۆن خوای بەرزو بێهاوتا،زاتی وەك هیچ زاتێك نیە، سیفەتەكانیشی وەك سیفەتی هیچ كام لە دروستكراوەكانی نین، (بِلا كَيْفِيَّةٍ قَوْلاً)، یانی: خوای كاربەجێ فەرمایشتی خۆی، قورئانی خۆی فەرمووە، بەڵام بە شێوەیەك كە ئێمە نازانین چۆنە، چۆنییەتییەك كە لەلای ئێمە مەعلووم نیە، (وَأَنْزَلَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَحْيَاً)، قورئانی دابەزاندۆتە سەر پێغەمبەری خۆی (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وەك پەیامێك، (وحي) واتە: قسەیەكی پەنهان، ئاماژە كردن، پەیامی خوا بۆ پێغەمبەرانی، (وَصَدَّقَهُ الْمُؤْمِنُونَ عَلَى ذَلِكَ حَقّاً)، بڕواداران تەصدیقی پێغەمبەریان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كردوەو بەڕاستیان زانیوە لەسەر ڕاگەیاندنی ئەو هەقە بە شێوەیەكی حەقو ڕاست، (وَأَيْقَنُوا أَنَّهُ كَلاَمُ اللهِ تَعَالَى بِالْحَقِيقَةِ) بڕواداران یەقینیان هەیەو دڵیان دامەزراوە، كە بەحەقیقەت قورئان قسەی خوای بەرزە.

ئنجا ئێستا دێمە سەر ئەوە، كە بۆچی نووسەر بەڕەحمەت بێ، هێندە تەئكید لەسەر ئەوە دەكاتەوە، (لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ كَكَلاَمِ الْبَرِيَّةِ) (قورئان) وەك قسەی دروست كراوەكان

دروست کراو نیە، (فَمَنْ سَمِعَهُ فزَعَمَ أنَّهُ كَلامُ الْبَشَرِ فقَدْ كَفَرَ) هەر کەسێك قورئان ببیستێ‌و گومانی وابی کە قسەی ئینسانانە، ئەوە کافر دەبێ، (وَقَدْ ذَمَّهُ اللهُ وَعَابَهُ وَأَوْعَدَهُ بِسَقَرَ) خوا سەرزەنشت‌و سەرکۆنەی ئەو کەسەی کردوە، کە دەڵێ: قورئان قسەی بەشەرە‌و، هەڕەشەی لێکردوە‌و ترساندوویەتی بە (سَقَر) کە یەکێکە لە ناوەکانی دۆزەخ، یان ئاگرێکە لەو جۆرە ئاگرانەی کە لە دۆزەخدا هەن، (حَيْثُ قَالَ تَعَالَى) خوای بەرز لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ٢٦﴾، من لەمەودوا ئەو ئینسانە، کە دەڵێ:

﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ٢٥﴾ قورئان بەس قسەی ئینسانانە، ئەو ئینسانەی دەخەمە (سَقَر)ەوە، (فَلَمَّا أَوْعَدَ اللهُ بِسَقَرَ لِمَنْ قَالَ: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ٢٥﴾المدثر، واتە:

کاتێك خوا هەڕەشە لەو کەسە دەکات کە دەڵێ: قورئان قسەی بەشەرە، بەوە کەدەیخاتە نێو (سَقَر)ەوە ،مادام خوا هەڕەشە لەو کەسە دەکات، کەوا دەڵێ: (عَلِمْنَا وأَيْقَنَّا أنَّهُ قَوْلُ خَالِقِ البَشَرِ، وَلاَ يُشْبِهُ قَوْلَ البَشَر) دەزانین‌و یەقینمان پەیدا دەبێ کە قورئان قسەی بە دیهێنەری ئینسانەکانە‌و، وەك قسەی بەشەران ناچێ.

**٣٤) ( وَمَنْ وَصَفَ اللهَ بِمَعْنَى مِنْ مَعَانِي البَشَر، فَقَدْ كَفَر، فَمَنْ أبْصَرَ هَذَا اعْتَبَرَ، وعَنْ مِثْلِ قَوْلِ الكفَّارِ انْزَجَر، وَعَلِمَ أنَّه بصفَاتِه لَيْسَ كَالْبَشَر ):**

واتە: هەر کەسێك خوا وەصف بکات بە سیفەتێك، یان بە مانایەك لەوانەی کە بۆ بەشەران بەکاردەهێنرێن، ئەوە کافر دەبێ، (فَمَنْ أبْصَرَ هَذَا اعْتَبَرَ) هەر کەسێك ئەوە ببینێ بە چاوی دڵ‌و عەقڵ، ئەوە پەندو عیبرەت وەردەگرێ، (وعَنْ مِثْلِ قَوْلِ الكفَّارِ انْزَجَر) وە لەوەی کە وەك کافران قسە بکات دەسڵەمێتەوە‌و ئەو قسەیە ناکات، (وَعَلِمَ أنَّه بصفَاتِه لَيْسَ كَالْبَشَر)، دەزانێ کە خوا بە سیفەتەکانیشی وەك ئینسانان نیە، دیارە نووسەر لێرەدا دەیەوێ ئەو حەقیقەتە ڕابگەیەنێ، کە قورئان سیفەتی خوایە کەلام‌و وتەی خوایە،

فەرموودەی خواش سیفەتی خوایە، ئێمە پێشتر گوتمان ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ ... لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾ الشوری، زانایـــان زۆر گرنگییـــان پێداوە، چونکە بەرپەرچی هەرکام لە: (مُشَبِّه)ەکانو (مُعَطِّل)ەکان دەداتەوە، (مُشَبِّه)ەکان کە دەڵێن: خوا وەك مەخلووقەکانییەتی، بۆ وێنــە دەڵــێن: قســەی خــوا، وەکــو قســەی ئینسانە، دیتنی خوا وەك دیتنی ئینسانە، یان عیلمی خــوا، وەك عیلمــی ئینســانە ... هتد، ئەوانەی کە هەر شتێکی خوا تەشبیھ دەکەن بە ئینسان، ئەوانە (مُشَبِّه)ەیـان پـێ دەگوترێ، (مُجَسِّمَة)شیان پێ دەگوترێ، چونکە خوا وەك جەستە (جِسْم)، یان وەك ماددە سەیر دەکەن، (مُعَطِّل)ەکانیش سیفەتەکان لە خوا دادەڕنــن کــە خــوا بــۆ خــۆی بــەکاری هێناون، یان پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەو سیفەتانەی بۆ خوا بەکارهێناون کەواتە: ﴿ ...لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ... ﴿١١﴾ ﴾ الشوری، بەرپەچی موشەبیهەکان دەداتــەوە کــە هیچ شتێك وەك خوا نیــە، نەلــە زاتیــداو نەلــە سیفەتیدا، ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾ بەرپەرچی (مُعَطِّل)ەکان دەداتەوە کە دەیانەوێ سیفەتەکانی خوا لە خوا دابڕنن بەحیسابی خۆیان، تاکو خوا وەك دروستکراوەکانی نەچێ، جا یەکێك لە سیفەتەکانی خوا، بریتیە لە کەلامی خوا کە قورئانە، کاتی خۆی لە قورئاندا مشتو مڕی زۆر بــووە و، زانایــان بــە شێوەیەکی سەرەکیی، بوونەتە دووبەش:

١) ئەهلی سوننەتو جەماعەت گوتوویانە: قورئان کەلامی خوایە، قسەی خواش سیفەتی خوایە، گوتیشمان کە سیفەتەکانی خوا وەك زاتی وانو لە سیفەتەکانی مەخلووقەکانی ناچن.

کەواتە: ئێمە نازانین کەلامی خوا چۆنی فــەرمووە، چــۆنییەتییەکەی نــازانین، بــەس ئەوەندە دەزانین کە سیفەت لقی زاتە، ئنجا وەك چۆن خــوا زاتەکــەی بــێ ســەرەتایە، سیفەتەکەشــی هەروایــە، وەك چــۆن زاتەکــەی وەك هــیچ زاتێکــی دیکــە نیــە،

سیفەتەکانیشی وەك سیفەتی هیچ مەخلووقێك ناچن، ئەوە ڕای ئەهلی سوننەتو جەماعەت بوو بە تێکڕا.

٢) (موعتەزیلەکان) کە قەدەرییەکانیشیان پێ دەگوترێ، ئەوان گوتوویانە: بەڵێ، قورئان قسەی خوایە، بەڵام قورئانو هەموو کتێبەکانی دیکەی خواش، مادام لە کاتو شوێنی دیاریکراودا کراون، کەواتە: خوا پەیدای کردوون!

بۆیە دەڵێن: قورئان دروستکراو (مخلوق)ە، هەڵبەتە هیچ کەس لەوەدا نکوولیی نیەو کێشەو مشتو مڕی لەسەر نیە کە ئەو مەرەکەبەی قورئانی پێ نووسراوەتەوەو ئەو پیتانەی کە قورئانیان لێ پێکدێو لە مەصاحیفدا نووسراون، هەموویان دروستکراون، بەڵام عەینی مانای قسەکەو خودی فەرمایشتەکە کە دوایی بە شێوەی تەعبیرو ڕستە ڕاگەیەنراوە، دەڵێین: ئەوە بێ سەرەتایەو سیفەتی خوایە، ئەگەرنا ئەو قاڵبەی کە ئەو سیفەتە خواییە خۆی تێدا دەنوێنێو، تێیدا دەدرەوشێتەوە، کە مەرەکەبەکەیەو کاغەزەکەیە، ئەوە دیارە کە دروستکراون.

ئنجا بۆیە لێرەدا دەڵێ: (وَإِنَّ الْقُرآنَ كَلاَمُ الله، مِنْهُ بَدَا بلاَ كَيْفِيَّة قَوْلاً، وَأَنْزَلَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَحْياً) قورئان فەرموودەی خوایەو لەوەوە دەرکەوتوە، چونکە موعتەزیلەکان گوتوویانە: قورئان لە خواوە نەهاتوە، بەڵکو خوای کاربەجێ دروستی کردوە، وەك هەموو ئەو شتانەی کە دروستی کردوون، هێندێکیشیان دەڵێن: ماناکەی لە خواوەیە، بەڵام دارشتنەکەی لە جبریلەوەیە (عَلَيْهِ السَّلاَم)، هەندێکیش دەڵێن: دارشتنەکەی لە موحەممەدەوەیە! ئەویش بەو قسانەی، بەرپەرچی ئەو قسانە دەداتەوە، (وَأَنْزَلَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَحْياً)، بە شێوەی وەحی ناردوویەتی بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەس ڕاگەیاندنی لەسەر بووە، هیچی لەویەوە نیە.

ئنجا کە دەڵێ: (لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ كَكَلاَمِ الْبَرِيَّةِ) دروستکراو نیە وەك قسەی دروستکراوەکان، ، چونکە مەخلوق بۆ خۆی دروستکراوە، قسەکەشی دروستکراوە، بەڵام خوا خالیقەو قسەکەشی وەك خۆیەتی، وەك چۆن بۆ خۆی دروستکراو نیە، قسەکەشی دروستکراو نیە، نەدروستکراوی خۆیەتی، نەهی غەیری خۆیەتی، ئنجا نووسەر بەڵگەیەکی

زۆر بەهێز دەهێنێتەوەو دەڵێ: ئێمە دەبینین ، کە خوا ڕەخنەی گرتوەو عەیبی گرتوە لەو کەسەی، کە دەڵێ: ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا قَوْلُ ٱلْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ ﴾المدثر، قورئان قسەی بەشەرە، وە هەڕەشەی لێکردوە کە دەفەرموێ: ﴿ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ ﴾المدثر، لەسەر ئەو قسەیە دەیخەمە جەهەننەمەوە کەواتە: تازە بڕایەوە قورئان قسەی بەشەر نیە، بەڵکو فەرمایشتی بەرزو بە پێزی خوایە، چونکە خوا، وەك چۆن زانیاریی‌و تواناو بیستن‌و بینینی هەیە، قسەشی هەیە، ئەوانە هەموو سیفەتی خوان (سبحانەو تعالی) سیفەتەکانی خواش، وەك زاتەکەی وان، دیارە ئەوانەش کە گوتوویانە: قورئان دروستکراو (مخلوق)ە، هێندێك بەڵگە دەهێننەوە، بەڵام زانایانی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت بەڵگەکانیان زۆر چاك بەرپەرچ داونەوە، کە من لێرەدا بە پێویستی نازانم باسیان بکەم، چونکە ئێستا ئەو کێشەیە سوپاس بۆ خوا لە نێو مسوڵمانان‌دا نیەو، هەموو کەس دەزانێ قورئان سیفەتی خوایە، ئەوە شتێك بوو ڕابورد، بەڵام چونکە ئێمە کتێبەکە دەخوێنین، بە پێویستم زانی ئاماژەی هەر پێبکەم.

*****

ئەمجارە نووسەر دێتە سەر باسی بابەتێکی دیکە، کە بابەتی بینینی خوای بەرزو بێ وێنەیە لە بەهەشت دا، لەلایەن بڕوادارانەوەو چوار خاڵی بۆ تەرخان کردوون، خاڵەکانی: (٣٥- ٣٨)، هەرچەندە نووسەر وەك عادەتی خۆی، هەندێك باس‌و بابەتی دیکەشی لەگەڵ ئاوێتەکردوون، بەتایبەت باسی سیفەتەکانی خوای بێ هاوتا، باسی مسوڵمانەتیی‌و ئیمانی ڕاست‌و ساغ‌و، خۆپاراستن لەکەوتنە ژێر کاریگەریی بیرۆکە داهێنراوەکان.

٣٥) ( والرُّؤْيَةُ حقٌّ لأهلِ الجَنَّةِ، بِغَيْرِ إحَاطَةٍ ولا كَيْفيَّةٍ، كَمَا نَطَقَ بِهِ كِتَابُ رَبِّنَا ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾﴾ القيامة، وَتَفْسِيرُهُ عَلَى مَا أَرَادَهُ اللهُ تَعَالَى وَعَلِمَهُ، وَكُلُّ مَا جَاءَ فِي ذَلِكَ مِنَ الحَدِيث الصَّحِيح عَن الرَّسُولِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم، فَهُوَ كَمَا قَالَ، وَمَعْنَاهُ عَلَى مَا أَرَادَ، لا نَدْخُلُ فِي ذَلِكَ مُتَأَوِّلِين بآرَائِنا، وَلاَ مُتَوَهِّمِينَ بأَهْوَائنَا، فَإنَّهُ مَا سَلِمَ فِي دينه إلاَّ مَنْ سَلَّمَ للهِ عَزَّ وَجَلَّ وَلرَسُولِه صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم، وَرَدَّ علْمَ مَا اشْتَبَهَ عَلَيْهِ إلى عَالِمِهِ ):

لێرەدا نووسەر دێتە سەر باسێکی دیکە کە مەسەلەی دیترانی خوایە لە بەهەشتدا لەلایەن بڕوادارانەوە، دەڵێ: دیتن (واتە: دیترانی خوا) هەقەو ڕاستە بۆ ئەوانەی کە خاوەنی بەهەشتن (بەهەشتییەکان خوای خۆیان دەبینن) بەڵام (بِغَيْرِ إحَاطَةٍ ولا كَيْفيَّةٍ)، بەبێ ئەوەی کەبەو دیتنە بتوانن دەوری خوا بدەن، وە بەبێ ئەوەی کەچۆنییەتییەکەی لەلای ئێمە مەعلووم بێ، بزانین چۆنە؟ (كَمَا نَطَقَ بِهِ كِتَابُ رَبِّنَا)، وەك کتێبی پەروەردگارمان باسی کردوە، بۆچی نووسەر دەڵێ: خوا دەبینرێ لە بەهەشتی‌و بەهەشتییەکان دەیبینن؟ چونکە

كتێبی خوا لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾﴾ القيامة، چەند ڕوویێك لە ڕۆژی قیامەتدا گەشاوەن، ﴿نَّاضِرَةٌ﴾، یانی: گەشاوەن پڕ شوعلەن، نوورانیین، ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾، تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەكەن، چەند ڕوویێك لە ڕۆژی قیامەتێ گەش‌و جوانن، تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەكەن، (وَتَفْسِيرُهُ عَلَى مَا أَرَادَهُ اللهُ تَعَالَى وَعَلِمَهُ)، تەفسیرو لێكدانەوەی ئەو ئایەتەش (كە بڕواداران خوای خۆیان دەبینن‌و بە هۆی ئەو دیتنەوە ڕوویان گەش‌و جوان دەبێ) بەو شێوەیە كە خوا خۆی ویستوویەتی و بەو شێوەیە كە بە خۆی دەیزانێ، یانی: ئێمە بە وردیی نازانین خوا چۆن دەبینرێ؟ بەڵام مادام خوای پەروەردگار دەفەرموێ: دەبینرێ، دەبینرێ‌و تەواو، (وَكُلُّ مَا جَاءَ فِي ذَلِكَ مِنَ الحَدِيثِ الصَّحِيحِ عَنِ الرَّسُولِ فَهُوَ كَمَا قَالَ)، هەر شتێك لەو بارەوە كە هاتوە لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەوە بەو شێوەیە كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی، (وَمَعْنَاهُ عَلَى مَا أَرَادَ)، ماناو واتای ئەو فەرموودانەش بەو شێوەیە كە پێغەمبەر ویستوویەتی (لا نَدْخُلُ فِي ذَلِكَ مُتَأَوِّلِين بِآرَائِنَا)، ئێمە ناچینە نێو ئەو بابەتەوە، بێین ئایەتەكان، یان فەرموودەكان تەئویل بكەین، بێین ماناكانیان بگۆڕین، بە ڕاو بۆچوونی خۆمان، (وَلاَ مُتَوَهِّمِينَ بِأَهْوَائِنَا)، هەروەها بە خەیاڵ‌و ئارەزووی خۆمان مانایان بۆ ناتاشین، بۆچی؟ دەڵێ: چونكە لە دین‌و مسوڵمانەتیی خۆیدا (فَإِنَّهُ مَا سَلِمَ فِي دِينِه إلاَّ مَنْ سَلَّمَ للهِ عَزَّ وَجَلَّ وَلِرَسُولِه؟) پارێزراو سەلامەت نابێ، لە هەڵەو لادان، مەگەر ئەو كەسەی خۆی تەسلیمی خواو پێغەمبەری خوا دەكات، هەرچی ئەوان فەرموویانە دەڵێ: (سَمْعاً وَطَاعَةً)، بەسەر دڵ‌و چاو وەریدەگرم، بێ ئەوەی بڵێ: ئاخر چۆن وا دەبێ‌و چۆن وانابێ‌و بۆچی؟ ، چونكە دوای ئەوەی تۆ زانیت خوایەك هەیەو، ئەو خوایە پێغەمبەری ناردوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ئیدی هەرچی ئەو پێغەمبەرە لەسەر زمانی ئەو خوایە فەرمووی، با عەقڵی تۆش لە هەموو شتێكی حاڵی نەبێ، تازە دەبێ تۆ تەسلیم بی، چونكە تۆ پێشێ ڕێگات لە خۆت گرتوە، تۆ دەڵێی: خوا لە من زاناترە، دەڵێی: من دروستكراوی خوام، هەرچی خوا بیفەرموێ، دیارە ڕاستە، با تۆش تێی نەگەی،

ئنجا ئەگەر هەر شتێك خوا بیفەرمویٚ، ئێمەش تێی بگەین، مانا وایە دەبیٚ هێندەی خوا عیلممان هەبیٚ، بەڵام نەخێر، ئێمە مەخلووقێکین ئەوەش کە خوا ناردوویەتی، بایی ئەوەندە کە ژیانی ئێمە پێویستی پێیەتی، تێی دەگەین، بەڵام تەنیا کەسێك بەتەواویی وەك پێویست لە کەلامی خوا تێدەگات (جل جلاله) کە هێندەی خوا زانیاری هەبیٚ، چونکە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) دەفەرمووێ: ﴿أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ...(٦)﴾الفرقان، واتە: بڵێ: کەسێك قورئانی ناردووە کە نهێنی ئاسمانەکانو زەوی دەزانێ، بۆیە تۆ وەختێك لە هەموو قورئان تێدەگەی کە نهێنی هەموو ئاسمانەکانو زەوی بزانی، ئەوەش زانیاری خوای دەوێ ! پاشان دەڵێ: (وَرَدَّ عِلْمَ ما اشْتَبَهَ عَلَيْهِ إلى عالِمِهِ)، واتە: ئەو شتانەی کە تێیان ناگاتو لێی تێکەڵ دەبن، زانیارییەکەی دەگێڕێتەوە بۆ زانای خۆی کە خوایە پاشان پێغەمبەری خوایە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمِ).

ئنجا فەرموودەش دەربارەی ئەوە کەخوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) لە بەهەشتدا دەبینریٚ، ئیمانداران دەیبینن، زۆرن، بۆ وێنە:{ عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ كُنَّا جُلُوسًا لَيْلَةً مَعَ النَبِيِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةَ أَرْبَعَ عَشْرَةَ، فَقَالَ إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا لا تُضَامُونَ فِي رُؤْيَتِهِ }حديث صحيح.(١)

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بیٚ) دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دانیشتبووین تەماشای مانگی کرد، لە شەوی چواردە دابوو، فەرمووی: ئێوە پەروەردگاری خۆتان دەبینن، وەك چۆن ئەم (مانگ)ە دەبینن، قەڵەباڵغیی ناکەن لە دیتنەکەیدا.

یانی: پێویست بەوە ناکات کە کەڵەکە بکەن، یان بە مانای ئەوە دێ: تووشی زیان و زەرەر نابن لە دیتنیدا، یان هەورو تەمێك نایەتە بەرچاو لە دیتنی خوای پەروەردگاردا، هەڵبەتە فەرموودەی دیکەش هەن، بەڵام ئێمە هەر بە کورتیی ئەو فەرموودەیەمان نەقڵ کرد.

---

١) رَوَاهُ الْبُخَارِي برقم: (٥٥٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢١١).

ئنجا ئایا ئەوانەی كە دەڵێن: خوا لە قیامەتێ نابینرێ، كێ و كێن؟

١) موعتەزیلە (قەدەرییە).

٢) شیعە.

٣) جەهمییە.

٤) خەواریج.

ئەوانە هەموویان دەڵێن: خوا لە بەهەشت نابینرێ، ئنجا ئایا بەڵگەیان چییە لەسەر ئەوە؟ دەڵێن: كاتێك مووسا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) داوا لە خوای پەروەردگار دەكات كە خۆی پێشاندا، خوا دەفەرموێ: ﴿... قَالَ لَن تَرَىٰنِي ... ﴿١٤٣﴾﴾ الأعراف، ئەی مووسا من نابینی، دەڵێن: (لَنْ)، ئامرازی (نَفي)یەو بۆ (تأبيد)و (تأكيد)ە، یانی: بە تەئكید بۆ هەمیشە من نابینی، ئەو ئایەتە كە لە سوورەتی (الأعراف) دایەو خوای بەرزو بڵند دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَ ... ﴿١٤٣﴾﴾، واتە: كاتێ مووسا هات بۆ میقات (بۆ ئەو شوێنو كاتەی كە ئێمە بۆمان دیاریی كردبوو) قسەی لەگەڵ پەروەردگاری كرد، فەرمووی: ﴿... رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ ... ﴿١٤٣﴾﴾ الأعراف، واتە: پەروەردگارم خۆتم پێشان بدە، بتبینم ﴿... قَالَ لَن تَرَىٰنِي ... ﴿١٤٣﴾﴾ الأعراف، خواش (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) فەرمووی: نامبینی، ئەوە دەكەنە بەڵگە!

********

## ئەهلی سوننەت و جەماعەت بەرپەرچی قسەی نكووڵییكەران لە دیتنی خوا دەدەنەوە:

١)- هەر بەو ئایەتە بەرپەرچیان دەدەنەوەو دەڵێن: جارێ مادام گونجاوە مووسا قسە لەگەڵ خوادا بكات، دەشگونجێ كە خوای بەرزو مەزن ببینرێ.

٢)- دەڵێن: مادام مووسا داوا لە خوای پەروەردگار دەكات كە خۆی پیشان بدات، بێگومان پێغەمبەرێكی پایە بەرزی وەك مووسا كە لە (أُولوا العَزْم)ە، دەزانێ چ شتێك بۆ خوا دروست (جائِز)ەو، چ شتێك بۆ خوای بەرز موستەحیلە، ئنجا ئەگەر دروست نەبا خوا ببینرێ، نەیدەگوت: خوایە! خۆتم پیشان بدە.

٣)- دەڵێن: ئنجا مووسا كە دەفەرمویێ: ﴿رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ﴾، خوای پەروەردگار چی وەڵام دەداتەوە؟ خوا نافەرموێ: نابینرێم، بەڵكو دەفەرموێ: ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾ نامبینی، ئەگەر كەسێك بڵێ: ئەرێ ئەو خواردنە تۆزێكی بخۆم؟

دوو وەڵام هەن:

أ- بڵێی: ئەو خواردنە ناخورێ، یانی: نە بەتۆو نە بە هیچ كەسی دیكە ناخورێو قابیلی خواردن نیە.

ب- بەڵام، ئەگەر بڵێی: تۆ نایخۆی، یانی: تۆ نایخۆی، یان ئێستا ناتدەمێ، ئەگەرنا، مەرج نیە دوایی نەیخۆی، یان تۆ نایخۆیو بەشت پێوە نیە، شەرت نیە خەڵكی دیكە نەیخوا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾، واتە: تۆ نامبینی، یانی ئێستا لە دنیادا ناتوانی بمبینی، بەڵام (تأبید)ەكە، كە دەفەرموێ: (لَن)، ئەوە بۆ دنیایە، نەك بۆ قیامەت، چونكە ئەو یاساو دەستوورانە خوای

پەروەردگار مەبەستی پێیان دنیایە، لە قیامەتیشدا كۆمەڵێك دەستوورو یاسای دیكە دێنە گۆڕێ.

٤)- بەڵگەیەكی دیكە، ئەوەیە كەخوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ...وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ ... ﴿١٤٣﴾ ﴾ الأعراف، واتە: (بە مووسا دەفەرموێ): تەماشای ئەو كێوە بكە، ئنجا ئەگەر لە شوێنی خۆی ڕاوەستا، ئەوە دەتوانی بمبینی، زانایان دەڵێن: مادام خوای زانا دیترانی خۆی بەستۆتەوە بە شتێكی گونجاوەوە، شاخ لە شوێنی خۆی بوەستێ، شتێكی گونجاو (ممكن)ە كەواتە: دیترانی خواش گونجاوە.

٥)- دەڵێن: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ...فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا ... ﴿١٤٣﴾ ﴾ الأعراف، واتە: كاتێك خوا خۆی بۆ شاخەكە دەرخست ، شاخەكە پارچە پارچە بوو، دەڵێن: مادام گونجا خوای بێ وێنە خۆی دەربخات بۆ ئەو شاخە، شاخێكی بێ گیانو بێ ئیرادە، دەشگونجێ خۆی بۆ بەندەكانی خۆی دەربخات، بۆ بڕوادارانی خۆشەویستی خۆی.

## بەڵگەیەكی دیكە لەسەر نەدیترانی خواو بەرپەرچدانەوەی:

بەڵگەیەكی دیكە، كە خەواریج و موعتەزیلە و شیعە دەیهێننەوە، لەسەر ئەوە كەخوا نابینرێ، ئەو ئایەتەیە كە لە سوورەتی (الأنعام)دا خوای بێ هاوتا دەفەرموێ: ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ ... ﴿١٠٣﴾ ﴾ واتە: چاوەكان خوا نابینن، خوا چاوەكان دەبینێ!

بەڵام ئەهلی سوننەت، وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن:

یەك/ ئەوە بۆ دنیایە، واتە: لە دنیادا چاوەكان خوا نابینن، دنیا دەستوورو قانوونی تایبەت بەخۆی هەن، دنیا شوێنی تاقیكردنەوەیە، خوا ئینسانی وا نەخوڵقاندوە كە بتوانێ ببینێ بۆ ئەوەی كە تاقی بكرێتەوە، ئەگەر ئینسان خوای بینیبایە، تاقی نەدەكرایەوە، بەڵام لە بەهەشتێ كە قۆناغی تاقیكردنەوە بەسەر چووەو گەورەترین لەززەتیش دیتنی خوای بەرزە، خوا بە شێوەیەك ئینسان دەخوڵقێنێ كە بتوانێ بیبینێ.

دوو/ دەڵێن: خوای پەنهانزان نەیفەرموە: (لا تَرَاهُ الأَبْصَار)، بەڵكو دەفەرموێ: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ... ﴿١٠٣﴾ ﴾الأنعام، ئنجا (إدراك و إبصار) لە عەرەبیدا جیان، دیتن (إبصار) ئەوەیە كە تۆ شتێك ببینی، بەڵام ئیدراك ئەوەیە كەبە تەواویی دەوری شتێك بدەی، ئێمەش گومان كە هیچ كەسێك كە خواش دەبینێ، ناتوانێ وەك پێویست بیبینێ، دەورەی بدات، (أدركه) یانی: بە شێوەیەك دیتی كە هیچ پەنهانییو نەدیوی تێدا نەمابێ، كەسیش بەو شێوەیە خوا نابینێ. كەواتە: خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) دیتنێكی ئیحاطەیی نەفی كردوە، نەك دیتنێكی ئاسایی، ئنجا مادام ئەو فەرموودە صەحیحانەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هەن، هیچ كەس بۆی نیە لەو بارەوە مشتومڕ بكات.

شایانی باسیشە ئێمە وێڕای هەردووك كتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی...) بەرگی (٥)و (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) بەرگی (٥)، بەرگی پێنجەمی: (تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز)یش كە سوورەتی (الأنعام)ی گرتۆتە خۆی، لە كاتی تەفسیر كردنی ئایەتی: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ باسێكی وردمان لەو بارەوە كردوەو، بەرپەرچی قسەو بەڵگەكانی نكوڵییكەرانی بینینی خوای بەرزو بێ هاوتامان داوەتەوەو، وێڕای ئەوەش باسی بینینی خوا عزوجل

بەچاوی سەر لە دنیادا، لەلایەن پێغەمبەری خاتەمەوە لە شەوی میعراج داو، بینرانی خوا لەخەون داو...هتدمان کردوە.

ئنجا هەر بەبۆنەی باسکردنی دیترانی خوای بەرزو مەزنەوە لـە بەهەشـتدا، نووسـەر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێویستە مرۆڤـی مسوڵمان لەسەر بناغەی گەردنکەچیی بۆ خواو، خۆسپاردنی بە وەحیو شەریعەتەوە، لە هەڵە پارێزراو (مَعْصـوم)ەکەی متمانەو باوەڕی تەواوی بە خواو پێغەمبەرەکەی و فەرمایشتەکانیان هەبێو، لێیان دڵنیاو پێیـان پشت ئەستووربێ، بەهەر پشوە بایەکی شوبهەو گومانێك نەلەقێو نەلەرزێ !

> ٣٦) ( وَلا تَثْبُتُ قَدَمُ الإِسْلاَمِ إِلاَّ عَلَـى ظَـــهْرِ التَّسْـلِيمِ وَالاسْــتِسْلامِ، فَمَنْ رَامَ عِلْمَ مَا حُظِـرَ عَنْهُ عِلْمُهُ، وَلَـمْ يَقْنَعْ بِالتَّسْلِيمِ فَهْمُهُ، حَجَبَهُ مَرَامُهُ عَنْ خَـالِصِ التَّوْحِيـدِ، وَصَافِي الْمَعْرِفَةِ، وَصَحِيحِ الإِيمَانِ، فَيَتَذَبْذَبُ بَـيْنَ الْكُفْـرِ وَالإِيمَانِ، وَالتَّصْدِيقِ وَالتَّكْـذِيبِ، وَالإِقْـرَارِ وَالإِنْكَـارِ، مُوَسْوَسَاً تَائِهَاً، زَائِغَاً شَاكَّا، لا مُؤْمِنًا مُصَدِّقًا، وَلا جَاحِـدَاً مُكَذِّبَــــاً ):

بەر لەوەی بچینە سەر شیکردنەوەی چەمكو واتای یەك یەكی قسـەكانی، مەبەسـتی گشتییو سەرەكیی قسەكانی دەخەینە ڕوو:

دەڵێ: ئینسان ئەگەر بیەوێ بەچاكیی ئیسلام وەربگرێو بە شوێنكەوتەی ئیسـلام لـە قەڵەم بدرێ، دەبێ بۆ خوا گەردنكەچو ملكەچ بێو پابەند بێ بە هەرشتێكەوە كە لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّم) هـاتوە، ئنجـا ئـەوەی كـە لەلایـەن خـواو پێغەمبەرەوە دێ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەیەقین بۆی دەركەوێ، كە ئەوان ناردوویانە تێـی دەگا، یان تێی ناگا، لە هەمووی حاڵی دەبێ، یان نا، لەبەرچاوی ڕۆشن دەبێتەوە، یان نا؟ گرنگ ئەوەیە مادام دەزانێ كە ئەوە خوا فەرموویەتی، دەبێ بڵێ: (سَمِعْنَا وَأَطَعْنَـا) كـە

زانیت ئەوە لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هاتوە، دەبێ بڵێی: بەسەر سەرو بەسەر چاوم، مادام پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی، بڵێ: من بە بەڵگە بۆم دەرکەوتوە، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وەك خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝٣﴾ النجم، واتە: لە ئارەزووی خۆیەوە قسە ناکات، با منیش وەك پێویست لە قسەکەی حاڵی نەبم، با نهێنی قسەکانی هەموو نەزانم، با حیکمەتو دیوە پەنهانەکانی هەموو نەزانم، مادام پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی، ئەوە من بەڕاستی دەزانم، ئینسان بەبێ ئەوە، بە مسوڵمانو بڕوادار لە قەڵەم نادرێ، هەر کەسێك بڵێ: من بڕوا بە قسەی خوا ناهێنم، بڕوا بە فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ناهێنم، هەتا تەواو لێی حاڵی نەبمو لە هەموو کونو کەلەبەری نەگەم، لە هەموو نهێنییەکانی حاڵی نەبم ! ، مانای وایە ئەو ئینسانە عەقڵی خۆی کردوە بە خوای خۆیو هەر شتێك عەقڵی پێی ڕازی نەبێو عەقڵی تێی نەگات، ئیمانی پێ ناهێنێ، بەڵام نەخێر، جیاوازیی نێوان مسوڵمانو کافر هەر ئەوەیە، مسوڵمان دەڵێ: من دوای ئەوەی کە زانیم خوایەك هەیەو پەروەردگارێك هەیە، زانیم کە خوا، پێغەمبەری (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ناردوە، ئەوە هەرچی لەو خواو پێغەمبەرەوە بەمن گەیشتبێ، تێی بگەمو تێی نەگەم، حیکمەتو نهێنییەکانی بزانمو نەزانم، بۆی ملکەچم، چونکە من لەولاوە ڕێم لە خۆم گرتوە کە بەرهەڵست بم، چونکە گوتوومە: خوایە! تۆ پەروەردگارو خاوەنی منی، ئنجا مادام خوا پەروەردگارو بەدیهێنەری تۆبێ، بێگومان لە تۆ زاناترو بە تواناترو لە تۆ هەموو شتێك ترە، بەڵکو تۆ لە بەرانبەر خوادا، هەر هیچ نی، پێغەمبەریش مادام پێغەمبەری خوابێ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، دیارە لە هەموو مەسەلەیەکدا لەوسەری دێتەوە.

کەواتە: مەرجی خوا پەرستیی ئەوەیە کە مادام خوا پەرستراوی تۆیەو پەروەردگاری تۆیە، دەبێ ئەوەندە ئەدەبو ڕێزەت لە بەرانبەریدا هەبێ، کە با شتێك تەواو لێی حاڵی نەبیو سەری لێدەرنەکەی، بەڵام مادام خوا فەرموویەتی، تازە تەواو، هەتا ئینسان جیا لە مەسەلەی دین، لە مەسەلەی دنیایەتییدا، بۆ وێنە: خەڵکێك لە دێیەکدا ڕیش سپییەکیان

هەیە، سەرۆك عەشیرەتێکیان هەیە، پێیان دەڵێ: خۆتان بپێچنەوە دەچینە فلان شوێن، بۆچی؟ دەڵێ: خۆتان بپێچنەوەو تەواو، بەردەوام سەیردەکەی ئەوانەی شوێنکەوتە (أتباع)ن، گومانی چاك (حسن الظن)و متمانەیان هەیە بە پەیڕەویی لێکراو (متبوع)ەکەی خۆیان، دیارە جاری واش هەیە بە هەڵەیاندا دەبات، بەڵام ئێمە دڵنیاین کە خوای ئێمە بەبەزەیی ترین کەسی ئێمەیە، پێغەمبەری ئێمە(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دڵسۆزترین کەسو ڕاسترین کەسە لەگەڵ ئێمەدا . کەواتە: دەبێ تەسلیمیان بین‌و هەرچی ئەوان فەرموویانە، دەبێ تەسلیمیان بین، دەبێ دڵنیاش بین لەوەی کە هەرچی ئەوانە دەیفەرموون، ڕاستو تێرو تەواوە، پڕیشە لە حیکمەتو شتی بەجێ کە سوودو قازانجی دنیاو قیامەتی تێدایە، ئەگەر لەلای ئێمەش دیارو زانراو نەبێ [1].

ئێستاش با دەست بکەین بە شیکردنەوەی قسەکانی (الطحاوي):

دەڵێ: (فَمَنْ رَامَ)، یانی: (فَمَن قصد) هەر کەسێك بیەوێ بە دوادا بگەڕێ، بە دوای چیدا؟ (عِلْمَ مَا حُظِـرَ عَنْهُ عِلْمُهُ) بە دوای زانیاریی‌و شارەزایی دەربارەی ئەو شتەدا بگەڕێ کە زانیاری وی لێ قەدەغەکراوە، وەك ئەوەی بیەوێ بزانێ خوا چۆن دەبینرێ؟ خوا چۆن شتی خوڵقاندوە؟ خوا چۆن ئینسان زیندوو دەکاتەوە؟ یان پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) چۆن لە شەوی میعراج دا بەرز بووەوە بە ئاسمانەکاندا؟ هەر کەسێك بیەوێ ئەو شتانە بزانێ کە شارەزایی‌و زانست دەربارەی ئەو شتانەی لێ مەنع کراوە، لەبەرچی؟ چونکە پێویستی پێی نیە، ئێمە لە دنیادا بۆ جێنشینایەتیکردنی خواو، جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خواو تاقیکردنەوە خوڵقاوین.

---

١) دیارە هەڵوێستەکەی (إبراهيم) عليه السلام: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ۖ قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا ۚ وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ ﴾ البقرة، گەورەترین پەندی تێدایە کە هەتا دەتوانین دەبێ هەوڵبدەین لە نهێنییەکانی شەریعەت تێبگەین. کەواتە: نابێ وا لەو قسانەمان بفامرێتەوە کە مەبەست لە تەسلیم بوونمان بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەرو شەریعەتەکەیان، ئەوەیە کە بیر لە حیکمەتو نهێنییەکانی شەریعەتو ئامانجەکانی نەکەینەوە!

کەواتە: یەکمان لەسەر ئەوە نەکەوتوە هەموو شتێك بزانین، نهێنییەکانی هەموو شتێك بزانین، پێویستیمان پێی نیە. بۆ وێنە: دەربارەی ڕووح، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾ ﴾الإسراء، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ڕووح، بڵێ: ڕووح شتێکە پەیوەندیی بە کاری پەروەردگارمەوە هەیە، ئەندازەیەکی کەم نەبێ، زانیارییتان پێ نەدراوە، (بەو ئەندازە کەمەش ماهییەت‌و حەقیقەتی ڕووحی پێ دەرك ناکەن)، بەڵام ئایا ئینسان یەکی لەسەر ئەوە کەوتوە، بزانێ ڕووح چییە، ئەوجار خوا بپەرستێ، ئەوجار دینی خوا بەڕێوەبەرێ؟ نەخێر، یەکی لەسەری نەکەوتوە، بۆیە خوا فێری نەکردووین، ئەگەر ئینسان هەموو شتێکی زانیبا، هەموو شتێکی بۆ مەعلووم بوویا لە دنیادا، ئەو کاتە بێگومان تاقیکردنەوەکەی ئەنجامێکی مسۆگەری دەبوو، ئینسان خوای بینیباو نهێنییەکانیشی- بۆ وێنە: نهێنی قەزاو قەدەری- زانیبایە، ئەو کاتە گەردنکەچیی ئینسان بۆ فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئازایەتیی نەدەبوو.

عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: { لَوْ كَانَ الدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ أَسْفَلُ الْخُفِّ أَوْلَى بِالْمَسْحِ مِنْ أَعْلاَهُ }(أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (١٦٢)، وَصَحَّحَهُ الألباني).

واتە: ئەگەر دین بە ڕاو بیرو بۆچوون (ی ئینسان بوایە، هەرچی ئینسان بۆ خۆی تێینەگەیشتبایە بەدوای نەکەوتبایە)، ئەوە خوف (کە چەرمێکە لە پێ دەکرێ) ژێرەکەی لەپێشتر بوو بۆ مەسح کردن لە پشتەکەی (کە فەرزیشە پشتەوەکەی مەسح بکرێ)، ئەگەر بەعەقڵ بوایە، دەبوو ژێرەوەی مەسح بکرێ، ، چونکە ئینسان لەسەر ژێرەکەی دەڕوا.

کەواتە: مەرج نیە ئینسان حیکمەت و نهێنی هەموو شتێکی شەریعەت بزانێ، ئنجا دوای بکەوێت، ئەگەر وابێ لە بەندایەتیی دەچێتە دەرێ، بۆیە دەڵێ: (فَمَنْ رَامَ عِلْمَ مَا حُظِرَ عَنْهُ عِلْمُهُ) هەر کەسێك بیەوێ شارەزایی دەربارەی ئەو شتانە پەیدا بکات کە لێی قەدەغەکراون پێی نەدراوە، (وَلَمْ يَقْنَعْ بِالتَّسْلِيمِ فَهْمُهُ)، عەقڵ‌و تێگەیشتنی وی، قەناعەتی نەکرد بەوەی کە تەسلیم بێ بە فەرمانی خواو، گومانی چاکی بێ بە فەرمانی

خواو، متمانەی بەخواو پێغەمبەری خـوای بـێ، بلّـێ: ئـەوان شـتێکی خراپیـان بـەمن نەفەرمووە، ئەگەر بەوەندە قەناعەتی نەکرد، چی لێ دێ؟!، (حَجَبَهُ مَرَامُهُ) ئەو بـەدوادا گەڕان و ئەو ویستنەی ئەو، دەیگێڕێتەوەو بێ بەشی دەکاو مەحرومی دەکات، لـە چـی؟ (عَنْ خَالِصِ التَّوْحِيدِ) لە یەکتاپەرستیی بێ خلّتە، (وَصَافِي الْمَعْرِفَةِ) لە خواناسیی صافو بێ خەوش (وَصَحِيحِ الإِيمَانِ) لە ئیمانی ڕاستو دروستو تێرو تەواو، ئنجا ئایا لە ئەنجامی ئەوەدا چی لێ دێ کەسێك بیەوێ لە هەموو شتێك تێبگاتو هەموو نهێنییـەکانی دیـن بزانێ، ئەوجار خوا بپەرستێ؟! (فَيَتَذَبْذَبُ) دەکەوێتە لەرە لەر، (بَيْنَ الْكُفْرِ وَالإِيمَانِ) لـە نێوان کوفرو ئیماندا (وَالتَّصْدِيقِ وَالتَّكْذِيبِ) لـە نێـوان بەڕاسـت زانـین و بـەدرۆ زانینـدا (وَالإِقْرَارِ وَالإِنْكَارِ)، لە نێوان دان پیاداهێنان و نەسـەلـماندندا، ئنجا ئایا لە ئەنجامدا چی لـێ دێ ؟ (مُوَسْوَسًا تَائِهًا) دەبێتە ئینسانێکی خوتـخوتەداری سەرگەردان، (مُوَسْوِسَ) ئینسانێکە کە خوتخوتەو خەیـالاتو دالغەی بەسـەر دلّدا دێ (تـائِهاً) یانی سەرگەردان (زَائِغـاً شَاكًّا) لادراوو گوماندار، (لا مُؤْمِنًا مُصَدِّقًا) نـە دەبێتـە بڕوادارێـك کـە خـواو پێغەمبەری خوا بەڕاست بزانێ، (وَلا جَـاحِداً مُكَـذِّباً) نە دەبێتە نەسەلـمێنێکی خـواو پێغەمبەر بە درۆ زانیش، واتە: نە کافری موتلـەق دەبـێ، نە مسولّمانی بەهەق دەبێ.

بە حەقیقەت ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە کە ئینسانی بڕوادار، ئینسانی مسـولّمان جیاوازیی لەگەلّ غەیری مسولّمان دا ئەوەیە کە مسولّمان گومانی چاکی بەرانبەر بەخوای خۆی هەیە، مسولّمان متمانەی بەقسەی خواو پێغەمبەران هەیە، دلّنیایە لەوەی کە خواو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هیچ شتێك بـەو نـالێن، مەگـەر خێـرو خۆشـیی و قازانجی دنیاو قیامەتی تێدا بێ، خواو پێغەمبەری خوا، هیچ شتێك لەو قەدەغە ناکەن، مەگەر زەرەرو زیانی دنیاو قیامەتی تێدابێ.

کەواتە: هەر شتێکی لە خواو پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) پێگەیشـت، دەلّـێ لەسەر سەرو لەسەر چاو، بۆ وێنە: خوای زاناو شارەزا گۆشتی بـەرازی قەدەغـە کـردوە، دەفەرموێ: مەیخۆو تەواو، خوێن حەرامە، مردارەوە بوو حەرامە، فـلان شـتە حەرامـە، حیکمەتەکەی چییە؟ نهێنییەکەی چییە؟ تۆ پەکت لەسەر ئـەوە نەکـەوتوە، مـادام خـوا

فەرمووی، تازە تەواو، خوا كە خاوەنی تۆو خاوەنی ئەو شتەشە كە لە تۆی قەدەغە كردوە، ئەو دەفەرموێ: مەیخۆ، ئەمە وەك ئەوەی كە فەرزە، وەك بەندایەتییمان بۆ خوا بیكەین، ئەگەرنا خوا هەر شتێكی حەرام كردوە، زیانبەخشەو پیسە، وەك دەفەرموێ: ﴿... وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ...﴾ الأعراف، واتە: شتەپاكەكانیان بۆ حەڵاڵ دەكات و پیسەكانیان لێ قەدەغە دەكات، بەڵام گریمان، ئەگەر خوا ئێمە تاقی بكاتەوە، بەوەی شتێكی باشیشمان لێ قەدەغە بكات، هەر دەبێ بەقسەی بكەین، چونكە دروستكەرو خاوەنی ئێمەیە، ئەگەرنا، خوا هیچ شتێكی لە ئێمە قەدەغە نەكردوە، مەگەر زەرەرو زیانو خراپەی تێدا بێ، بەڵام ئەوە مەرجی سادەی ئیمانداریيە كە ئینسان گوتی: من ئیمانم بە خوا هەیە، دیارە دڵنیایە كە خوا لەو زاناترەو میهرەبانترەو كاربەجێیەو شتی نابەجێ ناكات، هەروەها پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مادام پێغەمبەری خوا بێ، ئەویش بەهەمان شێوە، بۆیە ئینسان دەبێ گەردنكەچو ملكەچ بێ بۆ هەر فەرمانێكی خواو پێغەمبەر، با بەتەواوییش نهێنییو حیكمەتی هەموو شتەكانیش نەزانێ.

دیارە ئەوەش هەمووی لەسەر (دیتنی خوا) هەڵدەستێ، دیتنی خوای بێ وێنە با ئێمەش نەزانین چۆنە، چۆنییەتییەكەی چۆنە؟ بەڵام مادام خوا ﷻ دەفەرموێ: بڕواداران لە بەهەشت خوای خۆیان دەبینن و تەماشای خوا دەكەن، بە ڕووی گەشەوە، تازە تەواو.

ئنجا هەر سەبارەت بە دیتنی خوای بەرز، پێویستە ئەوەش بڵێین: ئێمە لە دنیادا خوا دەناسین و زانستییمان بەبوونی هەیە، بەڵام ئایا عیلممان بە حەقیقەت و ماهیەتی خوا هەیە، وەك پێویست ؟ نەخێر، وەك پێویست خوا ناناسین، ئنجا وەك چۆن خوا دەناسین و زانیارییمان دەربارەی هەیە، بەڵام وەك پێویست حەقیقەتی خوامان بۆ كەشف نەبووە، لە قیامەتیش خوا دەبینین، بەڵام دیتنێك نا، كە دەوری خوا بدات، دیتنێك نا، كە حەقیقەتی خوامان هەموو بۆ كەشف بێت، بەڵكو هەركەسە بە ئەندازەی ئەوەی كە لەدنیادا خوای ناسیوە، لە قیامەتیش هەر ئەوەندەی دەبینێ، لە دنیا چەندەت خوا ناسیبێ و چەندە

زانیاریت هەبێ دەربارەی بوونی خواو ناوو سیفەتەکانی، لە قیامەتیش هێندەی دەبینی، لە قەدەر ئیمانی خۆت لە بەهەشتیٚ خوا دەبینی، جا کەم بێ کەمو، زۆریش بێ زۆر.

ئنجا نووسەر هەر لەسەر بابەتی دیتنی خوا بەردەوام دەبێو، بەو بۆنەیەشەوە دەچێتە سەر باسی هەندێك لە سیفەتەکانی خوا (عَزّ وجَلّ).

٣٧) ( وَلاَ يَصِحُّ الإِيمَانُ بالرُّؤْيَةِ لأَهْلِ دَارِ السَّلاَمِ لِمَن اعْتَبَرَهَا مِنْهُمْ بِوَهْمٍ، أَوْ تَأَوَّلَهَا بِفَهْمٍ، إِذْ كَانَ تَأْوِيلُ الرُّؤْيَةِ وَتَأْوِيلُ كُلِّ مَعْنًى يُضَافُ إِلَى الرُّبُوبِيَّةِ، تَرْكَ التَّأْوِيلِ وَلُزُومَ التَّسْلِيمِ، وَعَلَيْهِ دِينُ الْمُسْلِمِينَ، وَمَنْ لَمْ يَتَوَقَّ النَّفْيَ وَالتَّشْبِيهَ، زَلَّ وَلَمْ يُصِبِ التَّنْزِيهَ، فَإِنَّ رَبَّنَا مَوْصُوفٌ بِصِفَاتِ الْوَحْدَانِيَّةِ، مَنْعُوتٌ بِنُعُوتِ الْفَرْدَانِيَّةِ، لَيْسَ فِي مَعْنَاهُ أَحَدٌ مِنَ الْبَرِيَّةِ ):

واتە: بڕواهێنان بە دیتن (دیتنی خوای پەروەردگار) بۆ دانیشتوانی (دَار السَّلاَم) {کە ناوی بەهەشتە} ڕاستو تەواو نابێ (لِمَنِ اعْتَبَرَهَا مِنْهُمْ بِوَهْمٍ) بۆ کەسانێك کە ئەو دیتنە بەوەهم تەفسیر دەکەن، یانی: بە شێوەیەك لێکی دەدەنەوە وەك خەیاڵێك، بە وەهمو بۆچوونی خۆیان (أَوْ تَأَوَّلَهَا بِفَهْمٍ)، یاخود دیتنەکەی تەئویل دەکەن بە تێگەیشتنی خۆیان، بۆ وێنە: دەڵێن: مەبەست لە دیتن، دیتنی نیعمەتی خوایە، یان دەڵێن: مەبەست لە دیتن: زیاتر ناسینییەتی، ئەو جۆرە ئیمان پێبوونە بەدیتنی خوا کە بە وەهم ئیعتیبار دەکرێ، یان بە فەهمی خۆیان تەعبیری دەکەن، ئەو شێوە ئیمان پێبوونە، ئیمان پێبونێکی تەواو نیە، (إِذْ كَانَ تَأْوِيلُ الرُّؤْيَةِ)، چونکە تەئویل کردنی دیتنی خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ)، (وَتَأْوِيلُ كُلِّ مَعْنًى يُضَافُ إِلَى الرُّبُوبِيَّةِ تَرْكَ التَّأْوِيلِ وَلُزُومَ التَّسْلِيمِ)، مانا لێکدانەوەو ڕوون

کردنەوەی هەر مانایەك کە پاڵ دەدرێتە لای پەروەردگارێتیی، بەچی دەبیٚ؟ (تَرْكَ التَّأْوِيلِ) ئەوەیە کە تەئویلی نەکەی، هەر شتێك کە خوا (جَلَّ جَلالُهُ) پاڵی بداتـە لای خـۆی، وەك دیترانیو ناسرانیو هەموو سیفەتەکانی دیکەی، تەئویل کردنو لێکدانەوەی ئـەو مانـاو سیفەتانە کە خوا پاڵیان دەداتە لای خۆی، بەوە دەبیٚ کە تەئویلیان نەکەینو ڕاست چۆنن، ئاوایان بێنین، بەلاٚم ئایا چۆننو چۆن نین؟ چۆنییەتییەکەیان، خوا هەر بۆخۆی دەیزانیٚ، وەك جاری دیکەش باسمان کردوە، (وَلُـزُومَ التَّسْلِيمِ) مانـا لێکدانـەوەو تـەئویل کردنـی ئـەو سیفەتانەی کە پاڵ دەدرێنە لای خوا کە ئینسان گەردنکەچو تەسلیم بیٚ بـۆ هەرچـی کـە خوای پەروەردگار فەرموویەتی، (وَعَلَيْهِ دِينُ الْمُسْلِمِينَ) دینی مسوڵمانانیش هەر لەسـەر ئەو بناغەیە کە گوتمان (وَمَنْ لَمْ يَتَوَقَّ النَّفْيَ وَالتَّشْبِيهَ) هەر کەسێك خۆی نەپارێزیٚو خۆی دوور نەگریٚ، لەلابردنی ئەو سیفەتانەی کە خوا بۆ خۆی بڕیاریـان دەدا، یـان پێغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بۆی بڕیار دەدات، وە خۆی نەپارێزیٚ لە پێچواندنی خوا، زاتی، یان سـیفەتی بە مەخلوقەکانی، (زَلَّ وَلَمْ يُصِبِ التَّنْزِيـهَ) ئـەوە هەڵدەخلیسـکیٚو نـاتوانیٚ بەپاك گرتنی خوای بەرز بپێکیٚ، چونکە ئێمـە سـیٚ شـتمان هـەن: (النفـي، والتشـبيه، والتنزيه)مـان هەیە:

(النفي): ئەوەیە کەسیفەتێك لە سیفەتەکان لە خوای بیٚ وێنە لابەری.

(التشبيه): ئەوەیە کەسیفەتێك لە سـیفەتەکانی خـوا، وەك سـیفەتی دروسـتکراوێك تەماشابکەی.

(التنزيـه): ئەوەیە کە هەرچی خوا بۆ خۆی بڕیاریداوە، بۆی بڕیـار بـدەی، بـەلاٚم بـەو شێوەیە کە لەگەڵ خوا دەگونجیٚ، سیفەتەکانی بۆ بڕیار بدەی، هاوکات خواش بەپاك بگری لەوەی، کە وەك مەخلووقەکانی بچوێنی.

ئەوجار لە کۆتایی ئەو بڕگەیەدا دەڵیٚ: (فَإِنَّ رَبَّنَا جَل وَعَـلا) ، چـونکە پـەروەردگاری خاوەن پلەو پایەی بەرزو مەزنمان (مَوْصُوفٌ بِصِفَاتِ الْوَحْدَانِيَّةِ) وەسف کراوە بە هەموو ئەو سیفەتانەی کە تایبەتن بە یەکتایی یەوە (مَنْعُوتٌ بِنُعُوتِ الْفَرْدَانِيَّـةِ) مـەدح کـراوە بـەو

مەدحانەی کە تاکن (الوحدانيَّة) پەیوەندیی بەزاتەوە هەیە، (الفردانيَّة) پەیوەندیی بە سیفەتەوە هەیە، یانی: خوای بێ وێنە، چەند سیفەتێکی هەن کە تایبەتن بەزاتی خۆیەوە، چەند تایبەتمەندییەکی هەن کە تایبەتن بە سیفەتەکانی ئەوەوە (لَيْسَ فِي مَعْنَاهُ أَحَدٌ مِنَ الْبَرِيَّةِ) لە مانای خوای پەروەردگارداو لە مانای زاتو سیفەتیدا، هیچ کەسێکی دیکە لە دروستکراوەکانی بەو وەسفە نیە.

ئنجا هەر لەسەر خستنە ڕووی پێناسەو سیفەتەکانی خوا بەردەوام دەبێو، دەڵێ:

**٣٨- ( وَتَعَالَى عَنِ الْحُدُودِ وَالْغَايَاتِ وَالأَرْكَانِ وَالأَعْضَاءِ وَالأَدَوَاتِ، لاَ تَحْوِيهِ الْجِهَاتُ السِّتُّ كَسَائِرِ الْمُبْتَدَعَاتِ ):**

واتە: خوا بەرزە لە سنوورەکانو ئامانجەکانو پایەکانو ئەندامەکانو ئامرازەکان، وەك پەیداکراو (دروستکراو)ەکان، شەش لایەکان (سەرو خوار، ڕاستو چەپ، پێشو دوا) بیگرنە خۆیان.

ئەم قسانەی نووسەر پێویستییان بە ڕوونکردنەوەیەك هەیە:

ئاشکرایە نووسەر لێرەدا، هەر سەرگەرمی خستنە ڕووی سیفەتەکانی خوایە، ئنجا بۆ ئەوەی زیاتر ڕایبگەیەنی کە خوا لە هیچ ڕوویێکەوە وەك دروستکراوەکانی ناچێ، لێرەدا هەموو ئەو شتانەی کە سەرجەم دروستکراوەکان، بەتایبەت دروستکراوە بەرهەستو مادییەکان، پەکیان لەسەریان کەوتوە، ڕایدەگەیەنێ کە خوا (عَزَّ وَ جَلَّ) لەو شتانەی هەموویان دوورە، وەك:

١- الحدود، سنوورەکان، خوا وەك دروستکراوەکان سنووردار (محدود) نیە لە هیچ ڕوویێکەوە، بەڵکو بێ سنوور (لا محدود)ە.

٢- الغايات، ئامانجەکان، خوا هیچ ئامانجێکی نیە بۆی نیازمەند بێ.

٣- الأركان، پایەکان، خوا پێویستی بە پایەکان نیە لەسەریان بوەستێ.

٤- **الأعضاء، ئەندامەكان**، خوا لە ئەندامەكان پێك نەهاتوە (يد)و (وجه)، ئەوانەش سیفەتن بەو شێوەیەی كە بۆخوا شایستەن، یان واتایەكی گونجاویان هەیە.

٥- **الأدوات، ئامڕازەكان**، خوا پێویستی بە ئامڕازان نیە بۆ ئەنجامدانی كارەكانی، چونكە بە هەر شتێكی فەرموو: ببە، یەكسەردەبێ، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٨٢﴾ يس.

هەڵبەتە مەبەستیش لە (كُن فَيَكُونُ) بە ڕای زانایانی ڕۆچووەوە، خستنە ڕووی خێرایی كاركردنی ویست (إرادة)ی ڕەهای خوایە، نەك گوتنی وشەی: (كُن) ببە!

٦- **الجهات الستة، شەشە لایەكان**، واتە: سەرو خوار، ڕاستو چەپ، پێشو پشت، دیارە هەر دروستكراوێك بگری، هەردەبێ بەو شەش لایە (الجهات الستة) ئاماژەی بۆ بكەیو دەكەوێتە نێو جوغزیانەوە، بەڵام خوا ، چونكە لە دەرەوەی كاتو شوێن (الزّمان والمكان)ە، ناشكەوێتە نێو جوغزی شەش لایەكان بەو چەمكو واتایەی كە بۆ دروستكراوەكان بەكاردێ، ئەگەرنا، خوا لەسەرەوەی دروستكراوەكانییەتیو لەسەر عەرشە بەو شێوەیەی كە بۆی شایستەیە.

*******

ئەمجارە نووسەردێتە سەر باسی بابەتێکی دیکە کە بریتیە لە{شەو ڕۆو بەرز بوونەوە}ی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، دیارە وشەی (الإسراء) یانی سەفەری شەو (السفر ليلاً)[1]، چونکە ئەو سەفەرەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەشەو بووە: ﴿ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ...﴿١﴾﴾ الإسراء.

وشەی (معراج) لەسەر کێشی (مفتاح)، یانی: کلیل، ئەوەی کەدەرگای پێ دەکرێتەوە، (معراج) یانی: (آلة العروج) ئەوەی کەئینسان پێی سەردەکەوێ، بەڵام لە بەکارهێنانی خەڵکیدا کە دەگوترێ: میعراج، یانی: بەرز بوونەوەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، دەنا ئەسڵی وشەی میعراج، یانی ئەو ئامرازو وەسیلەیەی کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) پێی بەرز بۆوە[2] کە لە هەندێك فەرموودەدا (بُراق)ی پێ دەگوترێ.

> ٣٩) (وَالْمِعْرَاجُ حَقٌّ، وَقَدْ أُسْرِيَ بِالنَبِـيِ، وَعُرِجَ بِشَخْصِهِ فِـي الْيَقَظَـةِ إِلَى السَّمَاءِ، ثُمَّ إِلَى حَيْثُ شَاءَ اللهُ مِنَ الْعُـلاَ، وَأَكْرَمَهُ اللهُ بِمَا شَاءَ، وَأَوْحَى إِلَيْهِ مَـا أَوْحَـى ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾﴾ النجم، فَصَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ فِـي الآخِرَةِ وَالأُولَى):

واتە: بڕوامان وایە، ئەو ئامرازەی کە پێغەمبەری (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) پێ بەرز بۆوە، یان هەر ئەصڵی بەرز بوونەوەکەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەرەو ئاسمانەکان،

١) المعجم الوسيط، ص ٤٢٨.
٢) المعراج: المِصعَدُ والسُّلَّمُ وما عَرِجَ عليه الرسول (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ليلة الإسراء. المعجم الوسيط ص ٥٩٢.

هەقەو ڕاستە (وَقَدْ أُسْرِيَ بِالنَبِـيِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)) شەوڕۆ بە پێغەمبەر کراوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سەفەرەکەی بەشەوێ بووە، (وَعُرِجَ بِشَخْصِـهِ فِـي الْيَقَظَـةِ إِلَـى السَّمَاءِ) پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەشەخصی خۆی (یـانی: بـەڕووحو جەسـتەوە) لـەکاتی بەخەبەریی و بێدارییدا، بەرزکراوەتەوە بەرەو ئاسمان، (ثُمَّ إِلَى حَيْثُ شَاءَ اللهُ مِـنَ الْعُـلاَ) دوایی بەرەو هەر شوێنێك کە خوا ویستوویەتی لەبەرزیی، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتوە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەهەر حەوت ئاسمانەکان سەرکەوتوەو، دوایـی زیاتریش بەرزکراوەتەوە (وَأَكْرَمَهُ اللهُ بِمَا شَاءَ، وَأَوْحَى إِلَيْهِ مَا أَوْحَى) خوا ڕێزیگرت بەوەی کە خۆی ویستی ڕێزی لێبگرێ،خوا ئەوەی بەپێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ڕاگەیاند کە هەر بۆخۆی دەزانێ، وەك دەفەرموێ: ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾﴾ النجم، واتە: دڵی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەوەی بینی، تێیدا بەهەڵەدا نەچوو بوو، تێیدا تووشی درۆ نەبوو بوو.

(فَصَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فِـي الآخِـرَةِ وَالأُولَـى)، صـەلات و سـەلامی خـوا لەسـەر پێغەمبـەربێ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە دوا ڕۆژو لە دنیادا، دیارە (صلاة) مـەدحو سـەنای خوایە، (سلام)یش خێرو خۆشییو سەلامەتییو ئاشتی خوایە، بۆ سەر پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) [1].

******

١) بۆ زیاتر تێگەیشتن لە چەمكو واتای: (صلاة) و (سلام) و (بركات) و (تحيات)، بڕوانە بەرگی دووەمی (خوا پەرستیی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەت دا).

## پوختەیەك لەبارەی شەوڕۆو بەرزبوونەوەی پێغەمبەرەوە ﷺ

زانایان دەربارەی (ئیسڕاو میعراج) شەوڕۆو بەرز بوونەوەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەسەر چەند شتێك كۆكن‌و، لەسەر هەندێ شتانیش، ڕایان جیاجیایە:

هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە لە قۆناغی مەككەدا بووە، بەڵام ئایا لە چ كاتێكدا بووە، ئایا هەر جارێك بووە؟ ڕاجیاییان هەیە، هەندێكیان تەنانەت گەیاندوویانەتە چوار جار، هەندێكیان دەڵێن: دوو جار بووە، بەڵام ئەوەی زیاتر بەڵگەكان پشتیوانیی لێدەكەن، ئەوەیە كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) یەك جار ئەو سەفەرە گەورەو مەزنەی پێكراوە، ئەویش لە قۆناغی مەككەدا بووە، وەك هەموویان لەسەری كۆكن، ساڵێك، یان دوو ساڵ، یان سێ ساڵ پێش ئەوەی كۆچ بكات بۆ مەدینە، واتە: ساڵی دەیەم، یان یازدەیەم، یان دوازدەیەمی پێغەمبەرایەتیی (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم).

ئنجا زانایان لەوەشدا ڕایان لێك جیایە، كە ئایا ئەو شەوڕۆو بەرز بوونەوەیەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەس بەڕووح بووە؟ یان بە جەستەو بە ڕووح بووە؟ یان لە خەویدا بووە؟ لەوبارەوە سێ ڕا هەن:

ڕای یەكەم: بەشێك دەڵێن: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەو سەفەرەی هەر بە خەون كردوە، كە ئەو ڕایە زۆر بێهێزە.

ڕای دووەم: بەشێك دەڵێن: لە كاتی بێداریيداو بە ئاگاییدا بووە، بەڵام بەس ڕووحەكەی ئەو سەفەرەیكردوەو جەستەكەی لەوێ ماوەتەوە.

ڕای سێیەم: بەشێكیشیان كە هەڵبەتە زۆربەیانن، دەڵێن: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە جەستەو بە ڕووح ئەو سەفەرەی كردوە، ڕای ئەوانیش بەهێزترەو، بەڵگەكان زیاتر پشتیوانیی لێدەكەن:

بەڵگەی یەکەم: لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە جەستەو بە ڕووح ئەو سەفەرەی کردوە، ئەوەیە کەخوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١ ﴾الإسراء، تەماشا دەکەین لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: پاکیی بۆ ئەو کەسەی کە شەوڕۆیی کرد بەبەندەکەی خۆی، بەشەوێ لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ لای مزگەوتی ئەقصای کە پێزمان خستۆتە دەورو بەریەوە، تاکو نیشانەکانی خۆمانی پێشان بدەین، بێگومان ئەو (خوا)، بیسەری بینەرە.

ئنجا دیارە بەندە (عَبْد)، یان ئینسان، لە دوو شت پێکدێ، لە دوو حەقیقەت: لە ڕووح و جەستەو، بەهەردووکیان (عَبد)یان پێ دەگوترێ، ئەگەرنا ڕووحەکە پێی دەگوترێ: ڕووحی ئینسان، لاشەکەش پێیدەگوترێ: لاشەی ئینسان، بەلاّم خوا دەفەرموێ: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ ﴾، یانی: عەبدەکەو شەخصی ئەو عەبدە، هەر هەمووی بە ڕووح و جەستەوە سەفەری کردوە.

بەڵگەی دووەم: بەڵگەیەکی دیکە ئەوەیە، کەکاتێك پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەوەی گێڕایەوە بۆ خەڵکی، ئەو کاتە کە لە مەککە بوو، خەڵکی کە زۆر سەریان سوڕماو زۆر ئینکارییان کرد، تەنانەت دەڵێن: هەندێك لەوانە کە ئیمانیان لاوازبوو و دانەمەزرابوون، هەڵگەڕانەوە، ئنجا ئەگەر خەون دیتن بوایە، یان هەر سەفەرێکی ڕووحیی بوایە، ئەوە زۆر کەس خەونی وا دەبینێ، لە خەونیدا دەچێتە زۆر جێگا، ئەوە شتێکی سەیر نیە. کەواتە: ئەگەر پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وەك خەوێك شتەکەی بۆ باس کردبان، ئەوەندە نکوولییان نەدەکرد، هەڵبەتە بەڵگەی دیکەش زۆرن لەسەر ئەوەی کەپێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە ڕووح و لاشە ئەو سەفەرەی کردوە.

كورتەی ئەو سەفەرەش وەك لە صەحیحی بوخاریی‌و موسلیم دا هاتوە[1]، ئەوە بووە كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە حاڵەتی بێدارییدا لە مزگەوتی حەڕامەوە، بە شەوێك سەفەری پێكراوە بۆ مزگەوتی ئەقصا لە قودس‌و، لەوێشەوە بەرزكراوەتەوە بۆ ئاسمانەكان، وەك خوا بۆ خۆی دەفەرموێ: ﴿ سُبۡحَـٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ﴾الأسراء. كەواتە: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە مزگەوتی حەڕامەوە (لە مەككە)، لە یەك شەودا بەرەو مزگەوتی ئەقصا (لە قودس) سەفەری پێكراوە.

شایانی باسیشە سەفەرەكەی لەگەڵ جبریلدا (علیه السلام) بووەو، ولآخێكی بۆ هێناوە كە پێی گوتراوە: (بُراق)[2] كە ڕەنگە لە (البرق)ەوە هاتبێ، بەڵام حەتمەن دەبێ زۆر زۆر لەسەرووی خێرایی تیشكیشەوە ڕۆیشتبێ، لە مزگەوتی حەڕامەوە بۆ مزگەوتی ئەقصا (قودس) لە فەڵەستین، ئنجا لەوێ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دابەزیوەو ئیمامەتیی كردوە بۆ پێغەمبەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، دوایی لە (بیت المقدس)ەوە بەرز بۆتەوە بۆ ئاسمانی یەكەم، ئاسمانی دنیا، واتە: ئەو ئاسمانەی كە لە ئێمەوە نێزیكە، بە هاوەڵیی جبریل، جبریل داوای دەرگا كرانەوەی بۆ كردوە، دەرگای ئاسمانی یەكەمی بۆ كراوەتەوە، لە ئاسمانی یەكەمدا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئادەمی (علیه السلام) بینیوە، كە بابی هەموو مرۆڤایەتییە، سەلامی لێكردوەو، ئادەمیش بەڕێزو گەرمییەوە پێشوازیی لێكردوەو وەڵامی سەلامەكەی داوەتەوەو، دانی بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەددا هێناوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، پاشان بەرز كراوەتەوە بۆ ئاسمانی دووەم، لەوێش دیسان دەرگای بۆ كراوەتەوەو یەحیای كوڕی زەكەریاو عیسای كوڕی مەریەمی بینیوە (علیهما السلام)، سەلامی لێكردوون‌و وەڵامی سەلامەكەیان داوەتەوەو، بەڕێزەوە دانیان بەپێغەمبەرایەتییدا هێناوە، ئنجا بەرەو ئاسمانی سێیەم، لەوێش پێغەمبەر یوسوفی (علیه السلام) بینیوە،

---

١) رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٠٣٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٣٤).

٢) البُراق: دابَّةٌ رَكِبَها رَسولُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ليلة المعراج. المعجم الوسيط، ص ٥١، دیارە بە كوردییش هەر دەگوترێ: بۆراق.

هەروەها ئەویش بە هەمان شێوە دانی بەپێغەمبەرایەتیی ئەو داهێناوە، دوایی بەرەو ئاسمانی چوارەمو لەویٚ ئیدریسی (عليه السلام) بینیوە، دوای وەڵامی سەلام دانەوەو دان هێنان بە پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، بەرز کراوەتەوە بۆ ئاسمانی پێنجەم، لەوێشدا هاڕوونی کوڕی عیمڕانی بینیوە، برای مووسا (عليهما السلام)، ئنجا دوای ئەوەش بەرەو ئاسمانی شەشەمو لەویٚ پێغەمبەر مووسای (عليه السلام) بینیوە، پاشان بەرەو ئاسمانی حەوتەمو لەویٚ ئیبڕاهیمی (عليه السلام) بینیوە، ئنجا بەرەو (سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى) بەرز کراوەتەوە کە دروستکراوێکە هەر خوا دەزانیٚ چییەو چۆنە؟ لە سەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە، ئنجا بەرەو (بَيْت الْمَعْمُور)، ئنجا بەرەو ئەو شوێنەی کە گفتوگۆی لەگەڵ پەروەردگاریدا کردوەو، خوای بەرز وەحی تایبەتی بۆ ناردوە کە هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: لەو حاڵو مەقامەشدا بووە کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) پەروەردگاری خۆی بینیوە، بەڵام ئایا پێغەمبەری ئێمە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خوای بینیوە، یان نا؟! مشتو مڕو ڕاجیایی تێدایە، (إبن عباس)و کۆمەڵێك لە هاوەڵان دەڵێن: بەڵیٚ، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەشەوی میعراج دا خوای بینیوە، بەڵام (عائیشة) دایکی ئیمانداران (خوا لێیان ڕازی بیٚ)، لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکە لە هاوەڵان دەڵێن: نەخێر، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خوای نەبینیوە، لەڕاستیدا قسەی عائیشەو کۆمەڵەکەشی بەهێزترەو، بەڵگەی زیاتر پشتیوانیی لێدەکەن[1]، ئنجا هەر لەو سەفەرەشدا بوو کە پێنج نوێژە فەرزەکە لەسەر پێغەمبەرو ئوممەتەکەی فەرزکران، پێشیٚ پەنجا نوێژ بوو، بەڵام پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە گەڕانەوەیدا هاتەوە ئاسمانی شەشەمو گەیشتە مووسا، مووسا لێی پرسی: خوا چی لەسەر خۆتو ئوممەتەکەت فەرز کرد؟ فەرمووی: پەنجا نوێژ، مووسا فەرمووی: پەنجا نوێژ زۆرە، من لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا زۆر موعاناتو دەردە سەرییم دیوە، داوا لە پەروەردگارت بکە، بۆت کەم بکاتەوەو بۆت سووك بکات،

---

١) لە تەفسیری سووڕەتی (الأنعام)دا لە تەفسیری تایەتی: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ ... ﴿١٠٣﴾ ﴾ دا باسی ئەو ڕاجیاییی یەو بەڵگەکانیانمان کردوە کە بەرگی پێنجەمی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)ە.

پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەرز بۆوە بۆ شوێنی یەکەمجاری کە گفتوگۆی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا کردبوو، داوای کرد خوا بۆی کردە چلو پێنج نوێژ، ئنجا جارێکی دیکە، دیسان هاتەوە، هەروا بەو شێوەیە، هەتا هاتە سەر پێنج نوێژ، دیسان مووسا فەرمووی: داوا لە پەروەردگارت بکە بۆت کەم بکاتەوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: ئەوەندەم داوا لێکرد کە شەرم دەکەم، خوای پەروەردگاریش وەحی بۆ نارد فەرمووی: هەر لە ئەزەلییشدا پێنجم لەسەر ئوممەتەکەت نووسیبوو (بەڵام بۆیە بە پەنجا پێی گوترا، بۆ ئەوەی فەزڵو گەورەیی خۆی بۆ دەربکەوێ کە داواکارییو تکای لەلای خوای بەرزو مەزن چەند گیرایەو چەند ڕێزو حورمەتی هەیە)،خوا فەرمووی: هەر کەسێ ئەو پێنج نوێژە جێبەجێ بکات، بە پەنجا نوێژ بۆی دەنووسین.

ئنجا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هەر هەمان شەو دێتەوە بۆ (بيت المقدس)و دێتەوە بۆ مزگەوتی حەڕام، کاتێ کە ڕۆژ دەبێتەوە،دیارە خوا (عز وجل) پێی ڕادەگەیەنێ کەدەبێ بە خەڵکی ڕابگەیەنی کە پێیان ڕادەگەیەنێ، دیارە ئەوەی کە ئیمانداری ئیمان دامەزراوە، خاوەن یەقینە، وەك پێشەوا ئەبو بەکری صیددیقو باقی هاوەڵان، لەلایان شتێکی ئاساییە، هەتا گوتراوە: کە چوون بۆ لای ئەبو بەکرو گوتیان: موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شتێکی وا دەفەرموێ ! گوتی: (إِن قالَهُ فَقَد صَدَقَ)، ئەگەر ئەوە بڵێ، ڕاست دەکات، گوتیان: بۆچی؟ گوتی: من شتی لەوە گەورەتری بڕوا پێدەکەم، بڕوای پێدەکەم کە لە چاو تروکانێکدا جبریل لە سەروی حەوت ئاسمانەوە لەلایەن خوای بەرزەوە پەیامی بۆ دێنێ ! ئەوە شتێکی ئاساییە.

ئنجا مەسەلەی میعراج کە ئایا چۆن بووەو چۆن نەبووە؟ شیکردنەوەکەی بە شێوەی زانستییانە دەڵێین: لەڕاستیدا ئێمە ناتوانین بە شێوەیەکی زانستییانە بێین ئەوە شیی بکەینەوە، بۆچی؟ چونکە ئەو سەفەرە بۆ خۆی یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ئنجا زانیارییش، تا ئێستا گۆشەیەکی ئەم بوونەوەرەی بینیوەو گۆشەیەك لە یاسایەکانی ئەم بوونەوەرەی کەشف کردوە، خوای موحەممەدیش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، دەتوانێ موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بۆ ئەو شوێنە بەرێ کە خۆی

دەیەوێ، بێئەوەی کە کات بخایەنێ، کە ڕەنگە وەختی نەخایاندبێ، چونکە مەسەلەی کاتو شوێن لەعالەمی ئێمەدا کە مەخلوقینو عالەمی ماددیین، بە نیسبەت ئێمەوە ئیعتیبارییان هەیە، ئەگەرنا، لەلای خوای باڵادەست وانین، بۆیە خوای زانا، کاتێ باسی بەهەشت دەکات، یان باسی دۆزەخ دەکات، بەشێوەی کرداری ڕابردوو باسیان دەکات، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ... ٧١﴾ الزمر.

واتە: ئەوانەی بێبڕوان بەرەو دۆزەخ بەڕێ کران، لە لای خوای بەرزو مەزن ڕابردوو و ئێستاو داهاتوو نیە، زەمەن هەمووی بۆ خوای باڵادەست وەك یەك شت وایە، ئەوە تەنیا بۆ ئێمە وایە ، چونکە لە کاتێکدا هەین، پێی دەڵێین: ئێستا، وە لە کاتێکدا کە نەبووین، پێی دەڵێین: ڕابردوو، وە ئەوەی کە جارێ نەهاتوە پێی دەڵێین: داهاتوو، بەڵام خوا (جلّ شأنه) وانیە بڵێی: کاتێك بووبێ نەبووبێو، کاتێك ببێ نەبێ.

## حیکمەتی میعراج

حیکمەتی میعراجیش وەك زۆر لە زانایان دەڵێن: کاتێك پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە ( تائیف ) گەڕایەوە، ماوەیەك پێش ئەوەش، خەدیجەی خێزانی وەفاتی کردبوو کە گەورەترین هاوکاری بوو، هاوسەری دڵسۆزو دەستبارگرو بەڕێزی (خوا لێی ڕازی بێ)، هەروەها ئەبو تاڵیبی مامیشی مرد، هەتا ئەو ساڵە کە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیی بوو، بە هۆی وەفات کردنی ئەو دوو پشتیوانە، زانایانو مێژوونوسەکان ناویان لێنا (عام الحزن) ساڵی غەمگینییو ماتەمینیی، چونکە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) زۆر تێیدا غەمگینو ماتەمین بوو، ئنجا دوایی چوو بۆ شاری (تائیف)، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین دەریان کردو پێشوازییان لێنەکرد، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە گەڕانەوەیدا ڕازو نیازو پاڕانەوەیەکی زۆر بە کوڵی لەگەڵ خوای باڵادەست دا کرد، خوای پەروەردگاریش وەك ڕێز لێنانو دڵدانەوەیەك بۆ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و، وەك ورە بەرز

کردنەوەیەك، ئەو سەفەرە بەرزو پیرۆزەی پێکردو، لەگەڵێك لەڕاستییەکانی ئەم بوونەوەرو بوون (وجود)ەی پیشانی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم).

شایانی باسیشە، ئێمە لە هەرکارم لە کتێبی: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا...)داو کتێبی: (الإسلام کما یتجلّی في کتاب الله)دا بەرگی (٤) بابەتی: (موجز سیرة خاتم النبیین وبراهین نبوته)دا بە درێژیی باسی شەو ڕۆو بەرزبوونەوە (الإسراء والمعراج)ی پێغەمبەری خاتەم (محمد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم))مان کردوە.

❋❋❋❋❋❋



# باسی حەوزی (کوثر) و تکاکردن (شفاعة) و پەیمان(میثاق) لێوەرگیرانی ئادەم و وەچەکەی

نووسەر (خوا لێی خۆش بێ)، سێ خاڵی کورتو خێرای تەرخان کردووون کە خاڵەکانی: (٤٠و ٤١و ٤٢)ن بۆ سێ بابەتی دیکەی گرنگی عەقیدەیی کە بریتین لە:

١- ڕووباری، یان حەوزی خەلاتکراو بە پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کە ناوی (کوثر)ە.

٢- تکاکردنی پێغەمبەری خاتەم (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بۆ مرۆڤـــایەتیی بە گشتییو، بۆ ئۆمـــەتەکەی بەتایبەت، کە پێی دەگوترێ: (الشفاعة العظـــمى) تکاکردنی مەزن.

٣- پەیـــمانو بەڵێنی بەندایەتیی بۆ خواکردن (میثاق العبودیة لِلّه) وەرگیران لە ئادەمو وەچەکەی.

دیارە نووسەر بە کورتییو خێرایی باسی کردووون، بۆیە ئێمەش سەرو ڕوونکردنەوەی کورتیان لەسەر دەدەین:

**٤٠) ( وَالْحَوْضُ الَّذِي أَكْرَمَهُ اللَّهُ تَعَالَى بِهِ "غِيَاثًا لأُمَّتِهِ" حَقٌّ ):**

واتە: ئەو حەوزەی (یان: ڕووبار (نَهر) وەك لە دەقی فەرموودەدا هاتوە) کە (أَكْرَمَهُ اللهُ تَعَالَى بِهِ) خوای بەرز ڕێزی پێغەمبەری (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) پێگرتوە (غِيَاثًا لأُمَّتِهِ) وەك فریاکەوتنێكو بە هانا هاتنێك بۆ ئۆممەتەکەی (لە ڕۆژی لێپرسینەوەو حیسابو کیتابدا) (حَـــقٌّ) ئەو حەوزە هەقەو ئێمە ئیمانمان پێی هەیە، دیارە مەسەلەی حەوز کە هەندێك لە زانایان بە (حەوزی کەوسەر) (حوض کوثر) ناوی دەبەن.

(إبن أبي العِزّ الحَنَفي) شیکەرەوەی کتێبی عەقیدەی طەحـاویی، دەڵـێ: (الأَحادِيث الوَارِدَة فِي ذِكر الحَوْض تبلغ حَد التـواتر) واتە: ئەو فەرموودانەی کە وەسفی ئەو حەوزەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەکەن، گەیشتوونەتە ئەندازەی تەواتور، یـانی: شـتێکی بڕاوەیە کە سیو ئەوەندە هاوەڵە ڕیوایەتیان کردوە (خوا لێیان ڕازی بـێ)، ئنجا پێغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەو بارەوە فەرموودەی زۆرن، بـۆ وێنـە: یـەكێ لـە فـەرموودەکان

ئەمەیە: {عَنْ أَنَس بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقُولُ: أَغْفَى النَبِـي (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّم) إِغْفَاءَةً فَرَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسِّمًا إِمَّا قَالَ لَهُمْ وَإِمَّا قَالُوا لَهُ: لِمَ ضَحِكْتَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنَّهُ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفًا سُورَةٌ فَقَرَأَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ حَتَّى خَتَمَهَا، قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: هُوَ نَهْرٌ أَعْطَانِيهِ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ فِي الْجَنَّةِ، عَلَيْهِ خَيْـرٌ كَـثِيرٌ يَـرِدُ عَلَيْـهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ آنِيَتُهُ عَدَدُ الْكَوَاكِبِ يُخْتَلَجُ الْعَبْدُ مِنْهُمْ، فَأَقُولُ يَا رَبِّ! إِنَّهُ مِنْ أُمَّتِـي، فَيُقَالُ لِي: إِنَّكَ لا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ} حديث صحيح[1].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّم) ڕۆژێك سەرخەوێكی شكاند، تۆزێك خەو بردیەوە، دوایـی سـەری بـەرز كـردەوەو هەڵسا بە زەردەخەنەوە، یان، ئەو بۆ خۆی فەرمووی (دەزانن بەچی پێدەكەنم؟)، یان ئەوان گوتیان: ئەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بۆچی پێكـەنی؟ فـەرمووی: تۆزێـك پـێش ئێستا سوورەتێكم بۆ هاتە خوار، سوورەتەكەشـی یەكسـەر خوێنـدەوە: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ﴾، سوورەتی كەوسەری خوێندەوە، هـەتا تـەواوی كـرد، دوایی فەرمووی: ئایا دەزانن كەوسەر چییە؟ گوتیان: خـواو پێغەمبـەری خـوا زانـاترن، فەرمووی: ڕووبارێكە، پەروەردگارم لە بەهەشت پێی بەخشیوم، خێرو نـازو نیعمـەتێكی زۆری تێدایە، ئوممەتی من ڕۆژی دوایی دەچنە سەری (سەر ئەو حەوزە، یان ڕووبارە) كـە ئـەو پـەرداخ‌و قاپانـەی لەسـەرینی (ئاویـان پـێ دەخورێتـەوە) بـە ئەنـدازەی ژمـارەی ئەستێرەكانن، جاری وا هەیە یەكێ لە بەندەكان (لە ئوممەتی من) دەردەكرێ لە ڕیزەكەی‌و پاڵی پێوە دەنرێ، منیش دەڵێم: پەروەردگارم ! ئەوە لە ئوممـەتی منـە، پـێم دەگـوترێ: نەخێر، (ئوممەتی تۆ نیە، لێی گەڕێ) تۆ نازانی لە دوای تۆ چییان كردوە! واتە: هەر بـە ناو گوتوویانە: ئوممەتی موحەممەدین، ئەگەرنا بە دوای كەسانێكی دیكە كەوتوونو، هـەر

---

١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٢٠١٥)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسـناده صـحيح علـى شـرط مسـلم، وَحَسَّـنَهُ الألباني.

بە ناو ئوممەتی تۆ بوون، بەڵام بە كردەوەو نیوەڕۆك، یان كۆمەڵی ئەبو جەهلێك بوون، یان فیرعەونێك، یان نەمروودێك، لێیان گەڕێ، ئەوانە شایستەی ئەوە نین لە حەوزی تۆ بخۆنەوە!!

## پێناسەی حەوزی كەوسەر:

پوختەی ئەو فەرموودانەی باسی ئەو حەوزە دەكەن، ئەوەیە كەڕووبارێك، یان حەوزێكی زۆر گەورەیە، لە بەهەشتێوە ئاوەكەی بۆ دێ، ئاوەكەی لە شیر سپیترە،لە بەفری ساردترە، لە هەنگوین شیرین ترە، تامو بۆنەكەی لە میسك خۆشترە، ئەو حەوزە زۆر زۆر گەورەیە، هەم درێژییو، هەم پانیی، هەندێكیش دەڵێن: چوارگۆشەیە، ئنجا هەر كەسێك یەك جار لەو ڕووبارو حەوزە بخواتەوە، تازە جارێكی دیكە تینووی نابێتەوە، لەسەر ڕای زۆربەی زانایانیش وەك: قورتوبییو غەزالییو غەیری وانیش دەڵێن: ئەو ڕووبارو حەوزە، پێش ئەوەی خەڵك بگاتە پردی سەر پشتی دۆزەخ، لەوێوەیە، یانی: ئوممەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دوای ئەوەی لە پاش ڕاوەستانی ڕۆژی لێپرسینەوە، زۆر ئارەقە دەكەنو ماندوو دەبنو ناڕەحەت دەبن، تووشی ترسو سامو ناڕەحەتیی دەبن، دەچنە سەر ئەو ڕووبارو حەوزەو لێی دەخۆنەوەو فێنكیان دەبێتەوە، ئنجا لە پردەكە دەپەڕنەوە، ئوممەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەوەی بەهەشتی بێ، بەرەو بەهەشتو، ئەوەی گوناح بار بێ لە پردەكە كە (صراط)ی پێدەگوترێ، دەكەوێتە خوارێ و دەچێتە دۆزەخەوە.

شایانی باسیشە ئێمە لە بەرگی (٥)ی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی...)دا باسی حەوزو صیراطو چۆنییەتی پەڕینەوەی ئیمانداران لە پردی سەر پشتی دۆزەخو هەموو ئەو بابەتانەمان كردوە.

ڕەنگە یەكێكیش لەو بارەوە ئیشكالێكی بۆ دروست بێ: كە لە فەرموودەكان دا هاتوە (كوثر) لە بەهەشت دایە، كەچی بەر لەچوونە بەهەشتیش مسوڵمانان ئاوی لێدەخۆنەوە! وەڵامەكەشی ئەوەیە كە - وەك لە فەرموودەكانیش دا هاتوە- ئاوی ئەو ڕووبارو حەوزە لە بەهەشتەوە دێو دەڕژێتە نێوی.

كەواتە: هەرچەندە حەوزو ڕووبـاری كەوسـەر لـە دەرەوەی بەهەشـتە، بـەڵام مـادام ئاوەكەی لە وێوە سەرچاوە دەگرێ، ئەگەر بشگوترێ: لە بەهەشـت دایـە هـەر دروسـتو ڕەوایە!.

## تكـاكردن (شـفاعة)ی پێغـەمبەری خـاتەم (صلى الله عليه وسلم)

ئنجا دێتە سەر باسی تكاكردن (شَـفاعَة)ی پێغـەمبەری خـاتەم (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّم)و دەڵێ:

**٤١) ( وَالشَّفَاعَةُ الَّتِي ادَّخَرَهَا لَهُمْ حَقٌّ، كَمَا رُوِيَ فِي الأَخْبَارِ ):**

واتە: ئەو شەفاعـەتەی، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەیكا بـۆ ئوممەتەكـەی خۆی، هەقەو ڕاستە (ئیمانـمان پێی هەیـەو یەكێكـە لـەو شـتانەی كـە لـە عەقیـدەی ئیسلامییدا هەن) (كَمَا رُوِيَ فِي الأَخْبَارِ)، هەروەك چۆن لە فـەرموودەكانی پێغەمبـەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هاتوە.

ئنجا ئەو شەفاعـەتەش زانایان بۆ چەند جۆرێك دابەشیان كردوە:

یەكەم: (الشَفاعَةُ العُظـمى): تكاكردنی مەزن كە ئێمە لـە دوای هـەموو بانگێـك ئـەم دوعایە دەكەینو ئەوجۆرە تكاكردنە، كە بە (مَقاماً مَحْموداً) وەسـف كـراوە، بـۆ پێغەمبەری خاتەم (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) داوا دەكەینو دەڵـێین: { اللّهُـمَّ رَبَّ هـذه الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاةِ القَائِمَـةِ، آتِ مُحَمَّـداً الوَسِـيلَةَ، وَالفَضِـيلَةَ، وَابْعَثْـهُ مَقَامَـاً مَحْمُوداً الَّذِي وَعَدْتَهُ }حديث صحيح[1]

---

١) (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٨٥٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦١٤)، وَأَبو دَاوُدَ برقم: (٥٢٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١١) وَقَالَ: صَحِيحٌ حَسَنٌ غَرِيب، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٧٢٢)، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٤٢٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٦٨٩) عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اَللهُ عَنْهُ).

كە هەر كەسێك كاتێك گوێی لە بانگ دەبێ، سوننەتە بڵێ: ئەی خوایە! پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تێرو تەواوەو ئەم نوێژە بەرپاكراوە! (وَسيلَة و فضيلَة) بە موحەممەد بدە، وە ئەو پێگەیەی كە تێیدا ستایش دەكرێ كە بەڵێنت پێداوە، پێی ببەخشە.

پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: هەر كەسێك دوای بانگ ئەو دوعایە بكات، ئەوە لەڕۆژی دواییدا، شەفاعەتی منی بۆ پێویست دەبێ ، (واتە: شایستەی ئەوە دەبێ، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شەفاعەتو تكای بۆ بكات).

شایانی باسیشە كە باسی شەفاعەتی مەزن لە چەندان فەرموودەی صەحیح دا هاتوە ،كە كورتەكەی ئەوەیە: دوای ئەوەی مرۆڤەكان هەر هەموو ڕادەنوێنرێن بۆ لێپرسینەوە، خەڵك دەكەوێتە نارەحەتیی زۆرەوە، نازانن بۆ كوێ بچن؟ بۆ لای كێ بچن؟ دوایی خەڵك هەموویان دەچن بۆ لای ئادەم[1]، دەڵێن تۆ باب‌و باپیرەی ئێمەی، هەموومان وەچەی تۆین، تكاو ڕەجای ئەوەمان بۆ بكە، كە خوا (عَزّ وجَلّ) دەرگایەكمان بۆ بكاتەوەو ڕزگارمان بێ، ئادەمیش دەڵێ: من كاتی خۆی، خوا لە بەهەشتی دانام، بەڵام لەو درەختەی كە لێی قەدەغە كردبووم خواردم، ئێستا ڕووم نیە داوا لە خوا (عَزّ وجَلّ) بكەم، بەڵام بچن بۆ لای نووح، دەچن بۆ لای نووح ئەویش

---

١) { عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم: يَجْمَعُ اللهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُونَ لَوِ اسْتَشْفَعْنَا عَلَى رَبِّنَا حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ: أَنْتَ الَّذِي خَلَقَكَ اللهُ بِيَدِهِ، وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ، فَاشْفَعْ لَنَا عِنْدَ رَبِّنَا" فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ، وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ، وَيَقُولُ ائْتُوا نُوحًا، أَوَّلَ رَسُولٍ بَعَثَهُ اللهُ فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ، وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ، ائْتُوا إِبْرَاهِيمَ الَّذِي اتَّخَذَهُ اللهُ خَلِيلاً، فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ، وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ، ائْتُوا مُوسَى الَّذِي كَلَّمَهُ اللهُ" فَيَأْتُونَه فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ، فَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ، ائْتُوا عِيسَى، فَيَأْتُونَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ، ائْتُوا مُحَمَّدًا صلى الله عليه وسلم فَقَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ فَيَأْتُونِي، فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي، فَإِذَا رَأَيْتُهُ وَقَعْتُ سَاجِدًا، فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يُقَالُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، وَقُلْ يُسمَعْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَحْمَدُ رَبِّي بِتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِي" ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا، ثُمَّ أُخْرِجُهُمْ مِنَ النَّارِ وَأُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ" ثُمَّ أَعُودُ فَأَقَعُ سَاجِدًا مِثْلَهُ فِي الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ حَتَّى مَا يَبْقَى فِي النَّارِ إِلاَّ مَنْ حَبَسَهُ الْقُرْآنُ } أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي برقم: (٤٢٠٦).

دیسان بەڕێیان دەکات، دەڵێ: ئەوە شتێك نیە من قسەی تێدا بکەم، بچن بۆ لای ئیبراهیم، دەچن بۆ لای ئیبراهیم ، ئەویش دیسان دەڵێ: من لە توانامدا نیە، بچن بۆ لای مووسا، مووساش دەیاننێرێ بۆ لای پێغەمبەر عیسا، ئەویش دەڵێ: بچن بۆ لای موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، دەفەرموێ: کە دێن بۆ لای من، سەجدە بۆ خوای پەروەردگار دەبەمو، بە جۆرێك مەدحو سەنای خوای بەرز دەکەم، پێش ئەو کاتە نەمزانیوە، خوا فێرم دەکاتو بە شێوەیەك لە خوا دەپاڕێمەوەو مەدحی دەکەمو سوپاسو ستایشی دەکەم، کە هیچ کەس تا ئەو کات بەو شێوەیە مەدحی خوای نەکردوە، ئنجا خوای بەخشەر پێم دەفەرموێ: چیت دەوێ، سەرت بەرز بکەوەو دوعات قبوولْ دەکرێ، منیش پێشی دەڵێم: (أُمَّتِي أُمَّتِي) ئوممەتەکەم، ئوممەتەکەم، ئنجا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شەفاعەت بۆ هەموو ئینسانییەت دەکاو هەموویان ڕزگاریان دەبێ، دوایی هەر پێغەمبەرێك بە ئەندازەی توانای خۆی شەفاعەت دەکات، بۆ ئوممەتی خۆی.

ئنجا جگە لەم جۆرەی یەکەمی شەفاعەت، زانایان چەند جۆرێك شەفاعەتی دیکەشیان باسکردوون:

دووەم: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شەفاعەت دەکات بۆ کەسانێك کە چاکەو خراپەیان وەك یەکە، ئیدی ئەو (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تکایان بۆ دەکاتو بە هۆیەوە دەچنە بەهەشتێ.

سێیەم: هەروەها کەسانێکی دیکە کە فەرمانیان پێکراوە بچنە دۆزەخەوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شەفاعەت دەکاتو ناچنە دۆزەخو دەچنە بەهەشتێ، ئەوەش جۆرێکی دیکەیە.

چوارەم: جۆرێکی دیکە لە شەفاعەت ئەوەیە، ئەوانەی دەچنە بەهەشتێ، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تکا دەکات لە خوای بەبەزەیی، کە لە بەهەشتێ پلەکانیان بۆ بەرز بکاتەوە، بۆ وێنە: کەسێك لە پلەی پەنجایەمینە، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)

شەفاعەتی بۆ دەكات دەچێتــە پلەی پەنـجاو یەكەمـین، یان پەنـجاو دووەمین، ڕوو بە بەرزیی.

پێنجەم: پێغەمبـەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شـەفاعەت دەكـات بـۆ كەسـانێك كـە بـەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتێ.

شـەشـەم: پێغەمبـەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شــــەفاعەت دەكـات بـۆ كەسـانێك كـە ئەهلــی سزان و لە دۆزەخ دان، ئەو شــەفاعەتیان بۆ دەكـات كـە عەزابەكەیــان لەســەر سووك بێ.

حـەوتەم: جۆرێكی دیكە ئەوەیە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شەفاعەت دەكات بۆ بڕواداران، تا بچنە بەهەشتێ كە ڕادەگیرێن‌و بە تكاو شەفاعەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ڕێیان پێ دەدرێ بچنە بەهەشتێ.

هەشـتـەم: جۆرێكی دیكە لە شەفاعەت ئەوەیە، كە پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّم) شەفاعەت دەكات بۆ ئەوانەی، خاوەنی گوناهی گەورەن لە ئوممەتی خـۆی، لەوانـەی دەچنە دۆزەخ، پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تكایان بۆ دەكـات‌و لـە ئـاگر دێنـە دەرێ، ئنجا ئەوەش فەرموودەی صەحیحی پێغەمبـەری (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەسەرە كە دەفەرموێ: {«شَفَاعَتِي لأَهْلِ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي»} حديث صحيح.[1]

واتە: شەفاعەت‌و تكای من بۆ ئەوانەیە، كە گوناهی گەورەیان هەیە لە ئوممەتەكـەم، ئەوە هەشت جۆر، لە شەفاعەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كـە لـە ڕۆژی دواییـدا دەیكات.

*****

١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٣٢٤٥)، وَأَبو دَاوُدَ برقم: (٤٧٣٩)، وَالتِّرمذِيُّ برقم: (٢٤٣٥) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح غَرِيبٌ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٤٦٨)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٢٨) وَقَالَ: صَحِيح على شرط الشيخين، وَالبَيْهَقِي فِي شعب الإيمان برقم: (٣١٠)، عَنْ أَنَس بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

## وەرگـرتنـی پەیـمانی بـەندایەتیـی بۆ خـواكردن

## لـە ئـادەم و وەچـەكـەی

ئنجا دێتە سەر باسی سێیەم، كە پێشتر ئاماژەمان پێداو، دەڵێ:

**٤٢) ( وَالْمِيثَاقُ الَّذِي أَخَـــذَهُ اللَّهُ تَعَالَى مِنْ آدَمَ وَذُرِّيَّتِهِ حَقٌّ ):**

(الميثاق) یانی: بەڵێنو پەیمانێكی پتەو، كە زۆر تەئكیدی لەسەر كراوەتەوە، واتە: ئەو بەڵێنو پەیمانەی كە خوا لە ئادەمو لە وەچەی ئادەم وەریگرتوە، حەقەو ڕاستە، ئەو بەڵێنو پەیمانەش ئەوەیە، كەخوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الأعراف)دا لەو بارەیەوە دەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ ﴾الأعراف، واتە:

یاد بكەوە، كاتێك پەروەردگارت بەڵێنی لەوەچـەی ئـادەم لـە پشـتی وەچـەی ئادەمـدا وەرگرتو لەسەر خۆیانی كردن بە شاهێد (فەرمووی:) ئایا من پـەروەردگاری ئێـوە نـیم (ئەی وەچەی ئادەم؟) گوتیان: با، شایەدیشین (كە تۆ پەروەردگاری ئێمـەی)، بۆیـە ئـەو بەڵێنو پەیمانەمان لێوەرگرتن، كە ڕۆژی قیامەت نەڵێن: ئێمە لەمە بێئاگا بووین.

زانایان سەبارەت بە تەفسیری ئەو ئایەتە ئەو مەسەلەیەی كـە نووسـەر نـاوی لێنـاوە (میثاق)[1] دوو ڕایان هەن:

---

١) المعجم الوسيط، ص١٠١١، ١٠١٢ كە (موثق و ميثاق) بە (العهد) تەفسیر دەكات، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە كە (میثاق) بەڵێنو پەیـمانێكی داكۆكیی لەسەر كراو بێ.

ڕای یەكەم: كە چەند فەرموودەیەكیش پشتگیریی دەكەن، بەڵام فەرموودەكان زۆر بەهێز نین، ئەوەیە كە دەڵێن: خوا دەستی بە پشتی ئادەمدا هێناوەو، هەرچی نەوەو وەچەی ئادەم هەیە، لە شێوەی گەردیلەی زۆر وردا لە ئادەمەوە، تادوایین ئینسان ڕای نواندوونو، فەرموویەتی: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ هەموویان دانیان پێدا هێناوە كە: با. هەندێك ئاوای لێك دەدەنەوەو چەند فەرموودەیەكیش هەن كە ئاماژە بەوە دەكەن، بەڵام وەك پێشتر گوتم: فەرموودەكان ئەوە نین كە جێی دڵنیاییو متمانە بن.

ڕای دووەمیان: كە لە ڕاستیدا بەهێزتریشە، لەگەڵ سیاقی ئایەتەكەشو لەگەڵ ڕستەكانی ئەو ئایەتەشدا زیاتردەگونجێ، ئەوەیە كە: مەبەست لەو بەڵێنو پەیمان وەرگرتنە ئەوەیە كەخوا تاك تاكی وەچەی ئادەمی بەشێوەیەك دروستكردوە كە خوای خۆیان بناسن، ئێمە وا دروست كراوینو خاوەنی فیترەت و سروشتێكی واین، كە خوای خۆمان دەناسینو ئێمە لە دەروونەوە عەودالی خوای خۆمانینو تینووین بۆ ناسینی خوا، سروشتی هەركام لە ئێمە خوای خۆی دەناسێ، فیترەتی هەر كام لە ئێمە خوای خۆی دەناسێ، ئەمە وەك ئەوە وایە كەبەڵێنیان لێ وەرگیرابێ، ئنجا ئایا بەڵگە چیە لەسەر ئەوە؟ دەڵێن: بەڵگە ئەوەیە كەخوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ... ﴿١٧٢﴾ ﴾، دەفەرموێ: لە پشتی وەچەی ئادەم، وەچەكەیانی وەرگرتن، نەیفەرمووە لە ئادەمی وەرگرتن، ئنجا ئەو پەیمان لێوەرگرتنە كە خوای پەروەردگار دەیخاتە ئەو قاڵبەوە: ﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ﴾، دەڵێن: لە قورئاندا وێنەی دیكەش هەیە، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (فصلت)دا باسی ئاسمانو زەوی دەكاتو دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: ئنجا ڕووی كردە ئاسمان كە ئەو كاتە دووكەڵ بوو، بە ئاسمانو زەوی فەرموو: دروست بن، بە پێخۆشبوون، یان پێناخۆشبوون

(ئاسـمانو زەوی) گوتیان: بە گەردن كەچییەوە دروست دەبین (مادام فەرمانت لەسەرە، ببین دەبیـن).

ئنجـا خـوای بـەرزو مـەزن لێرەشـدا،وەك وێنـە هێنانـەوە، بەرچـاوی ئێمـەی پـێ ڕوونكردۆتەوەو مەسەلەكە بەجۆرێك وێنا (تصـویر) دەكات، كە خـوا بـەڵێنو پەیـمانی لێوەرگرتبن، چونكە ئێمەی وا خوڵقاندوە كە بیناسین، ئەوەش وەك ئـەوە وایـە كەبـەڵێنی لێوەرگرتبین، وەك لە كوردەوارییی خۆشماندا هەیە، دەڵێ: (جـام دەڵـێ: بمشـكێنە، بـەڵام مەمزرینگێنە)، دیارە جام وا ناڵێ، بەڵام لەسەر زمانی جام قسـە دەكـات، ئـەو جـۆرە نموونانە هەن، كە لەسەر زمانی حاڵی ئەو شتەی قسـە دەكـرێ، بـا ئـەو شـتە قسەشـی نەكردبێ.

كەواتە: مەرج نیە ڕووحەكانی ئێمەی وەچەی ئادەم، ئەو گفتوگۆیەیان لەگەڵ خـوادا كردبێ، بەڵام مادام خوا ئێمەی وا خوڵقاندوە كە بیناسین، وەك ئەوە وایە كەئەو بـەڵێنو پەیمانەمان لێ وەرگیرابێ.

ئنجا لە ڕاستییدا، ئەگەر گریمان ئەو بەڵێنو پەیمانە وەریش گیرابێ، مادام هیچ كاممان لەبیرمان نەماوە، پەیمانو بەڵێنەكە بوونو نەبوونی یەكسان دەبێتەوەو نابێتە مایەی بەڵگە تەواوكردن (إِتمام الحجّة) لەسەر مرۆڤـەكان.!

*****

نووسەر (أبو جعفر الطحاوي) کە لە سەدەی سێیەمو چوارەمی کۆچییدا ژیاوە، لەو کاتیدا لە نێو مسوڵمانانداا، مشتو مڕو بگرەو بەردە لەسەر بابەتی قەزاو قەدەر زۆر توند بووە، بۆیە لە کتێبەکەیدا لە چەند شوێنان دێتەوە سەر بابەتی قەزاو قەدەرو، ئەمجارەش حەوت خاڵ، کە خاڵەکانی: (٤٣-٤٨)ن، بۆ بابەتی ناوبراو تەرخان دەکاتو، سەرەتا دەڵێ:

٤٣) ( وَقَدْ عَلِمَ اللَّهُ تَعَالَى فِيمَا لَمْ يَزَلْ عَدَدَ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، وَعَدَدَ مَنْ يَدْخُلُ النَّارَ جُمْلَةً وَاحِدَةً، فَلا يُزَادُ فِي ذَلِكَ الْعَدَدُ وَلا يُنْقَصُ مِنْهُ ):

واتە: بە دڵنیاییەوە خوای بەرز هەر لە ئەزەلەوە (یانی: لە هەر بووییەوە) ژمارەی ئەوانەی زانیوە کە دەچنە بەهەشتێ، ژمارەی ئەوانەش کە دەچنە دۆزەخ، هەر هەموویانی زانیوە بە تێکڕا، ئەو ژمارەیەی کە خوا زانیویەتی (ژمارەی بەهەشتییانو ژمارەی دۆزەخییان) ئەو ژمارەیە، نەلێی کەم دەکرێو نەلێی زیاد دەکرێ.

واتە: بەر لەوەی خوای پەنهانزان ئێمە بخوڵقێنێ، زانیویەتی کاممان بەهەشتیینو کاممان دۆزەخیین؟ چی دەکەینو چۆن دەکەین؟ بەڵام وەك پێشتر گوتمان، خوا لە ئەزەلەوە زانیویەتی کە ئێمە بە ویستو هەڵبژاردنی خۆمان چی دەکەینو چۆن دەکەین؟ بەویستی ئازادانەی خۆمان بەرەو بەهەشتێ دەڕۆین، یان دۆزەخ کە ئەوەش لە ئێمە مەعلووم نیە، داخۆ بۆ لای کامیان دەڕۆین، چونکە زانیاریی‌و قەدەرو ویستی خوا لەلای ئێمە مەعلووم نیە، بەڵام خوای پەروەردگار نیشانەیەکی بۆ ئێمە داناوە، کە ئێمە بەو نیشانەیە بۆمان دەردەکەوێ بۆ کامیان دەچین، ئەویش بریتیە لە شەریعەتەکەی، بەپێی شەریعەتی خوا ئێمە دەزانین بەرەو کوێ دەڕۆین، با لەو بارەوە سەرنجی ئەم وتو وێژەی نێوان: (سلیمان بن

عبدالملك)و (أبو حازم) بدەین[١]:

+ سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك لە دانیشتنێکدا لەگەڵ ئەبو حازم کە یەکێك بوو لە زانایانی تابیعین، لە یەکێ لە قسەکانیدا دەڵێ: خۆزگە زانیبام ئایا من دۆزەخییم، یان بەهەشتییم؟!

- (ئەبو حازم)یش پێی دەڵێ: جا خۆ ئاشکرایە!!

+ سولەیمان دەڵێ: چۆن؟!

- ئەبو حازم دەڵێ: تەماشای قورئانت نەکردوە؟

+ سولەیمان دەڵێ: با.

- ئەبو حازم دەڵێ: ئەدی خوای زانا نافەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ۝١٣ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ۝١٤﴾الإنفطار، واتە: چاکەکاران لە بەهەشتێدانو خراپەکاران لە دۆزەخ دان، ئنجا خۆت ڕابنوێنەو بزانە لە چاکەکارانی، یان لە خراپەکارانی!

کەواتە: بەڵێ، ئێمە نازانین لە عیلمی خوادا چی بۆ ئێمە هەیە، لە قەدەری هەربووی خوادا چی بۆ ئێمە ئەندازەگیریی کراوە و، سەبارەت بەئێمە، ویستی خوا لەسەر چی بووە، بەڵام ئێمە ئاوێنەیەکمان لەبەر دەستدایە کە خۆمانی تێدا دەبینین، ئەویش بریتییە لە شەریعەتی خوا، بریتیە لە قورئانو سوننەت کە پێمان دەڵێ: ئاوا بکەو ئاوا بکە، بەرەو بەهەشت دەڕۆی، وە پێمان دەڵێ: کەسێك ئاوا بکاو ئاوا بکا، بەرەو دۆزەخ دەچێ.

کەواتە: بە پێی شەریعەتی خوا، دەزانین چینو چۆنینو بەرەو کوێ دەچین؟ بەڵێ، خوا لە ئەزەلەوە ژمارەی ئەوانەی زانیوە کە دەچنە بەهەشت، وە ئەوانەی کە دەچنە دۆزەخ، وە لەو ژمارەیە، نەکەم دەکرێو نە زیاد دەکرێ.

ئنجا دەڵێ:

---

١) (سليمان) حوکمڕانی مسوڵمانان بوو، دوای (عبدالملك)ی بابیو (أبو حازم)یش زاناو پێشەوایەکی گەورەی ئیسلام بوو، لەچینی شوێنکەوتوان (تابعین).

٤٤) ( وَكَذَلِكَ أَفْعَالُهُمْ فِيمَا عَلِمَ مِنْهُمْ أَنْ يَفْعَلُوهُ، وَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ، وَالأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ، وَالسَّعِيدُ مَنْ سَعِدَ بِقَضَاءِ اللَّهِ، وَالشَّقِيُّ مَنْ شَقِيَ بِقَضَاءِ اللَّهِ ):

واتە: هەروەها کردەوەکانیشیانی زانیوە، (کردەوەی بەندەکان، وەك چۆن چوونە بەهەشتو دۆزەخیان بۆ خوا زانراو بووە، هەروەها کردەوەکانیشی زانیون) لەوەی کە خوا دەربارەیان زانیویەتی کە دەیکەن ( وَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ) هەروەها هەرکامێکیش لە ئینسانەکان، بۆی ئاسان دەکرێو وەردەچەرخێنرێ بەرەو ئەو شتەی کە بۆی دروست کراوە (ئەگەر بۆ بەهەشت دروستکرابێ، کردەوەی بەهەشتییانی بۆ ئاسان دەبێ، ئەگەر بۆ دۆزەخ دروستکرابێ، بەرەو دۆزەخ وەردەچەرخێنرێو کردەوەی دۆزەخییانیشی لەسەر دەست ئەنجام دەدرێ)، (وَالأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ) ئەوکردەوانەش کە دەکرێن، مەرج کۆتاییەکەیانە، مرۆڤ هەیە چاکە دەکا، چاکە دەکا، بەڵام دوایی بەرەو کوفر دەچێو کردەوەکانی هەڵدەوەشێنەوە، عیبرەت بەوەی دواییە، یان هەیە زۆر خراپە دەکات، بەڵام دوایی دەگەڕێتەوەو کردەوەی چاك دەکات، ئیدی خراپەکانی لە کۆڵ دەبنەوەو پەڕێکی سپی هەڵدەداتەوە، حیساب بۆ کۆتاییو سەرەنجامەکەی دەکرێ، (وَالسَّعِيدُ مَنْ سَعِدَ بِقَضَاءِ اللَّهِ)، بەختەوەر ئەو کەسەیە کە بە بڕیاری خوا بەختەوەر بوویێ، (وَالشَّقِيُّ مَنْ شَقِيَ بِقَضَاءِ اللَّهِ)، بەدبەختیش ئەو کەسەیە کە بە بڕیاری خوا بەدبەخت بوویێ، دیارە بڕیاری خوا بە دوای ویستی ئینسان دەکەوێ، وە ئەگەر ویستی تۆ لەسەر کاری چاكو خێر بێ، دیارە خوا بڕیاری خێری بۆ تۆ داوە، ئەگەر ویستی تۆ ڕووبکاتە کاری شەڕ، دیارە خوا بڕیاری سەرەنجامی شەڕی بۆ تۆ داوە.

ئەوەی کە دانەری کتێب دەیەوێ تەئکیدی لەسەر بکات ئەوەیە، کە ئەم بوونەوەرو کائیناتە، ئەوەی ئێمە دەیزانینو ئەوەی ئێمە نایزانین، هەمووی لە ژێر چەتری بڕیارو ئەندازەگیریی خوادا بەڕێوە دەچێو بەڕێوەچووە، هیچ شتێ نیە بتوانێ لە ژێر ڕکێفی

بڕیاری خوا بچێتە دەرێ، ئەوەی نووسەر تەئكیدی لەسەر دەكات ئەوەیە، بە حەقیقەت قورئانیش هەر بەو شێوەیەی فەرمووە، وەك خوای زاڵ‌و كاربەجێ دەفەرمویێ: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾التكوير، ناتوانن بتانەوێ، تا خوا نەیەوێ، ﴿ ...فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ... ﴿٢٩﴾ ﴾الكهف، واتە: كەسێك دەیەوێ، با بڕوا (بە خوا) بێنێ، كەسێكیش دەیەوێ، با كافر بێ، بەڵام ئەو ویستەی تۆش دیسان لە ژێر ڕكێفی ویستی خوادایە، هەتا خوا نەیەوێ، تۆ ناتوانی بتەوێ، یانی خوا ویستوویەتی كە تۆ بتوانی بتەوێ، ویستوویەتی كە تۆ ویستت هەبێ، تۆ هەڵبژاردنت هەبێ، تۆ ئازاد بی، خوا ئەوەی بۆ تۆ ویستوە، ئەگەر خوا ئەوەی نەیویستبا، وەك مەلائیكەتان دەیخولقاندی، كە خراپەیان لەدەست نایەت، یان خوا دەیتوانی تۆ وەك شەیتانان بخولقێنێ كە چاكەیان لە دەست نایە، یان وەك ژیاندارانو ماددەی بێ ژیان، بتخولقێنێ، كە نەچاكەیان لەدەست دێ، نە خراپە، واتە: ئێمە كە دەتوانین چاكە بكەین و دەتوانین خراپە بكەین، خوا ویستوویەتی كە ئێمە بەو شێوەیە بین.

ئنجا بەردەوام دەبێ‌و دێتە سەر باسی نهێنی قەدەر، دەڵێ:

٤٥) ( وَأَصْلُ الْقَدَرِ سِرُّ اللَّهِ تَعَالَى فِي خَلْقِهِ، لَمْ يَطَّلِعْ عَلَى ذَلِكَ مَلَكٌ مُقَرَّبٌ، وَلا نَبِيٌّ مُرْسَلٌ، وَالتَّعَمُّقُ وَالنَّظَرُ فِي ذَلِكَ ذَرِيعَةُ الْخِذْلانِ، وَسُلَّمُ الْحِرْمَانِ، وَدَرَجَةُ الطُّغْيَانِ، فَالْحَذَرَ كُلَّ الْحَذَرِ مِنْ ذَلِكَ نَظَرًا وَفِكْرًا وَوَسْوَسَةً، فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى طَوَى عِلْمَ الْقَدَرِ عَنْ أَنَامِهِ، وَنَهَاهُمْ عَنْ مَرَامِهِ، كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ: (لا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ) [الأنبياء:٢٣]، فَمَنْ سَأَلَ: لِمَ فَعَلَ؟ فَقَدْ رَدَّ حُكْمَ الْكِتَابِ، وَمَنْ رَدَّ حُكْمَ الْكِتَابِ كَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ ).

## بەڕێزان!

سەرەنجام و كاكڵەی قسەی (طحاوي) لەبارەی قەدەرەوە، لەم خاڵی چل و پێنجەمە دایە، بە چاكیی لێی ورد بنەوە، نووسەر دەڵێ: بناغەی قەدەر، نهێنی خوای بەرزە لە دروست كراوەكانی خۆیدا، یانی: حەقیقەتی قەدەر، نهێنییەكی خوایە لە دروستكراوەكانی خۆیدا، وەك خۆی، بەس خوا دەیزانێ، ئێمە شتێكی لێ دەزانین و دەتوانین بۆنێكی لێبكەین، بەڵام حەقیقەتەكەی ئەوەندە قووڵە ئەوەندە وردە، بەس خوا دەیزانێ، (لَمْ يَطَّلِعْ عَلَى ذَلِكَ مَلَكٌ مُقَرَّبٌ وَلا نَبِي مُرْسَل) سەبارەت بەو نهێنییە، هیچ فریشتەیەكی زۆر لە خوا نیزیك و هیچ پێغەمبەرێكی ڕەوانەكراو، ئاگادارو شارەزانین، واتە: نە هیچ فریشتەیەك كە زۆر لە خوا نیزیكە، نەهیچ پێغەمبەرێك (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) كە خاوەنی پەیام و بەرنامەی خوان، وەك پێویست نهێنی و ماهیەتی قەدەریان نەزانیوە، بۆیەش: (وَالتَّعَمُّقُ وَالنَّظَرُ فِي ذَلِكَ ذَرِيعَةُ الْخِذْلانِ، وَسُلَّمُ الْحِرْمَانِ، وَدَرَجَةُ الطُّغْيَانِ) قووڵ بوونەوە لە زانین و شارەزایی پەیدا كردن لە قەدەرداو، زۆر سەرنج دان لەو مەسەلەیەدا، هۆی ڕیسوا بوون و پلیكانی سەرلێشێوان و پەیژەی یاخیبوونە بەرانبەر بە خوا، واتە: كەسێك زۆر تێیدا قووڵ بێتەوە، تووشی سەراسیمەیی و سەرگەردانیی دەبێ، سەرەنجام، ئەگەر ئەدەب و ڕێزێكی زۆری نەبێ بەرانبەر بەخوای خۆی، مەسەلەكە هێندە قووڵە، عەقڵ نایگاتێ و لەئاكامدا تووشی تاوانباركردنی خوا دەبێ، یان بەبێ عەدالەتیی، یان بەبێ عیلمیی!! وەك موعتەزیلەو جەهمییەكان،چونكە زۆر بەم مەسەلەیەدا قووڵ بوونەوە، زیاد لە ئەندازەی خۆی، بەڵام هەر نەگەیشتنە بنەكەی، چونكە عەقڵی ئینسان بەو شێوەیە دروست نەكراوە، نهێنییەكانی بوونەوەر بزانێ، كە هەموو بوونەوەریش بە قەدەری خوا بەڕێوەدەچێ و دروستكراوە، موعتەزیلە لە ئەنجامی ئەوەدا كە لە سنووری خۆیاندا ڕانەوەستاون و ئەسپی عەقڵیان هەر ئەوەندە تاو نەداوە، كە لە توانایدا هەیە، بە حیسابی خۆیان بۆ ئەوەی دیفاع لە دادگەریی خوا بكەن، گوتوویانە: خوا كردەوەی ئینسانەكان ناخوڵقێنێ و، ئینسان بۆ خۆی كردەوەكانی خۆی دەخوڵقێنێ، گوتوویانە: ئەگەر بڵێین: خوا كردەوەی ئینسان دەخوڵقێنێ، ئەدی چۆن بڵێین: خوا سزای دەدا لەسەر كردەوەیەك كە بۆخۆی بۆی

دەخوڵقێنێ، خوا لێرەدا تووشی زوڵم دەبێ، بە حیسابی خۆیـان!! لــە ئــەنجامی ئــەوەدا گوتوویانە: خوا کردەوەی ئینسانەکان ناخوڵقێنێ، ئیدی بە حیسابی خۆیان بۆ دیفــاع لــە دادگەریی خوا، زەڕبەیان لە هەردووك سیفەتی دەستەڵات و ویستی خوا داوە.

کەواتە: بە حیسابی وان بێ، لەگەڵ ئەوەدا کە خوا خالیقە، ئینسانیش خالیقە، بەڵام ئەوە بێ ئەدەبییە بەرانبەر بەخوا، چونکە خــوای پــەروەردگار دەفــەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ٦٢ ﴾الزمـر، واتــە: خــوا بەدیهێنــەری هــەموو شتێکەو بەسەر هەموو شتێکەوە سەرپەرشتیارە.

بەڵێ، موعتەزیلە بۆ بەرگریی کردن لە دادگەریی خوا، زیانیان لە تواناو ویستی خــوا داوەو تواناو ویستی خوایان بەرتەسك کردۆتــەوە،[1] جەبرییــەکانیش بەپێچــەوانەوە، بــە حیسابی خۆیان بۆ ئەوەی دیفاع لە ویستو دەستەڵاتو توانای خوا بکەن، گوتوویانە: خوا هەموو شتێك بە ئینسان دەکاتو ئینسان جەبری لێکراوە، بەمەش زەڕبەیان لە دادگەریی خوا داوە، چــونکە خــوای دادگــەر دەفــەرموێ: ﴿ مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ٢٩ ﴾ق. واتە: بڕیارو قسە لەلای من ناگۆڕێو، منیش ستەمکار نیم بۆ بەندەکان.

بەڵام ئەهلی سوننەتو جەماعەت، تا ئەو ئەندازەیە لەگەڵ بابەتەکەدا چوون کە عەقڵ بڕ دەکات، هەر ئەوانیش بە حەقیقەت بەسەربەرزیی ماونەوە، هەموو سیفەتەکانیشیان بۆ خوا بڕیار داوە: هەم بڕوایان بە دەستەڵاتو ویستی بێ سنووری خوا هەیە، هەم بڕوایان بە حیکمەتو دادگەریی بێ سنووری خوا هەیە، لە هەر شوێنێکیش عەقڵیان بڕی نەکردبێ، بۆ وێنە: باشە چۆن دەتوانین بڵێین: خوا لەسەر هەموو شــتێك بــە توانایــەو بەدیهێنــەری هەموو شتێکە، لەهەمان کاتــدا بــڕوا بەدادگــەریی خــواش بێــنین؟؟ ئــەهلی ســوننەتو جەماعەت گوتوویانە: خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) دەفــەرموێ: مــن دادگــەرم، وە مــن لەســەر

---

١) مەبەست لە زیاندانو زەڕبەدان لە ویستو دەستەڵاتو دادگەریی خوا، واتە: لە زەینو خەیاڵی خۆیاندا.

هەموو شتێك بە توانام، ئێمەش بڕوامان بە هەموو فەرمایشتەکانی خوا هەیە، مەسەلەی قەزاو قەدەریش ئەوەندە لەگەڵی دەڕۆین کە عەقڵمان بڕی دەکات، کە زانیمان عەقڵمان لێی ڕادەوەستێ ،دەڵێین: نازانین، بەڵام خوا هەم بەتواناو دەسەڵاتدارەو هەم دادگەریشە، ئنجا ئێمە عەقڵی خۆمان تاوانبار بکەین چاکترە، نەك دادگەریی خوا، یان ویستو توانای خوا!!

بۆیەش نووسەر دەڵێ: زۆر ورد بوونەوە تێیدا، دەبێتە هۆی سەرشۆڕیی‌و زەبوونیی، دەبێتە پەیژەی بێ بەش بوون لە ڕەحمەتی خوا، ئینسان دەگەیەنێ بەئەو پەڕی بێ ڕێزیی‌و یاخیبوون، ئنجا دەڵێ: (فَالْحَذَرَ كُلَّ الْحَذَرِ) وریابە زۆر وریا بە، لەوەی کە زیاد بە ئەندازەی مەسەلەی قەدەردا بچیتە خوار، (مِنْ ذَلِكَ نَظَرًا وَفِكْرًا وَ وَسْوَسَةً) وەك بیر کردنەوە لێی‌و وەك سەرنجدانو وەك خوتخوتەو خەیاڵ کردن، (فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى طَوَى عِلْمَ الْقَدَرِ عَنْ أَنَامِهِ) ، چونکە خوا زانیاری لەبارەی قەدەرەوەی لە بەندەکانی شاردۆتەوە، (وَنَهَاهُمْ عَنْ مَرَامِهِ كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ) وەخوا نەهی کردوە کە زۆری بەدوادا بگەڕێن، وەك خوای بەرز لە کتێبەکەیدا دەفەرمویێ: ﴿ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء، واتە: (خوا) پرسیاری لێ ناکرێ لەوە کە دەیکا، بەڵکو بەندەکان پرسیاریان لێدەکرێ، واتە: هیچ کەس نیە بتوانێ گلەیی لە خوا بکات، بۆچی ئەوەی کرد؟ بۆچی ئەوەی نەکرد؟ نەك تەنیا لەبەر ئەوەی خوا خاوەنی دەستەڵاتەو پەروەردگارو بەدیهێنەری ئێمەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی خوا کاربەجێیەو بەبەزەییەو خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندەو، هەرگیز کارێکی وا ناکات، جێی توانج و پلارو تەشەرو گلەیی بێ، چونکە هەیە بە هەڵە لەو ئایەتەی سەرەوە دەگات، دەڵێ: کەس بۆی نیە پرسیار لە خوا بکات، بۆچی وای کرد؟! ، چونکە خوا بە دەستەڵاتە، بەڵام نەخێر، هەر لەبەر ئەوە نا کە بە دەستەڵاتە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە کاربەجێشە، بۆیە کە شتێکت بە کەم و کوڕ هاتە بەرچاو، بزانە عەقڵی تۆ کەمو کوڕیی تێدایە، وەك دەڵێ:

وَكَمْ من عائبٍ قولاً صَحِيحَاً وآفته من الفَهم السقيم

واتە: زۆرجار ڕەخنە دەگیرێ لە قسەی ڕاست، کەچی دەردەکە لە تێگەیشتنی نەخۆشەوەیە!

وەك بابای نەخۆش ئاوی شیرین لەزاریدا تاڵە، بۆیە نووسەر دەڵێ: (فَمَنْ سَأَلَ: لِمَ فَعَلَ؟) هەر کەسێ بپرسێ: خوا بۆچی ئەوەی کردوە؟ (فَقَدْ رَدَّ حُكْمَ الْكِتَابِ) کەواتە: کتێبی خوای ڕەت کردۆتەوە، (وَمَنْ رَدَّ حُكْمَ الْكِتَابِ كَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ) هەر کەسێکیش کتێبو حوکمی خوا بەرپەرچ بداتەوە، ئەوە لە کافرانە.

کەواتە: هەر کەسێك گلەیی لە خوا بکاتو ڕەخنەی لێ بگرێ، جا گلەییو ڕەخنە بگرێ لە کردەوەکانی، بۆ وێنە: بۆچی فلاَن ستەمکار لە نێو نابات ؟ بۆچی وا دەچێ، بۆچی وا دەبێ؟ هەر کەسێك ڕەخنە لە کارەکانی خوا بگرێ، یان لە دروستکراوەکانی بگرێ، ئەوە کافرە.

کاتی خۆی (خيرالله طلفاح) نامیلکەیەکی دەرکردبوو بە ناوی: (ثلاثة ما كان على الله أن يخلقهم: اليهود والفرس والذباب) (سێ شت نەدەبوو خوا دروستیان بکات: جوولەکەو فارسو مێش) کە بێگومان ئەوە کوفرە، تۆی مەخلووقی بێهێزی نەزان، چووزانی نهێنی ئەو مەخلووقانە چین؟ بەڵێ، هەر کەسێك ڕەخنە لە خوا بگرێ، نەك هەر بە زمان، بە دڵیشی دابێو دڵی لەسەر دابمەزرێ، پێی کافر دەبێ، چونکە مەرجی بەندایەتیی بۆخوا، ئەوەیە کەمرۆڤ خۆی بە کەمو کوڕ بزانێو، هەرچی چاکییو پاکییو تەواوییە بە هی خوای بزانێ.

پاشان هەر لەسەر باسی قەزاو قەدەر بەردەوام دەبێو، دەڵێ:

> ٤٦) ( فَهَذَا جُمْلَةُ مَا يَحْتَاجُ إِلَيْهِ مَنْ هُوَ مُنَوَّرٌ قَلْبُهُ مِنْ أَوْلِيَاءِ اللَّهِ تَعَالَى، وَهِيَ دَرَجَةُ الرَّاسِخِينَ فِي الْعِلْمِ؛ لأَنَّ الْعِلْمَ عِلْمَانِ: عِلْمٌ فِي الْخَلْقِ مَوْجُودٌ، وَعِلْمٌ فِي الْخَلْقِ مَفْقُودٌ، فَإِنْكَارُ الْعِلْمِ الْمَوْجُودِ كُفْرٌ، وَادِّعَاءُ الْعِلْمِ الْمَفْقُودِ

كُفْــرٌ، وَلا يَثْبُـــتُ الإِيـــمَانُ إِلاَّ بِقَبُــولِ الْعِلْـــمِ الْمَــوْجُــودِ، وَتَرْكِ طَلَبِ الْعِلْمِ الْمَفْقُودِ ):

واتە: ئەوە سەرجەمی پێویست پێبووی ئەو باسەیە، لەلای هەركەسێ كە دڵی ڕۆشـن بووبێتەوە لە دۆستەكانی خوای بەرز، واتە: ئەو ئەندازەیەی كـە باسـكرا، پوختـەی ئـەو قسانەیە كە ئەو كەسەی دڵی ڕۆشن بووبێتەوە، پێویستی پێیە، غەیری ئـەوە پێویسـتیی پێی نیە، (وَهِيَ دَرَجَةُ الرَّاسِخِينَ فِي الْعِلْـمِ)، ئەو شێوەو قەناعـەتەی كە باسكرا، پلەی ئەو كەسانەیە كە زۆر بە زانیارییدا ڕۆچوون، (لأَنَّ الْعِلْمَ عِلْمَـانِ)، چونكە دوو جـۆرە زانیـاری هەیە: (عِلْمٌ فِي الْخَلْقِ مَوْجُودٌ)، زانیارییەك كە لە نێو دروسـتكراوەكانی خـوادا هەیـە، ئینسانەكان دەیزانن، (وَعِلْمٌ فِي الْخَلْقِ مَفْقُودٌ) زانیارییەكیش كە دروستكراوەكانی خـواو ئینسانەكان لە نێوانیان دا نیە، (فَإِنْكَارُ الْعِلْمِ الْمَوْجُودِ كُفْرٌ)، ئنجا ئینكاریی كردنی ئەو زانیارییـەی كـە هەیـە، كـوفرە، واتـە: ئـەوەی كـە لـە خـواوە بـۆ ئێمـە هـاتوە كـە شەریعەتەكەیەتی، هەر كەسێك ئینكاریی لە بڕیارێـك لـە بڕیارەكـانی شـەریعەتی خـوا بكات، كافر دەبێ، (وَادِّعَاءُ الْعِلْمِ الْمَفْقُودِ كُفْرٌ)، ئنجا وەك چۆن ئینكاریی كردنـی ئـەو عیلمەی وەحی كە هەیە، مرۆڤــ پێی كافر دەبێ، لاف لێدانو ئیددیعای ئەو عیلمەش كە نیە، دیسان پێی كافر دەبێ (بۆیەش ئەوانەی كە ئیددیعای زانینی نادیار (غَيْب) دەكەن، كافر دەبنو هەر كەسێكیش بڕوایان پێ بكات، كافر دەبێ) (وَلا يَثْبُـتُ الإِيمَـانُ إِلاَّ بِقَبُـولِ الْعِلْمِ الْمَوْجُودِ)، ئیمان ناچەسپێ، مەگەر ئەو زانیارییـەی كـە هەیـە وەربگـیرێ، واتـە: شەریعەتی خوا وەربگیرێ، (وَتَرْكِ طَلَبِ الْعِلْـمِ الْمَفْقُـودِ)، وازبهێنـرێ لـە بەدواداگـەڕانی زانیارییەك كە ناگونجێ پەیدا بێ، كە یەكێك لەوانە نهێنیی قەزاو قەدەرە كە شتێكە خوا لە بەندەكانی خۆی شاردۆتەوە، دەتوانی هەندێك لەگەڵی بڕۆی بایی ئەوەندە: كە خوا هەموو شتێك دەزانێو لەسەر هەموو شتێك بە توانایەو دادگەرو كاربەجێیە، بەڵام ناتوانی زیاتری بە دوادا بڕۆی، لەو بارەوە ئەم فەرموودەیە هاتوە:

{ عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا مَعَ جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ فَأَتَانَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَجَلَسَ وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ يَنْكُتُ بِهَا ثُمَّ رَفَعَ بَصَرَهُ، فَقَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلاَّ وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهَا مِنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، إِلاَّ قَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً، فَقَالَ الْقَوْمُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ! أَفَلا نَمْكُثُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ، فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى السَّعَادَةِ وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشِّقْوَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى الشِّقْوَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): بَلْ اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ، أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشِّقْوَةِ فَإِنَّهُ يُيَسَّرُ لِعَمَلِ الشِّقْوَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَإِنَّهُ يُيَسَّرُ لِعَمَلِ السَّعَادَةِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ ﴾الليل} حديث صحيح.(١)

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ جەنازەیەك بووین لە بەقیعی غەرقەد (کە شوێنێکە)، پێغەمبەر تەشریفی هات‌و دانیشت، ئێمەش لە دەوری دانیشتین، گۆچانێکی(٢) بچووکی پێ بوو، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ڕووی لە زەوی کردو گۆچانەکەی لە زەوییەوە دەژەنی، دوایی فەرمووی: هیچ نەفسێکی دروستکراو لە ئێوە نیە (هیچ ئینسانێك نیە)، مەگەر خوا شوێنەکەی لە بەهەشتێ، یان لە دۆزەخێدا نووسیوە، حەتمەن نووسراوە کە ئایا بەدبەختە، یان بەختەوەرە، خەڵکەکە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بۆچی بەو شێوەیەی خوا نووسیویەتی چاوەڕێ نەکەین و واز لە کارو کردەوە بێنین، (خوا ئەوەی نووسیویەتی‌و بڕیاریداوە، با بێتەدی‌و ئێمەش هیچ کردەوەیەك نەکەین)، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وەڵامی دایەوە (وەڵامدانەوەکە بە حەقیقەت زۆر وردەو زۆر ئیشکال لە مەسەلەی قەدەر چارەسەر دەکات) فەرمووی: هەر کەسێ لە بەختەوەران بێ، حەتمەن بەرەو کردەوەی بەختەوەران دەچێ، (خوا وای لێدەکات، کە کردەوەی بەهەشتییان ئەنجام بدات)، هەر کەسێکیش لە ڕیزی

---

١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٠٦٧)، وقال الشيخ شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

٢) المِخْصَرة: بكسر الميم كالسَّوط كلُّ ما اختصر الإنسان بيده فأمسكه من عصيٍّ ونحوها.

أنظر: مختار الصّحاح، ص ١٦٧، لفظ: خ ص ر.

بەدبەختان (دۆزەخییان) نووسرابێ، ئەوە کردەوەی بەدبەختان ئەنجام دەدات، دوایی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: بەڵکو کردەوەی چاك بکەن، هەر کەسێ ئەو کردەوەی بۆ ئاسان دەکرێ بۆ ئەو شوێنەی کە بۆی دروست کراوە، بەختەوەران ئاسان دەکرێن بۆ کردەوەی بەهەشتییان، ئەوانەش کە بەدبەختن، وەردەچەرخێنرێن‌و ئاسان دەکرێن بۆ کردەوەی دۆزەخییان، دوایی پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەم ئایەتانەی خوێندنەوە: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ ﴾الليل، واتە: هەر کەسێك ماڵی خۆی ببەخشێ‌و خۆی بپارێزێ (لەخراپە)، بڕواشی بە (ڕاسترین‌و) چاکترین وشە هەبێ، ئێمە ئاسانی دەکەین بۆ کردەوەی ئاسان (کردەوەی ئاسان ئەو کردەوەیە کە بەپێی سروشت‌و فیترەتی ئینسانە کە کردەوەی مسوڵمانانەیە)، ئەو کەسانە وەردەچەرخێنرێن بۆ کردەوەی چاك، ﴿ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾الليل، بەڵام هەر کەسێ ڕژدیی بکاو خۆی بەبێ نیاز تەماشا بکا بەرانبەر بە خوا، بڕواشی بە چاکترین وشە نەبێ (کە وشەی خوا بەیەکگرتن {توحید}ە)، ئەوە ئاسانی دەکەین بەرەو شتێکی زەحمەت، (کە کردەوەی خراپە).

## باسی (لَوح) و (قَلَم):

نووسەر هەر لەسەر باسی قەدەر بەردەوام دەبێ‌و بەو بۆنەیەشەوە باسی (لَوْح)و (قَلَم) دەکات‌و دەڵێ: هەرچی کە لە (لَوْح)دا نووسراوە دێتەدی‌و ناگۆڕێ، دەڵێ:

٤٧) (وَنُؤْمِنُ باللَّوْحِ وَالْقَلَمِ، وَبِجَمِيعِ مَا فِيهِ قَدْ رُقِمَ، فَلَوِ اجْتَمَعَ الْخَلْقُ كُلُّهُمْ عَلَى شَيْءٍ كَتَبَهُ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ أَنَّهُ كَائِنٌ؛ لِيَجْعَلُوهُ غَيْرَ كَائِنٍ لَمْ يَقْدِرُوا عَلَيْهِ، وَلَوِ اجْتَمَعُوا كُلُّهُمْ

عَلَى شَيْءٍ لَمْ يَكْتُبْهُ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ؛ لِيَجْعَلُوهُ كَائِنًا لَمْ يَقْدِرُوا عَلَيْهِ، جَفَّ الْقَلَمُ بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَا أَخْطَأَ الْعَبْدَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ، وَمَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ):

واتە: بڕوا دێنین بە لەوحو قەڵەم، بە تێكڕای ئەوەی كە لە لەوحدا نووسراوە[(١)]، وشەی (لَوح) وشەیەكی عەرەبییە، یانی: شتێكی تەخت وەك تەختە ڕەش كە پێی دەگوترێ: لەوح، هەندێك لە زانایان دەڵێن: لەوح وەك لە هەندێ لە شوێنەوار (آثار)دا دەردەكەوێ، جیسمێكی زۆر گەورەیە، دروستكراوێكی زۆر پانە، هەرچی خوا لە بوونەوەردا خولقاندوویەتیو دەیخولقێنێ، لە لەوحدا نووسراوەو تۆمار كراوە كە فلان شت لە فلان كاتدا دەخولقێ بە فلان ئەندازەو بەو چۆنییەتییە، هەڵبەتە وشەی لەوح لە قورئاندا هاتوە، وەك خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍ ﴿٢٢﴾ ﴾،

واتە: بەڵكو ئەوە قورئانێكی پلەو پایە بەرزە. لە لەوحێكی پارێزراودایە، واتە: جگە لە خوا، هیچ كەس لێی ئاگادار نیە، قەڵەمیش ئامرازی نووسینە، بەڵام ئێمە نەلەوح و نەقەڵەم چۆنییەتییەكەیان نازانین، بەڵام دەزانین لەوح شتێكە، خوا مەعلووماتی خۆی تێدا نووسیوەو تۆمار كردوە، (قەڵەم)یش ئامرازێكە كە هەرچی خوا بڕیاری لەسەر داوە بیخولقێنێو خولقاندوویەتی، بەو قەڵەمە لە لەوحدا نووسیویەتی، ئنجا دەڵێ: بڕوا دێنین بە لەوحو بە قەڵەمو بە تێكڕای ئەوەی كە لە لەوحدا نووسراوە، (فَلَوِ اجْتَمَعَ الْخَلْقُ كُلُّهُمْ عَلَى شَيْءٍ كَتَبَهُ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ أَنَّهُ كَائِنٌ، لِيَجْعَلُوهُ غَيْرَ كَائِنٍ لَمْ يَقْدِرُوا عَلَيْهِ)، واتە: ئەگەر تێكڕای خەڵك كۆببنەوە لەسەر شتێك كە خوای بەرز لە لەوحدا نووسیویەتی كە دەبێ ببێو، ئەو شتە بكەن بە نەبوو و نەهێڵن ئەو شتە ببێ، ناتوانن.

---

١) اللّوح: كل صفيحة عريضة خشباً كانت أو عظماً أو غيرهما، ما يُكْتَبُ فيه... المعجم الوسيط، ص٨٤٥.

واتە: هەرچی كە خوا لە لەوحدا تۆماری كردوە ببێ، ئەگەر تێكڕای خەڵك كۆببنەوەو نەهێڵن ببێ، ناتوانن، وە ئەگەر تێكڕا كۆببنەوە لەسەر شتێك كە خوای بەرز لە لەوحدا نەینووسیوە ببێ، ناتوانن بیكەن بە هەبووو بوونی پێ ببەخشن، ئنجا دەڵێ: (جَـفَّ الْقَـلَـمُ) قەڵەم وشك بووە، واتە: ئەو مەرەكەبەی كە قەڵەم نووسیویەتی تازە وشك بووە (بِمَـا هُـوَ كَائِنٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ) بەوەی هەیەو دەبێ هەتا ڕۆژی دوایی، واتە: ئەوە كەخوای زانا لە ئەزەلدا بڕیاری لەسەر داوە، هەر ئەوەیەو دەبێت بێتەدیو گۆڕانی بەسەردا نایەت، ئنجا دەڵێ: (وَمَا أَخْطَأَ الْعَبْدَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ)، وە ئەوەی كەبەندە نـاییپێكێو تووشـی نـابێ، نەدەبوو بیپێكێو تووشی ببێ (وَمَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَـهُ)، ئەوەش كە تووشـی بەنـدە دەبێو دەیپێكێ، نەدەبوو نەیپێكێ، واتە: خێر، یان شەڕ، چاكە، یان خراپە كە لە ئینسان لادەدرێ، نەدەبوو تووشی ببێ، وەكە تووشی ئینسان دێ، نەدەبوو لێی لادرێ، چۆن خـوا بڕیاری داوەو زانیویەتیو ویستی لەسەر بووە، دەبوو هەر بەو شێوەیە بێ.

ئنجا سەرەنجام بەخاڵی (٤٨) كۆتایی بە قسەكانی دێنێ لەبارەی قەدەرەوەو، دەڵێ:

٤٨) (وَعَلَى الْعَبْدِ أَنْ يَعْلَمَ أَنَّ اللَّهَ قَدْ سَبَقَ عِلْمُهُ فِي كُلِّ كَائِنٍ مِنْ خَلْقِهِ، فَقَدَّرَ ذَلِكَ تَقْدِيرًا مُحْكَمًا مُبْرَمًا، لَيْسَ فِيهِ نَاقِضٌ وَلاَ مُعَقِّبٌ، وَلاَ مُزِيلٌ وَلاَ مُغَيِّرٌ، وَلاَ نَاقِصٌ وَلاَ زَائِدٌ مِنْ خَلْقِـهِ فِي سَمَاوَاتِهِ وَأَرْضِهِ، وَذَلِكَ مِنْ عَقْـدِ الإِيمَـانِ، وَأُصُـولِ الْمَعْرِفَةِ، وَالاعْتِرَافِ بِتَوْحِيدِ اللَّهِ تَعَالَى وَبِرُبُوبِيَّتِهِ، كَمَا قَالَ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ (وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا) [الفرقان:٢]، وَقَالَ تَعَالَى (وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا) [الأحزاب:٣٨]. فَوَيْلٌ لِمَنْ صَارَ لِلَّهِ تَعَالَى فِي الْقَـدَرِ خَصِـيمًا، وَأَحْضَـرَ

لِلنَّظـــــر فِيهِ قَلْبًا سَقِيمًا، لَقَدِ الْتَمَسَ بِوَهَمِهِ فِي فَحْـــصِ الْغَيْبِ سِرًّا كَتِيمًا، وَعَادَ بِمَا قَالَ فِيهِ أَفَّاكًا أَثِيمًا):

واتە: لەسەر بەندە پێویستە بزانێ كە زانیاریی خوا ڕابردووەو پێشكەوتوە لەسەر هەر دروست كراوێك لە دروستكراوەكانی خوا، یانی: خوا بەر لەوەی هەر شتێك بخولقێنێ زانیویەتیو زانیاریی دەربارەی هەبووە، ئەو شتە كە دەبێ چۆن دەبێ، چۆنییەتییەكەی، ئەندازەكەی، تەمەنی، وەزعی، هەمووی بۆ خوای بالآدەست دیار بووە، (فَقَدَّرَ ذَلِكَ تَقْدِيرًا مُحْكَمًا مُبْرَمًا)، خوا هەموو ئەو شتانەی ئەندازەگیریی كردوە بە ئەندازەگیرییەكی زۆر پتەوی وا، كە هیچ مەودای كەمو زیادی تێدا نەمێنێ، (لَيْسَ فِيهِ نَاقِضٌ وَلاَ مُعَقِّبٌ) لەو بڕیارانەدا كە خوا داونی لەو شتانەدا كە خوای بەدیهێنەر دروستی كردوونو، بڕیاری لەسەر بووە كە دروست بن، هەڵوەشێنەرەوەو چاوپێداگێڕەرەوە نیە.

یانی: هیچ كەسێك بۆی نیە بڕیارەكانی خوا هەڵوەشێنێتەوە، هەروەها هیچ كەسێك نیە چاو بە بڕیارەكانی خوادا بگێڕێتەوەو تێبینیو سەرنجی لەسەریان هەبێ. (وَلاَ مُزِيلٌ وَلاَ مُغَيِّرٌ) هەروەها لادەرو گۆڕەر نیە، یانی: ئەوەی كەخوا بڕیاری لەسەرداوە، هیچ كەس ناتوانێ لای بدات، وە ئەوەی كەخوا ئەندازەگیریی كردوە، هیچ كەس ناتوانێ بیگۆڕێ (وَلاَ نَاقِصٌ وَلاَ زَائِدٌ مِنْ خَلْقِهِ فِي سَمَاوَاتِهِ وَأَرْضِهِ)، نەكەم دەكاو نەزیاد دەكا، (لەو زانینو ئەندازەگیرییەی كە تۆماری كردوە لە زانیاریی هەربووی خۆیدا) لە هەموو دروستكراوەكانی خۆی، چ لە ئاسمانو چ لە زەویدا (وَذَلِكَ مِنْ عَقْدِ الإِيمَانِ، وَأُصُولِ الْمَعْرِفَةِ، وَالإِعْتِرَافِ بِتَوْحِيدِ اللَّهِ تَعَالَى وَبِرُبُوبِيَّتِهِ) وە ئەوەش (كە لە ڕابردوودا گوترا) لە گرێی ئیمانو بنەماكانی خواناسینو بنچینەكانی دان پێداهێنانە بەیەكتاییو پەروەردگاریێتی خوای بەرزدا. (كَمَا قَالَ تَعَالَى فِي كِتَابِهِ: ﴿... وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾﴾ الفرقان، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿... وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا ﴿٣٨﴾﴾ الأحزاب)

واتە: وەك خوای بەرز لە كتێبی خۆیدا دەفەرموێ: ﴿... وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا

﴿٢﴾ الفرقان، واتە: خوا هەموو شتێکی دروست کردوەو ئەندازەگیریی بۆ کردوە، بەئەندازە گیرییەکی تەواو، هەروەها دەفەرموێ: ﴿... وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾﴾ الأحزاب، واتە: فەرمانی خواو کاری خوا، ئەندازەگیرییەکی خاوەن تایبەتمەندیی تەواوی بۆ دیاریکراوە.

ئنجا نووسەر لە کۆتایی باسی قەزاو قەدەردا دەڵێ: (فويل لِمَنْ صَارَ لِلَّـهِ تَعَالَى فِي الْقَدَرِ خَصِيمًا) ، دەجا وای بۆ ئەو کەسەی (هەڕەشە بۆ ئەو کەسەی) لە مەسەلەی قەدەردا مشتو مڕ لەگەڵ خوای بەرزدا دەکات، (وَأَحْضَرَ لِلنَّظَرِ فِيهِ قَلْبًا سَقِيمًا) بۆ سەرنج دان لە مەسەلەی قەدەرو بۆ تێفکرینی ئەو مەسەلە وردو قووڵو گرنگە، دڵێکی نەخۆشی ئامادە کردوە، ئەو مەسەلە قووڵو گرنگەی کە وەك لە ڕابردوودا گوتمان: نەك هەر ئێمە، بگرە هیچ پێغەمبەرێك (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) و هیچ کام لە فریشتە نێزیکەکانی خواش، وەك پێویست، نهێنی ئەو مەتەڵەی پێ شینەکراوەتەوە، کەچی ئەو دەیەوێ بەدڵێکی نەخۆش لێی تێبگاتو، بەدڵی نەخۆشیش ئینسان نەك هەر لەو مەسەلە وردو قووڵە، بەڵکو لەهیچ مەسەلەیەکی ئیمانیی حاڵی نابێ!! ( لَقَدِ الْتَمَسَ بِوَهَمِهِ فِي فَحْصِ الْغَيْبِ سِرًّا كَتِيمًا) هەرکەسێك وابکات: مانای وایە ویستوویەتی بەوەهمو خەیاڵی خۆی، پەی بە نهێنییەکانی شێرراوە بەرێ، لەڕێی پشکنینی پەنهان (غَيب)ەوە!

دیارە بابایەکی واش، جگە لەدەست لەبنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەرچوون، هیچی دیکەی پێ نابڕێ! ئنجا ئاشکرایە کە بابای ئاواش گوناهبار دەبێ، بۆیە دەڵێ: (وَعَادَ بِمَا قَالَ فِيهِ أَفَّاكًا أَثِيمًا) واتە: کەسێك بەو شێوەیە لە قەزاو قەدەردا مشتو مڕ دەکات، بەبێ زانست، بە دڵێکی نەخۆشەوە، ئەوە بەو هەڵوێستو قسانەی خۆی دەبێتە درۆ هەڵبەستێکی تاوانبارو بوختان بۆ خوای پاكو تاك دەکات، بۆچی؟ چونکە: یان وەك موعتەزیلەکان دەڵێ: خوا عیلمی نەبووە بەو شتانەی کە گوناهباران دەیکەن کە بە حیسابی خۆی دیفاع لە عەدالەتی خوا دەکات، یان دەبێ بڵێ: خوا ویستی لەسەر گوناحو خراپەی بەندەکان نەبووە، ئەویش بە حیسابی خۆی هەر دیفاع لە عەدالەتی خوا دەکات،

وەك قەدەرییەكان، یان دەبێ وەك جەبرییەكان، ویستی ئینسان نەفی بكاتو بڵێ: ئینسان هەموو كارێكی خوا پێی دەكاتو وەك پەڕە مریشكێك وایە بەدەم باوە! بۆ ئەوەی دیفاع لە زانستی خواو ئیرادەی خوا بكات، بەڵام دادگەریی خوا دەڕووشێنێو زیانی پێ دەگەیەنێ[1]، بەڵام ئینسان، ئەگەر بەدڵێكی سەلیمەوە ڕاستو ڕێك لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا ڕووبەڕوو ببێتەوە، هەتا ئەو ئەندازەیەی كە عەقڵ دەیبڕێ لەگەڵیدا دەڕواو، لەوە بە دواوە دەڵێ: تازە لێرەدا تەواو، من دڵنیام كە خوا دادگەرەو كاربەجێیە هەموو شتێك دەزانێو هیچ شتێك لە ژێر ڕكێفی خوا ناچێتە دەر، بەڵام لێرە بەولاوە چۆنەو چۆن نیە؟ من چۆنییەتییەكەی نازانم، ئینسانیش ویستو هەڵبژاردنێكی پێدراوە بۆ ئەوەی پێی تاقی بكرێتەوە، لەوە زیاتر بەدوای ناكەوێ.

## مەسـەلەی چارەنووس :

لێرەدا شتێك هەیە جێی خۆیەتی ئاماژەی پێ بكەین: تەعبیرێك لە نێو كوردەواریی خۆماندا باوە دەڵێن: ئەوە لە نێوچەوانی نووسراوە، یان: ئەوە چارەنووسە، یان هەندێ كەس گلەیی لە بەختی خۆی دەكاتو دەڵێ: بەختم ڕەشە! دیارە وشەی چارەنووس ئەصڵی خۆی (چارە) لە (چهرە)ی فارسییەوە هاتوە، یانی (ڕوو)، واتە: لەڕووی نووسراوە، وەك لە كوردەواریی خۆماندا دەڵێن: لە نێوچەوانی نووسراوە.

ئنجا دەڵێین: لەڕاستیدا ئەو وشانە هەموویان وشەی ئەفسانەیینو حەقیقەتێكیان نیە، خوا هیچ شتێكی لە نێوچەوانی هیچ كەسێك نەنووسیوەو،هیچ شتێكی لەسەر هیچ كەسێك تاپۆ نەكردوە كە هەر دەبێ ئەو شتە بكات! بەڵكو زانیاری خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) سەبارەت بە كردەوەی بەندەكان، وەك ئاوێنە وایە، مەسەلەی قەدەرو زانیاری خوا، وەك ئاوێنە وایە. مرۆڤ دەچێتە بەردەم ئاوێنەیەك بۆ خۆی دیمەنو شكڵەكەی چۆن بێ، ئاوا لە ئاوێنەیەكەدا دەردەكەوێ، ئیدی ئەگەر دیمەنێكی جوانی هەبێ، لە ئاوێنەكە جوان

---

[1] واتە: لە زەینو خەیاڵی خۆی دا.

دەردەكەویۆ، ئەگەر دیمەنێكی ناشیرینی هەبێت، یان خاڵێكی ڕەشی بە نێوچەوانەوە بێ، چی پێوە بێو چۆن بێ، هەر ئەوە دەردەكەویۆ، خەتای ئاوێنەكەش نیە، بەڵێ زانیاری خوای زاناو قەدەری خوا، ئاوێنەیەكە ئێمە خۆمانی تێدا دەبینین، بەڵام ئێمە خۆمانین كە خۆمان جوان، یان ناشیرین دەكەین! بۆیەش خوای دادگەر بەردەوام لەسەر ویستی بەندە تەئكید دەكاتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ ...فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن ... ﴿٢٩﴾ ﴾الكهف، واتە: هەركەسێ دەیەوێ با ئیمان بێنێ، وە دەفەرموێ: ﴿ ...وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ... ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف، واتە: هەر كەسێكیش دەیەوێ، با كافر بێ، هەموو كەس دەتوانێ ئیمان بێنێو دەتوانێ كافریش بێ.

كەواتە: ئەوە ڕاست نیە كە خوا لە نێوچەوانی هیچ كەسی نووسیبێ كە: ئەی مرۆڤ! هەردەبێ ئاوا بكەی، بە تۆبزیی دەبێ ئاوا بكەی! خوا لە نێوچەوانی كەسی نەنووسیوە، كە: ناتوانی خراپە بكەیو دەبێ حەتمەن بەهەشتی بی، چونكە ئەگەر وابوایە ژیانی دنیا پێی نەدەگوترا: تاقیكرانەوەو، خوا نەیدەفەرموو: ﴿ ...لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ... ﴿٢﴾ ﴾ الملك، بەڵێ، خوای پەروەردگار لە ئەزەلەوە زانیویەتی ئێمە چی دەكەینو، چۆن دەكەین، بەڵام بە ویستی ئازادانەی خۆمانو بە هەڵبژاردنی خۆمان، هەر بۆیەش خوای كاربەجێ چوونە بەهەشتی بڕواداران و چوونە دۆزەخی بێبڕواو ستەمكارو گوناهباران، بەكردەوەكانی خۆیانەوە دەبەستێتەوە، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ الزخرف، واتە: ئەو بەهەشتەی كە كراوەتە میراتتان بەهۆی كردەوە (چاكە)كانتانەوە.

٢- ﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱصْلَوْهَا ٱلْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ

﴿٦٥﴾ یس، واتە: ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە هەڕەشەتان پێی لێدەکرا. بچنە نێوی بەهۆی کافر بوونتانەوە، ئەمڕۆ مۆر بەسەر زاریانەوە دەنێین‌و دەستیان دەماندوێنن‌و لاقیان شایەدیی دەدات لەسەر ئەوەی وەدەستیان دێنا.

کەواتە: چوونە بەهەشت‌و دۆزەخمان، هۆکارەکەی خۆمانین‌و ڕۆنی خۆمانە لەسەری خۆمان دەدرێتەوە!.

********



ئـەمـجاره نـووسەر لە هـەرسێك خـاڵی: (٤٩و ٥٠و ٥١)دا باسی عـەرشو كورسیو چـۆنییەتی پەیوەندییان بەخـوای بـەرزو بێ هـاوتـاوە دەكات، بـەڵام زۆر بـە كورتییو گوشـراویی، ئێمـەش هەروا سەرو ڕوونكردنەوەی كورتیـان لەسـەر دەدەین، سـەرەتا دەڵـێ:

### ٤٩) ( وَالْـعَـرْشُ وَالْـكُـرْسِيُّ حَـقٌّ ):

واتە: عەڕشو كورسی، ڕاستو هەقن، بڕوامان پێیان هەیە، واتە: عـەڕشو كورسـی دوانن لەو شتانەی كە خوا خوڵقاندوونیو بەشێكن لەو شتانەی كە عەقیدەی ئیسـلامیی فەرمانی بە شوێنكەوتوانی كردوە، بڕوایان پێیان هەبێ.

دیارە وشەی (عَـرْش) لە قورئاندا لە چـەند شـوێنان دووبـارە بۆتـەوە، بـەڵام وشـەی (كُرسيّ)، تەنیا لە ئایەتی كورسییدا كـە گـەورەترین ئایەتـە، هـاتوەو لـە فـەرموودەی پێغەمبەریش دا هاتوە، خـوای (عَزّ وجَـلّ) ئـاوا باسـی كورسـی دەكـات، دەفـەرموێ: ﴿ ...وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ... ﴿٢٥٥﴾ ﴾البقرة، واتە: كورسی خوا، ئاسمانـەكانو زەوی گرتۆتەوە، ئنجا ئەوەی كەپوختەی قسەو بۆچوونی زانایانە لەبەر تیشـكی چـەندان ئایەتو فەرموودەی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەربارەی عـەڕش، ئەوەیە كەعـەڕش لە ئەسڵی زماندا، یانی تەختو بارەگا، تەختو بارەگای پادشاو دەسەڵاتدارو حوكمڕانان، (كورسی)ش جسمێكە لە عەڕش بچووكتر لەو تەختو بارەگایە بچووكتر[1]، لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) باسی ئەوە كراوە كە حەوت ئاسمانـەكانو زەوی لـە بەرانبـەر عـەڕشـدا، وەك ئەنگوسـتیلەیەك وان كـە لـە بیابانێـك دا كـە فـڕێ دەدرێ،

١) لە زمانی عەرەبییدا وشەی (عَرش) بە: (الملك، سرير الملك) واتە: حوكمڕانیی، تەختو بارەگای حوكمڕانیی هاتوەو وشەی (كرسيّ)یش بە (السَّرير، العَرْش، مَقعَد من الخشب ونحوه لجالسٍ واحد) تەفسیر كراوە. المعجم الوسيط، ص ٥٩٣و ٧٨٣.

ئەنگوستیلەکە لەچاو ئەو بیابانە چەندە، ئاسمانەکان و زەوی لەچاو عەرش ئەوەندەن، حەڵقەیەك لە بیابانێك فڕێ بدرێ، ئەو حەڵقەیە لە چاو ئەو دەشتو بیابانەدا چەندە ئاسمانەکانو زەویش ئەوەندەن لەچاو عەرش[1].

ئنجا دیسان کورسی لە بەرانبەری عەرشدا، ئەویش وەك حەڵقەیەك وایە لە بیابانێك، ئەوەی کەوەردەگیرێ ئەوەیە کەکورسی وەك خوا دەفەرموێ: ﴿...وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ... ﴿٢٥٥﴾﴾البقرة، واتە: کورسی خوا هەموو بوونەوەری گرتۆتەوە، کورسیش لە بەرانبەر عەرشدا، وەك شتێکی زۆر بچووك وایە لە بەرانبەر شتێکی زۆر گەورەدا، یەکێك لەو فەرموودانە کە باسی عەرش دەکات ، قیاس و بەراوردی عەرش لەگەڵ بوونەوەردا دەکات، ئەم فەرموودەیە کە پسپۆڕانی فەرموودەناس بە بێهێز (ضعیف)یان داناوە:

{عَنْ عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): هَلْ تَدْرُونَ كَمْ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ؟ قَالَ: قُلْنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: بَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ خَمْسِ مِائَةِ سَنَةٍ، وَمِنْ كُلِّ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ مَسِيرَةُ خَمْسِ مِائَةِ سَنَةٍ، وَكِثَفُ كُلِّ سَمَاءٍ مَسِيرَةُ خَمْسِ مِائَةِ سَنَةٍ، وَفَوْقَ السَّمَاءِ السَّابِعَةِ بَحْرٌ بَيْنَ أَسْفَلِهِ وَأَعْلاهُ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ثُمَّ فَوْقَ ذَلِكَ ثَمَانِيَة أَوْعَالٍ بَيْنَ رُكَبِهِنَّ وَأَظْلافِهِنَّ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ثُمَّ فَوْقَ ذَلِكَ الْعَرْشُ بَيْنَ أَسْفَلِهِ وَأَعْلاهُ، كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، وَاللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فَوْقَ ذَلِكَ وَلَيْسَ يَخْفَى عَلَيْهِ مِنْ أَعْمَالِ بَنِي آدَمَ شَيْءٌ} (حديث ضعيف)[2].

---

١) {قَالَ رَسُول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): مَثَلُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ فِي الْكُرْسِيِّ كَحَلَقَةٍ مُلْقَاةٍ فِي فَلاَةٍ، وَإِنَّ فَضْلَ الْكُرْسِيِّ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، كَفَضْلِ الْفَلاَةِ عَلَى تِلْكَ الْحَلَقَةِ} أخرجهُ البيهقي في (الأسماء والصفات) رقم: (٨٣٠) وقَالَ: له شاهد بإسناد أصح، انظر (إتحاف الخيرة المهرة) رقم: (٣٣٧).

٢) أخرجه أحمد برقم: (١٧٧٠) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف جداً، وأبو يعلى برقم: (٦٧١٣)، قال حسين سليم أسد: إسناده ضعيف. وضعَّفهُ الألباني في (ضعيف الجامع) رقم: (٦٠٩٣).

واتە: عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: ئایا دەزانن نێوان ئاسمانو زەوی چەندە؟ گوتمان خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: نێوانی ئاسمانو زەوی (یانی: ئاسمانی یەکەم) ماوەی پێنج سەد ساڵە، {یانی: پێنج سەد ساڵ ڕێ، مەرج نیە ساڵی خۆمان بێ، ، چونکە ساڵ ساڵی تیشکی هەیە، ساڵی دیکەش هەیە، پێوەرەکان لە بوونەوەردا جیاجیان، ئەستێرەی ئێمە (خۆر) ساڵەکەی بریتیە لە ٣٦٠ ڕۆژ، بەڵام ئەستێرەی وا هەیە ساڵەکەی ملیۆنان بەرانبەری ساڵی ئێمەیە، ، چونکە زەوی ئێمە یەك دەورە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە لە بەرانبەری ڕۆژداو شەوو ڕۆژێك پێکدێنێ، واتە: (٣٦٥) دەورە دەخولێتەوە، ساڵێك پێکدێنێ، بەڵام ئەستێرەی وا هەیە پاش یەك ملیۆن ساڵ، ئنجا جارێك بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، ئنجا خوای گەورە کە باسی ڕۆژ (يَوْم) دەکات، دەفەرموێ:﴿ ...وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الحج، واتە: ڕۆژێك لەلای پەروەردگار وەك هەزار ساڵی ئێوە وایە، لە سوورەتی (المعارج)دا دەفەرموێ: ﴿ تَعْرُجُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ ﴾، واتە: فریشتەکانو (جبریل) سەردەکەون بەرەو خوا لە ڕۆژێکدا کە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵە. کەواتە: ڕۆژمان هەیە ماوەکەی پەنجا هەزار ساڵەو ،ڕۆژمان هەیە هەزار ساڵە، ئنجا هەر لەبەر تیشکی ئەو ئایەتانەو ئەو زانیارییانەشدا، دەبێ لەو ئایەتانە حاڵی بین کە خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ...﴿٤﴾ ﴾ الحديد، خوا ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردن، یانی: لە شەش ماوەو شەش کاتدا کە نازانین ئەو کاتانە (٣٦٥) ڕۆژن، یان (٢٤) سەعاتن، یان ملیۆنان ساڵن، هەر خوا خۆی دەزانێ، ئنجا کە دەفەرموێ: دووریی زەوی لە ئاسمانی یەکەم پێنج سەد (٥٠٠) ساڵە، ئایا (٥٠٠) ساڵ ڕێی ئەسپ، ڕێی تیشك، ڕێی چی؟ دیار نیەو هەر خوا بۆ خۆی دەزانێ، وە لە هەر ئاسمانێك، تا ئاسمانێکی

دیكە، ماوەی پێنج سەد ساڵە، (كەواتە: حەوت پێنج سەدی دەكاتە: سێ هەزارو پێنج سەد) چڕیی، یان ئەستووریی هەر ئاسمانێك، دیسان (٥٠٠) ساڵە، لە سەرووی ئاسمانی حەوتەمینەوە، دەریایەك هەیە لە خوارێوە تا سەرێی، وەك نێوانی ئاسمان و زەوییە،{واتە: ئەویش دیسان (٥٠٠) ساڵە، یاخود نێوان زەوی‌و ئاسمان (یانی ئاسمانی كۆتایی‌و زەوی یەكەم) ئەو كاتە دەكاتە (٣٥٠٠)، ئنجا (٣٥٠٠+٣٥٠٠= ٧٠٠٠) ، چونكە: ئەستووریی‌و بەرزیی هەر ئاسمانێك (٥٠٠) ساڵ ڕێ‌و نێوانی هەردوو ئاسمان (٥٠٠) ساڵ ڕێ، مانای: (٣٥٠٠ +٣٥٠٠= ٧٠٠٠) ساڵ}، ئنجا دەفەرموێ: لە سەرووی ئەو حەوت ئاسمانەوەو لە سەرووی ئەو دەریایەشەوە {وەك دەفەرموێ: ﴿... وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ...﴾ هود، واتە: بارەگای خوا لەسەر ئاوە} وە لەسەرووی ئەوانەوە هەموویان، هەشت نێریی هەن كە نێوان ئەژنۆو سمەكانیان وەك نێوان ئاسمان‌و زەوی یە، ئنجا لە سەرووی ئەوەشەوە عەرشی خوا هەیە كە لە بنی عەرشەوە، تاكو سەرەوەی وەك نێوانی ئاسمان‌و زەوی وایە، خواش تبارك و تعالى لە سەرووی هەموو ئەوانەوەیە (بە شێوەیەك كە لەخۆی دەوەشێتەوە).

واتە: كە دەڵێین: خوا لەسەر عەرشەوەیە، وەك لەسەر بوونی ئاسمان لەسەر ئاسمان‌و ئاسمان لەسەر زەوی‌و، دەریا لەسەر ئاسمانەكان‌و، عەرش لەسەر دەریا نیە، بەڵكو لەسەر بوونێك كە لە خوا دەوەشێتەوە، ، چونكە خوا وێنەی نیەو خوا لە سەرووی ئەو هەموو ئەو شتانەوەیە، بەشێوەیەك كە لە خەیاڵ‌و ئەندێشەی ئینساندا جێی نابێتەوەو شایستەی خۆیەتی.

ئنجا لەكۆتایی دا دەفەرمووێ: (وَلَيْسَ يَخْفَى عَلَيْهِ مِنْ أَعْمَالِ بَنِي آدَمَ شَيْءٌ) واتە: هیچ كام لە كردەوەی ئینسانەكان لە خوا ون نابێ‌و پەنهان نیە.

هەروەها (أبو داود)و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان كردوە كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: {إِنَّ عَرْشَهُ عَلَى سَمَوَاتِهِ لَهَكَذَا، وَقَالَ بِأَصَابِعِهِ مِثْلَ الْقُبَّةِ عَلَيْهِ}[1]

١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٢٨)، وَضَعَّفَهُ الألباني في (ظلال الجنة) رقم: (٥٧٥).

واتە: (پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ڕۆژێـك ویستی چۆنییەتی عـەرش لەگـەڵ بوونەوەردا وێنا (تصویر) بكات) فەرمووی: وێنەی عەرشی خوا لەسەر ئاسمانەكان ئاوایە: پەنجە پیرۆزەكانی بە شێوەی گومبەت لێكردن.

ئنجا لە ڕاستییدا مەسەلەی عەرش‌و كورسی‌و ئەو دروستكراوانەی دیكە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وەك زانیارییەك پێمان ڕادەگەیەنێ، ئەگەرنا، حەقیقـەتیان بـۆ ئێمە پەنهان‌و شێردراوەیە، واش پێدەچێ حیكمەتەكەی ئەوەبێ كە ئێمە فراوانیی موڵكی خوامان بۆ دەربكەوێ‌و لە ئەنجامدا بەرزیی‌و مـەزنیی‌و دەسـتەڵاتی خوامـان زیـاتر بـۆ دەربكەوێ.

ئنجا سەبارەت بەوە كە كورسی شتێكی هێنـدە گەورەیـە، ئـەو فەرموودەیـە هەیـە لەوبارەوە: {عَنْ أَبُو ذَرٍ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: مَا الْكُرْسِيُّ فِي الْعَرْشِ إِلاَّ كَحَلْقَةٍ مِنْ حَدِيدٍ أُلْقِيَتْ بَيْنَ ظَهْرَيْ فَلاةٍ مِنْ الأَرْضِ}حديث صحيح[1]،

واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەیفەرموو: كورسی لە بەرانبەر عەرشدا، وەك حەڵقەیەكی ئاسن وایە لە بیابانێكی فراواندا فڕێ درابێ، واتە: حەڵقەكە لە چاو بیابانەكە چەندە، كورسیش لە بەرانبەر عەرشدا ئەوەندەیە، بە مەرجێك كورسی خوا هەموو بوونەوەریشی گرتۆتە خۆی، وەك دەفـەرموێ ﴿...وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ... ﴿٢٥٥﴾﴾البقرة، كورسی خوا، ئاسمانەكان‌و زەوی گرتوونە خۆی. لەگەڵ ئەوەشدا كورسی لە چاو عەرش هەر ئەوەندەیە، ئەدی عەرش دەبێ چەند بێ؟!

شایانی باسیشە كە زۆرێك لە زانایان‌و توێژەرەوانی قورئان وشەی (كُرْسِيُّهُ)یـان لـە ئایەتی كورسیدا بە زانیاریی خوا (عِلمُ الله) لێكداوەتـەوە، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی

---

١) أخرجه أبو الشيخ في "العظمة" (ج٢، ص٥٨٧)، وابن جرير في "تفسيره" أي (جامع البيان، ج٥، ص٣٩٩) الطبعة: الأولى، ١٤٢٠ هـ-٢٠٠٠ م، المحقق: أحمد محمد شاكر، وصحّحه الألباني.

دەستەلاّتی خوا (قُدْرَةُ الله) بێ[1]، بە تایبەتیش كە وشەی (كُرْسِيّ) تەنیا لە (آية الكرسيّ)دا هاتوە، بە پێچەوانەی (عَرش)ەوە كە لەچەندان ئایەتدا هاتوە، پاشان ئەو دەقانەی سوننەتیش كە باسی (كرسيّ)یان تێدا هاتوە، وەك دروستكراوێكی سەربەخۆی جەستەیی، هیچیان سەنەدەكەیان ئەو هێزو پێزەی نیە كە بۆ ئیسپاتی شتێكی وا كە پێویست بێ ئیمانی پێ بهێنرێو بخرێتە نێو عەقیدە،كە پشتی پێ ببەسترێ، منیش ئێستا ئەم ڕایەم پێ ڕاستو پەسندە.

ئنجا نووسەر باسی چۆنییەتی عەرشو كورسیو، پەیوەندیی بەخوای بەرزو مەزنەوە دەكاتو، دەڵێ:

**٥٠) ( وَهُوَ مُسْتَغْنٍ عَنِ الْعَرْشِ وَمَا دُونَهُ ):**

واتە: خوا بێ نیازە لە عەرشو لەوەی لە خوار عەرشیشەوەیە، واتە: كە دەڵێین: خوا لەسەر عەرشە، لەسەر تەختو بارەگای خۆیەتی، بەو مانایە نیە كە خوا لە سەری وەستاوە! چونكە كاتێك بووە، نە عەرش بووەو نەكورسی بووە، نە ئاسمان بووەو، نەهیچ شتێك بووە، بەلاّم خوای بەرزو مەزن هەر بووە، یانی: خوا كە باسی بارەگاو كورسی خۆی دەكات، كورسی دەستەلاّتی بەومانایە نیە كە ئێمە وای بۆ بچین: خوا چوار چمكیی لەسەر كورسییەك دانیشتوەو، تەختو بارەگایەك خوای بێ وێنەی هەڵگرتوە، نا!! بەڵكو خوا دەفەرموێ: من تەختو بارەگایەكم هەیە (بە شێوەیەك، كە لە خوا دەوەشێتەوە) ئیدی ئێمە ناڵێین: مەبەست لە عەرشی خوا، یانی: موڵكی خواو دەستەلاّتی خوا، وەك هەندێك لە زانایانی پاشین (خَلَف) ئاوا (عَرش) تەئویل دەكەن. دیارە زانایان سەبارەت بە بابەتەكانی عەقیدە دوو بەشن: بەشێكیان پێیان دەگوترێ: زانایانی پێشین (سلف)،

---

١)عن ابن عباس رضي الله عنهما تفسير الكرسيِّ بالعلم، وهو قول المجاهد، وفُسِّر بالملك والسلطان والقدرة، وهي معانٍ مجازية.

بڕوانە: صفوة البيان لمعاني القرآن، للشيخ حسنين محمد مخلوف، ص ٦١.

بەشێکیان پێیان دەگوترێ: زانایانی پاشین (خَلف)، زانایانی پێشین هەڵوێستیان بەرانبەر بەعەرش و سیفەت و ناوە بەرزو بێ وێنەکانی ئەوەیە، کە دەڵێن: هەرچی خوا فەرموویەتی و پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەربارەی خوا فەرموویەتی و، بە شێوەیەکی ڕاست بەئێمە گەیشتوە، ئێمە دانی پێدادەهێنین بەو شێوەیەی کە خوا فەرموویەتی، بەڵام چۆنییەتییەکەی حەواڵەی خوا دەکەین، بۆ وێنە: دەڵێین: خوا لەسەر عەرشە، بەڵام چۆن لەسەر عەرشە؟ خوا بۆ خۆی دەزانێ، دەڵێین: خوا فەرموودەی هەیەو، دیتنی هەیەو، بیستنی هەیە، دەڵێین: خوا هەموو شەوێك دێتە ئاسمانی یەکەم، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دا هاتوە، بەڵام چۆن دێ؟ نازانین، دەڵێین: هاتنێك کە لەگەڵ خوادا دەگونجێ، یان دەڵێین: خوا (ڕوو)ی هەیە، بەڵام بە شێوەیەك کە لەگەڵ زاتی دەگونجێ.

بەڵام زانایانی پاشین (خلف) گوتوویانە: نەخێر ئێمە دێنین ئەو شتانە تەئویل دەکەین و دەڵێین: مەبەست لە عەرش، یانی دەستەڵات و، مەبەست لە دەست، یانی: دەستەڵات، یان چاکەو نیعمەت، ڕوو (وجە) یانی: زات، یان ڕەزامەندیی.

بەڵام، بەحەقیقەت قسەو هەڵوێستی زانایانی پاشین بێهێزە، ئەوەی زیاتر جێی متمانەو پشت پێ بەستنە، بەتایبەت لە بارەی (عَرْش)ەوە کە لە چەندان ئایەت و چەندان فەرموودەی ڕاست (صحیح)دا باسکراوە، هەر قسەو هەڵوێستی زانایانی پێشینە، چونکە:

<u>یەکەم</u>: کە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) لە چەند شوێنان دووبارەی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ ... ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ... ﴿٤﴾ ﴾السجدة، یان دەفەرموێ: ﴿ ... وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ... ﴿٧﴾ ﴾ هود، مانای وایە عەرش شتێکە، یاخود جسمێکەو حەقیقەتێکی هەیە.

دووەم: ئنجا خوای كاربەجێ بە ڕاشكاویی لە سوورەتی (الحاقة)دا دەفەرمووێ: ﴿... وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾﴾، لە ڕۆژی دواییدا هەشت، عەرشی خوا هەڵدەگرن. كەواتە: عەرش شتێكە هەڵدەگیرێو شتێكە دەست دەدرێتێ، ئیدی بۆچی ئێمە بڵێین: عەرش، یانی: موڵكو دەستەلاتی خوا، نەخێر، دەستەلاتی خوا دەست نادرێتێو موڵكی خوا بەو شێوەیە تەعبیری لێناكرێ.

كەواتە: عەرش (تەختو بارەگا) مەخلووقێكە، كە خوا خوڵقاندوویەتی، خوا لەسەر عەرشە بە شێوەیەك، كە لەگەڵ زاتی خۆیدا دەگونجێ، بەلاَم چۆنییەتییەكەی بڕیار نادەینو لێی ناكۆڵینەوە، بۆچی؟؟ چونكە عەقڵی ئێمە زۆر لەوە كەمترە كە جێی ئەو شتانەی تێدا ببێتەوە، بۆ وێنە: پەرداخێك بتەوێ تەنەكەیەك ئاوی تێبكەی، جێگەی نابێتەوە، عەقڵی ئێمەش لە قەدەر خۆی شت دەگرێ، ئێمە تا ئێستا لە هەندێك لە مەخلووقە بچووكەكانی خوا سەرمان دەرناچێ، بۆ وێنە: تا ئێستا نازانین هێزی كێشندە (قوّة الجاذبية) چییە؟ یان هێزی موگناتیس؟ یان تیشكی ژێر سوور؟ یان تیشكی سەروو وەنەوشەیی؟ یان عاتیفەو هەستو نەست؟ ئەگەر هەرچی تاقیگەی دنیا هەیە، هەرچی پسپۆڕو پزیشكی دنیا هەیە، لە تۆ بكۆڵنەوەو دەروونت یەكالاَ بكەنەوە، ئەو خۆشەویستیو بوغزەی تێیدایە، كەس نایزانێ، یاخود ئەو قسەیەی كە قسەكەر دەیڵێ، لەڕێی شەپۆڵی هەواوە دەنگەكە دەگاتە گوێی بیسەر، ئەوەی دەگاتە گوێی بیسەر، شتێكی ماددییە، چونكە گوێ كۆئەندامێكی ماددییەو شتی ماددیی هەست پێدەكات، بەلاَم دوای ئەوەی كەگوێ ئەو دەنگانەو ئەو وشانە وەردەگرێ دەیانشكێنێت، حەقیقەتێكیان تێدایە كە كاكڵی ئەو وشانەیە ماناكەیانە، ماناكەیان بە چی وەردەگیرێ، ئایا مانای ئەو وشانە، هیچ كەس دیویەتی؟ تامی كردوە؟ دەستی لێداوە؟ بۆنی كردوە؟ نەخێر، بەلاَم هەشە، كەواتە: سەبارەت بە مەسەلەی عەرشو لەوحو قەڵەمو ئەو وشانە كە خوای پەروەردگار فەرموونی، ئێمە دانیان پێدا دەهێنین كە هەن، بەلاَم بەو شێوەیەی كە خوا بۆ خۆی دەزانێ، ئەوەندە هەیە، وەك لێرەدا نووسەری كتێب (طحاوي) بە شێوەیەكی زۆر جوان هێناویەتی، دەڵێ: (وَهُوَ مُسْتَغْنٍ عَنِ الْعَرْشِ وَمَا دُونَهُ)، خوا بێنیازەو بێ ئیحتیاجە لە عەرشو لەوەی كە لە خوار عەرشیشەوەیە، خوا

پێویستی بە یەكێك لە مەخلووقەكانی خۆی نیە هەڵیبگرێ، بەڵكو عەرشو ئاسمانەكانو زەوی، هەر هەموویان خوا هەڵی گرتوون، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ... ﴿٤١﴾ ﴾فاطر، واتە: خوا ئاسمانەكانو زەوی دەگرێ لەوەی كە لابچنو لەبەین بچن. كەواتە: خوا دەیانگرێ، نەك ئەوان خوایان هەڵگرتبێ، خوا عەرشو زەویو ئاسمانەكانی هەڵگرتوون، ئەگەر عەرشو ئاسمانەكانو زەوی لەبەین بچن، كێ هەیە بیانگرێ غەیری خوا؟

لە كۆتاییدا لەبارەی پەیوەندیی عەرشو غەیری عەرشەوە بە خوای بەرزو مەزنو بێ وێنەوە، دەڵێ:

**٥١) ( مُحِيطٌ بِكُلِّ شَيْءٍ وَفَوْقَهُ، وَقَدْ أَعْجَزَ عَنِ الإِحَاطَةِ خَلْقَهُ ):**

واتە: خوا دەوری هەموو شتێكی داوەو، لە سەرووی هەموو شتێكەوەیە، لێرەدا بە هەڵە دانەچن! خوا كە دەوری هەموو شتێك دەداتو لە سەرووی هەموو شتێكەوەیە، ئەمە ئەوە ناگەیەنی كە خوا وەك جیسمێك دەوری جیسمێكی دابێ، چونكە خوا جیسم نیە!

خوا دەوری هەموو شتێكی داوە بە: ویستو دەستەلاٚتو زانیاریو...هتدی خۆی، بەڵام دەورە دانێك كە خۆی دەزانێ، ئێمە نایەین تەئویلی بكەینو بڵێین: خوا دەوری هەموو شتێكی داوە بە ویستو زانیارییو دەستەلاٚتی خۆی بە تەنیا، بەڵكو دەڵێین: بە هەموو شێوەیەك لە شێوەكانی دەورەدان (إحاطة) خوا دەوری مەخلووقەكانی خۆی داوە، بەڵام بە شێوەیەك كە لە خۆی دەوەشێتەوە، نەك بەو مانایەی كە بە مێشكی ئێمەدا دێ، ئێستا دەتوانم بڵێم دەستی من دەوری ئەو كتێبەی داوە، بەڵام ئایا دەورەدانی خوا بۆ هەموو شتێك ئاوایە؟؟ نەخێر، چونكە ئەو دەورەدانە لە خوا ناوەشێتەوە﴿ ...لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ... ﴿١١﴾ ﴾الشورى، ئایا خوا دەوری كەونو كائیناتیداوە؟ بەڵێ، دەوری

داوە، چۆن؟ نازانین چۆن چونکە زاتی خوا لەلای ئێمە مەعلووم نیە، شـــتەکە ڕوونە، زاتی خوا بۆ ئێمە مەعلووم نیە، دەورە دانەکەشی کە یەکێکە لە سیفەتەکانی، دیسان بۆ ئێمە زانراو نیە، ئێمە کە نازانین زاتەکەی چۆنە، سیفەتەکانی خـواش لقـی زاتـینی. کەواتـە: ئەوانیش زانراو نین.

بەکورتی ناڵێین: مەبەست لە دەورەدان ئەوەیە کەخوا زانیاری بە هەموو شتێك هەیە، یان خوا دەستەڵاتی بەسەر هەموو شـــتێکدا هەیـە، یـان خـوا ویسـتی بەسـەر هـەموو شتێکدا زاڵە، ، چونکە ئەوە دیارە کە وایە، بەڵام لەهەمـان کاتدا دەبێ بڵێین: مەبەست لە دەورەدان (إحاطة)، یانی: هەر مانایەك کە دەورەدان (إحاطة) دەیگەیەنێ بۆ خوای بێوێنە سەبارەت بە دروستکراوەکانی خۆی لە هەموو ڕوویێکـەوە، بـەڵام بـەو شـــێوەیەنا کـە جیسمێك دەوری جیســـمێك دەدات، چونکە ئەوە دەکاتە پێچواندن (تشبیه)و ئەوە کە تۆ، خوای بەرز، وەك یەکێك لە دروستکراوەکانی بهێنیـە بەرچـاو، ئـەوەش لـە خـوا دوورە، بەڵـــێ، ئێمە دان بە سیفەتەکانی خوادا دەهێنین، بەو شێوەی کە خوا فەرمووني، بـەڵام ســـیفەتەکانی بەپاك دەگرین لەوەی وەك هی دروستکراوەکانی بچن.

(وَقَدْ أَعْجَزَ عَنِ الإِحَاطَةِ خَلْقَهُ)، خوا دروستکراوەکانی خۆی دەستەوستان کـردوە کـە بتوانن دەورەی بدەن، نە دەورەدانی جیسمیی کـە لـە عـەقڵی ئێمـەدا جێـی دەبێتـەوە، نەدەورەدانی زانیاریی، نەدەورەدانی بینینیی، هیچ کەس ناتوانێ خـوا بناسـێ وەك بـۆی شایانو پێویستە، وەهیچ کەس ناتوانێ خوا ببینێ وەك پێویست، هەتا لـە بەهەشـتیش، بەڵکو هەرکەس لە قەدەر خۆی، خوا دەبینێ. کەواتە: کە خوای پەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾ الأنعـــــام،

نەیفەرمووە: (لا تَراهُ الأبْصار)، چونکە ئەگەر وای فەرموویایە، یانی: چاوەکان نـاییبینن، بەڵکو فەرموویەتی: چاوەکان ناتوانن دەوری خـوا بـدەنو لـە هـەموو ڕوویێکـەوە، وەك پێویست حەقیقەتی خوا ئاشکرا بکەن، بەڵام گۆشەیەك لە بەرزییو مەزنیی خوا دەبینن، بە قەدەر ئامادەییو توانای خۆیان.

## هەڵوەستەیەكی پێویست لە بەرانبەر تەئویل دا

لێرەدا بە پێویستی دەزانم، لەبارەی تەئویل كردنو نەكردنی سیفەتەكانی خوای بێ وێنەو هاوەڵەوە، بە گشتییو بەتایبەت سیفەتە خەبەرییەكان (الصِّفات الخَبَرِيّة) وەك: چوونە سەر عەرشو هاتن (المجيء)و ڕوو (الوجه)و دەست (اليد)و...هتد ڕوونكردنەوەیەك بڵێم، كە دواتر پاش لێكۆڵینەوەو وردبوونەوەو موتالای پتر لەو بارەوە پێیگەیشتوومو، ئەوە بەڕاست دەزانمو لە هەركام لە {ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی...} بەرگی (٣)و {الإسلام كَما يَتَجَلّى في كِتابِ الله}بەرگی (٢)دا بە درێژیی هێناومەو، لێرەش زۆر بە كورتییو گوشراویی دەیهێنم:

یەكەم: وشەی (تأويل) لە ئەسڵی زمانی عەرەبییو بەكارهێنانی قورئاندا، بە مانای چەسپان (تحقُّق) و هاتنەدی شتێكە، كە پێشتر هەواڵی پێدراوە، وەك لەم ئایەتانەوە دیارە: ﴿... هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰيَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا ... ١٠٠﴾ یوسف. ﴿بَلْ كَذَّبُواْ بِمَا لَمْ يُحِيطُواْ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ... ٣٩﴾ یونس، ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ... ٥٣﴾ الأعراف.

بەڵام دوایی زانایان بە دوو واتای دیكەش بەكاریان هێناوە:

أ- تەفسیر كردنو لێكدانەوە، وەك (الطبري) لە تەفسیرەكەیدا دەڵێ: (وَتَأْوِيلُ هذه الآية عِندنا....).

ب- لادانی وشەیەك لە مانا ڕواڵەتو ئاشكرایەكەی، بۆ مانایەكی دیكەی پەنهان، یان مەجازیی لەبەر ڕێگرییێك (صرف كلمة عن مَعناها الظاهر المتبادر إلى معنى خفي أو مجازي، لوجود مانع).

دووەم: ڕاست نیه كه تەنیا زانایانی پاشین (خَلَف) تەئویلیان كردبێ‌و، هی پێشین (سَلَف) نەیانكردبێ، بەڵكو ئەوە خاڵی هاوبەشی پێشین‌و پاشین بووە، له بەرانبەر هەندێك دەقی قوڕئان‌و سوننەت دا كه ناگونجێ مانا ڕواڵەتییەكەیان لێ بگرین، بۆ نموونه: ﴿... وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤﴾﴾ الحديد. واته: خوا لەگەڵتانه له هەرجێیەك بن‌و خوا بینەری كردەوەكانتانه.

تێكڕای زانایان به (أحمد بن حنبل)یشەوە، بەمجۆرە تەئویلیان كردووە: (وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ : أي بعلمه وقدرته)[1] واته: خوا، به زانیاریی‌و دەستەڵاتی لەگەڵتانه، له هەرجێیەك بن.

سێیەم: هەڵەی هەندێك له زانایانی پاشین (خَلَف)یش ئەسڵی تەئویلكردن نەبووە، چونكه ئەوە هەر بووە لەكاتی پێویست‌و ناچارییدا، بەڵكو هەڵەكەیان بەتایبەت (الأشاعرة والماتريدية) ئەوەبووە، كه بازنەی (تأويل)یان زۆر فراوان كردوەو، سەرەنجام بەرانبەر به سیفەتەكانی خوا، خۆیان گیرۆدەی پەكخستن (تعطيل) كردوە، وەك چۆن بەرانبەرەكانیشیان بەهۆی زێدەڕۆیییەوە، هەندێك جار گیرۆدەی وێچواندن (تَشبِيه)و بگره جەستاندن (تَجْسِيد)یش بوون!.

*******

١) بڕوانه: (جامع البيان) للطبري، وە (تفسير القرآن العظيم) لأبن كثير، وە (زاد المسير في علم التفسير) لابن الجوزي، ص١٣٩٦، كه (طبري) گوتوویەتی: {وهو معكم أينما كنتم} يقول: وهو شاهد لكم أيها الناس أينما كنتم يعلمكم ويعلم أعمالكم...). (إبن كثير)یش گوتوویەتی:{(وهو معكم أينما كنتم والله بما تعملون بصير) أي رقيب عليكم شهيد على أعمالكم...}.

## خــوا، ئیبــڕاهیمی بە شێوەی تـایبـەت خـۆشـویسـتـوەو مووسـاشـی دواندوە

ئەمجارە نووسەر دێتە سەر خستنە ڕووی هەندێك بابەتی دیكە، وەك چەند موفرەدەیەكی عەقیدەی ئیسلامیی، بەڵام مەبەستی ئەو، زیاتر بەرپەرچدانەوەی هەندێك بیرۆكەی داهێنراوی ڕۆژگاری خۆی بووە، دەڵێ:

**٥٢) ( وَنقُولُ: إِنَّ اللهَ اتَّخذَ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً، وَكَلَّمَ اللهُ مُوسَى تَكْلِيمًا، إِيمَانًا وَتَصْدِيقًا وَتَسْلِيمًا ):**

واتە: ئێمە دەڵێین: بێگومان خوا، ئیبراهیمی كردوە بە دۆستو خۆشەویستی تایبەتی خۆی، فەرمایشتی لەگەڵ مووسادا كردوە، بە قسە لەگەڵ كردن، كەواش دەڵێین: بڕوامان هەیەو بەڕاستی دەزانینو گەردن كەچیشین بۆی.

ئەوە بەرپەرچ دانەوەی هەندێك بیرۆكەی داهێنەرانە (أفكار ابتداعية)یە، كە دەڵێن: ئینسان زۆر لەوە كەمترە كە خوا بیكات بە دۆستی خۆیو بە خۆشەویستی خۆی. موعتەزیلە دەڵێن: خوا هیچ ئینسانێكی خۆش ناوێ، یان دەڵێن ئینسان چییە، تاكو خوا قسەی لەگەڵدا بكات!! ئەدی ئەو ئایەتانە چۆن مانا دەكەن؟ بۆ وێنە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) دەفەرموێ: ﴿...وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾﴾النساء، خوا ئیبراهیمی كردوە بە دۆستو خەلیلی خۆی، ئەوان دەڵێن: یانی: خوا، چاكەی لەگەڵ ئیبراهیم دا كردوە، چونكە دۆست ئەو كەسەیە كە چاكەی لەگەڵدا بكەی، بەڵام ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەڵێن: نەخێر خوا (جلّ جلاله) ئیبراهیمی خۆشویستوە، قسەشی لەگەڵ مووسادا كردوە، چونكە دەفەرموێ: ﴿...وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾﴾النساء، خوا قسەی لەگەڵ مووسادا كردوە بە قسەكردنێك (كە خوا بۆ خۆی دەزانێ)، ئێمەش بڕوامان پێی هەیەو

بەڕاستیشی دەزانین‌و گەردنکەچیشین بۆی، ئنجا لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفـەرموێ: {فَـإِنَّ اللهَ تَعَـالَى قَـدِ اتَّخَـذَنِي خَلِـيلاً، كَمَـا اتَّخَـذَ إِبْـرَاهِيمَ خَلِيلاً} حديث صحيح.[١]

واتە: بێگومان خوا منی کردوە بە دۆستی خۆی، وەك چۆن ئیبڕاهیمیشـی کـردوە بـە دۆست‌و خۆشەویستی خۆی، پێغەمبەری ئێمە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خۆشەویستی خوایە‌و خەلیلی خواشە، خەلیل ئەو کەسەیە کە لە هەموو کەست خۆشتر بوێ، پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: { لَوْ كُنْتُ مُتَّخِذاً خَلِيلاً لاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْـرٍ خَلِيلاً، وَلَكِنَّهُ أَخِي وَصَاحِبِي، وَقَدْ اتَّخَذَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ صَاحِبَكُمْ خَلِيلاً }حديث صحيح.[٢]

واتە: ئەگەر کەسێکم گرتبا بە دۆستی زۆر نیزیکی خـۆم، ئـەوە ئـەبو بـەکرم دەکـرد بەدۆستی زۆر نیزیکی خۆم، بەلام ئەو برامـەو برادەرمـە، وە ئـەو هاوەڵـەی ئێـوە (کـە موحەممەدە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)) خەلیلی خوایە.

*****




١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٥٣٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٤٢٥).
٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٣٢٢) عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

ئەمجارە نووسەر زۆر بە کورتیی‌و خێراییی، باسی سێ پایە لە پێنج پایە گەورەکانی ئیمان دەکات کە بریتین لە:

١- ئیمان هێنان بە فریشتەکانی خوا.

٢- ئیمان هێنان بە کتێبەکانی خوا.

٣- ئیمان هێنان بە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام).

دیارە ئەو خێراییکردنەی نووسەر (خوا لێی خۆش بێ)، لە خستنە ڕووی سێ پایەی گەورەو گرنگی ئیماندا و، هێندە دووبارەکردنەوەیشی بۆ هەندێك بابەتی دیکەی وەك (قەدەر)، بەڵگەی ئەوەیە کە کتێبەکەی زیاتر لەبەر ڕۆشناییی‌و، لە ژێر کاریگەریی واقیعی فیکریی کۆمەڵگای خۆیدا نووسیوەو، چ شتێکی لە ڕۆژگاری خۆیدا بە پێویستتر زانیوە، زیاتر لەبارەیەوە دواوەو بە پێچەوانەشەوە، هەڵبەتە تەنیا ئەو کتێبەی (أبو جعفر الطحاوي)یش وانیە، بەڵکو زۆربەی هەرەزۆری کتێبەکانی زانایان هەروان. بۆ وێنە: (كِتاب التوحيد)ی (محمد بن عبدالوهاب)و (العقيدة الواسطية)ی (إبن تيمية)و هی دیکەش.

مەبەستیشم لە خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە ئەوەیە کە:

بێجگە لە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ناگونجێ هیچ کتێبو بەرهەمێك وای تەماشا بکرێ، کە ئیسلام بە گشتیی، یان بابەتێکی ئیسلامی تێدابێ‌و، مرۆڤ لەو ڕووەوە بێنیاز بکات!

بەڵێ، ئەوەی هەموو شتێکی تێدایە لەبارەی ئیسلامەوەو، مرۆڤ بێنیاز دەکات، تەنیا قورئان‌و سوننەتن‌و، هەر ئەوان هەموو ئیسلامیان بۆ هەموو کەس‌و سەرجەم ڕۆژگارو تێکڕای کۆمەڵگایەکانی تێدایە!

## ٥٣) ( وَنُؤْمِنُ بِالْمَلائِكَةِ وَالنَبِيّينَ، وَالْكُتُبِ الْمُنَزَّلَةِ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَنَشْهَدُ أَنَّهُمْ كَانُوا عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ ):

واتە: بڕوامان هەیە بە فریشتەکان، بە پێغەمبەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، بەو کتێبانەی دابەزێنراونە سەر پێغەمبەران، شایەدیی دەدەین کە لەسەر بەرنامەیەكو هەقێکی ڕوونو ئاشکرا بوون، بەڵێ، پێغەمبەران لەو ڕووەوە کە لەسەر بەرنامەیەكو شەریعەتێك بوون کە پڕ بەپێستی ژیانی ئینسانەکان بووە، لەو ڕووەوە پێغەمبەران هەموویان یەکن کەواتە ﴿...لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ... ﴿٢٨٥﴾﴾البقرة، یانی: لەو ڕووەوە، کە بەرنامەی هەموویان ڕاستە، بەرنامەی پێغەمبەران تەواوترین بەرنامە بووە، ئەدی کە خوا (عز وجل) دەفەرموێ: ﴿...وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴿٥٥﴾﴾ الإسراء، هەندێك لە پێغەمبەرانمان بەرز کردۆتەوە بەسەر هەندێکیان دا. ئەو دوو ئایەتە چۆنیان لێك بدەینەوە؟

ئایەتی یەکەم یانی: لەو ڕووەوە کە هەموویان پێغەمبەری خوانو بەرنامەیان لەلایەن خواوە بۆ هاتوە، هی هەر کام لە پێغەمبەران لە کاتی خۆیداو لە سەردەمی خۆیدا، تەواوترین بەرنامە بووەو تاکە بەرنامەی ڕاستی ژیان بووە، لەو ڕووەوە پێغەمبەران هیچ جیاوازییان نەبووە، بەڵام لەو ڕووەوە کە هەندێکیان لە هەندێکیان گەورەترن، وەك لە ئایەتی دووەم دا هاتوە، بۆ وێنە پێنجیان[1] (أولي العزم)ن: (نووح، ئیبراهیم، عیسا، مووسا، موحەممەد) (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، سەروەری هەر هەموشیان (محمد) پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، لەو بارەشەوە بەڵگە زۆرن، بەڵام ئاماژە بە دوانیان دەکەین:

١) بەڵام لە بەرگی (٤)ی کتێبی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا ڕوونمان کردۆتەوە کە سەرجەم پێغەمبەرانی خوا (عليهم الصلاة والسلام) خاوەن عەزمو ئیرادەی پتەو بوون، نەك تەنیا ئەو پێنجە، هەرچەندە ئەو پێنجە لەوانی دیکەش گەورەتر بن.

یەکـەم: وەك لە فەرموودەیەکدا هاتوە کـە پێغەمبـەر (محمـد صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّم) دەفەرموێ: {«أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَوَّلُ مَنْ يَنْشَقُّ عَنْهُ الْقَبْرُ وَأَوَّلُ شَافِعٍ وَأَوَّلُ مُشَفَّعٍ»} حديث صحيح.[1]

واتە: من گەورەی وەچەی ئادەمم لە ڕۆژی دواییدا، وە یەکەمین کەسم، کە گۆڕم بۆ ئاوەڵا دەبیٚو دێمە دەر، وە یەکەمین کەسم کە تکا دەکەم (بۆ ئوممەتمو بۆ مرۆڤـایەتیی لە ڕۆژی دواییدا)، وە یەکەمین کەسێکم کە ڕێگام دەدرێ کە تکاو شەفاعەت بکـەمو تکاشم وەردەگیرێ.

دووەم: پێغەمبەرانی دیکە بۆ کاتێکی دیاریکراوو بۆ قەومێکی دیـاری کـراو نێـردراون، بەڵام پێغەمبەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بۆ تێکڕای جیهانییانە، وەك خوا (جلّ جلاله) لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبياء، واتە: ئێمە تۆمان ناردوە،کە بەڕەحمەتو بەزەیی (خوا) بی بۆ هەموو جیهانییان.

کەواتە: لەو ڕووەوە کە هەموویان پێغەمبەری خوانو خاوەنی پەیامو بەرنامـەن، وەك یەکن، بەڵام لەو ڕووەوە کە هەندێکیان لە هەندێکیان دامەزراو ترو سەروەرتر بوون، ئەوە دیارە لەو ڕووەوە جیاوازییان لە نێوانیدا هەیە.

ئنجا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە بارەی ماددەو کەرەسەیەك کە فریشتەکانی لیٚ دروستکراون، دەفەرموێ: {«خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ»} حديث صحيح.[2]

واتە: فریشتـەکان لە نوور دروست کراون. کەواتە: با بزانین کە مـەلائیکەتەکان ڕووحی ڕووت نین، بەڵکو مـەخلووقی ماددیین، بەڵام لە ڕوونـاکیی دروسـتکراون، وە فریشـتەکان خوای پەروەردگار، کاروباری بوونەوەری پیٚ سپاردوونو لە چەند شوێنێکدا خوای کاربەجیٚ

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٠٧٩) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٥٢٣٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٩٩٦)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١٥٥) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا.

سوێند بە فریشتەكان دەخوات، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ فَٱلْمُقَسِّمَٰتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ ﴾الذاريات، يان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا ﴿١﴾ ﴾الصافات، هەموو زانایان دەڵێن: مەبەست پێی كۆمەڵێك لە فریشتەكانە. كەواتە: ئەوان كاروباری بوونەوەر بەڕێوەدەبەن، بەشێوەیەك كە خوا بۆ خۆی دەزانێ، ئەوەندە دەزانین كە جبریل گەیاندنی پەیامی خوای پێ سپێردراوەو، ئیسرافیل فووكردن بە كەڕەنای پێ سپێردراوەو، زیندوو كردنەوەی مردوان فریشتەی مەرگ (مَلَكُ المَوت) گیان كێشانی پێ سپێردراوە، وە میكائیل دابەش كردنی بژێوو ڕۆزیی بەدەستە، ئنجا هەندێكیان كردەوەكانی ئینسان دەپارێزن‌و چاودێرو شاهێدن بەسەر ئینسانەوە، بەشێكیان هاوكاریی ئیمانداران دەكەن‌و لە دژی كافران جەنگ دەكەن.

ئەو كتێبانەش كە خوا بۆ پێغەمبەرانی ناردوون، تەنیا ناوی ئەم پێنجەیان لە قورئاندا هاتوە: ( صوحوف ، زەبوور، تەورات ، ئینجیل ، قورئان ) ئەوانی دیكەش ناویان نەهاتوە، ئەگەرنا هەموو پێغەمبەرێك خاوەنی پەیام‌و بەرنامەیەكی خوایی بووە.

شایانی باسە ئێمە بەرگی چوارەمی كتێبی {ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی}مان تەرخان كردوە بۆ باسی ئیمان بە: فریشتەكانی خوا، كتێبەكانی خوا، پێغەمبەرانی خوا (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، بەلاَم توێژینەوەی خەست‌و خۆڵ‌و فراوانتر لەبارەی ئەو سێ پایە گەورەو گرینگەی ئیمانەوە، لە كتێبی (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا هاتوە كە بەرگی (٣) تەرخان كراوە بۆ باسی ئیمان بە فریشتەكانی خواو كتێبەكانی خوا، وە بەرگی (٤)یش تەرخان كراوە بۆ باسی ئیمان بە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، بە گشتیی‌و پێغەمبەری كۆتایی (النَبِـي الخاتم) بەتایبەت.

بۆیە ئێمەش لێرە بەخێرایی بەسەریاندا تێپەڕ بووین‌و، خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكانم حەواڵەی ئەو دوو كتێبە دەكەم.

# حەوت تایبەتمەندیی

# عەقیدەی

# ئەهلی

# سوننەت و جەماعەت



ئەمجارە نووسەر دێتە سەر باسی خستنە ڕووی کۆمەڵێك لە تایبەتمەندییە فیکریی‌و عەقیدەییەکانی زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان، کە بە(ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت) ناسراون، منیش لە بەرگی شەشەمی: {ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی}دا ناوونیشانی: {پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست} (أتباع المَنهَج الصّحيح)م بۆ هەڵبژاردوون.

شایانی باسیشە کە نووسەر لەم بڕگەی کتێبەکەیدا حەوت (٧) لەو تایبەتمەندییانە (خَصائِص) دەخاتە ڕوو و، خاڵەکانی: (٥٤ – ٦١) واتە: هەشت (٨) خاڵی بۆ داناون، دیارە هەتا کۆتایی کتێبەکەشی، نووسەر لەسەر خستنەڕووی ئەو تایبەتمەندییانە بەردەوام دەبێ، بەڵام لەژێر سەرەباسی جیاجیادا، کە لەداهاتوودا باسیان دەکەین.

شایانی باسیشە ئێمە بەرگی (٦)ی {ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی}مان تەرخان کردوە بۆ تیشك خستنە سەر تایبەتمەندییەکانی: پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست (أهل السنّة والجماعة). هەروەها لە بەرگی (٦)ی (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)شدا لەژێر ناوونیشانی: (القيَم والتصوّرات والموازين)دا لەو بارەوە قسەمان کردوە.

نووسەر لەم خاڵەدا باسی ئەوە دەکات ،کێ پێی دەگوترێ مسوڵمان‌و بڕوادار؟ دەڵێ:

> ٥٤) ( وَنُسَمِّي أَهْلَ قِبْلَتِنَا مُسْلِمِينَ مُؤْمِنِينَ، مَا دَامُوا بِمَا جَاءَ بِهِ النَبِـي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مُعْتَرِفِينَ، وَلَهُ بِكُلِّ مَا قَـالَ وَأَخْـبَرَ مُـصَـدِّقِـيـنَ ):

واتە: ئەهلی قیبلەی خۆمان {ئەوانەی کە ڕوو دەکەنە قیبلەی ئێمە کە کەعبەی ڕێزدارو مزگەوتی حەرام (المسجد الحرام)ە} ناو دەبەین بە مسوڵمانان‌و بڕواداران، (مَا دَامُوا بِمَا جَاءَ بِهِ النَبِي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مُعْتَرِفِينَ)، بە مەرجێك ئەوەی کەپێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هێناویەتی، دانی پێدا بێنن کە ڕاستە، (وَلَـهُ بِكُـلِّ مَـا قَـالَ وَأَخْـبَـرَ

مُصَدِّقِينَ) وه هەرچی كه فەرموویەتیو هەواڵی پێداوه، بەڕاستی بزانن.. واته: بڕوادارو مسوڵمان بەپێی ڕای نووسەر، به دوو مەرجان به بڕوادارو مسوڵمان له قەڵەم دەدرێن كه من تێبینیم لەسەری هەیه دوایی باسی دەكەم:

یەكەم: دان پێداهێنان به هەرچی، كه پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەلایەن خواوه هێناویەتی، دانی پێدابێنی كه هەرچی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) له خواوه هێناویەتی، ڕاستو دروستو تەواوه.

دووەم: به ڕاست دانان (تَصديق)ی هەرچی، كه خوا بۆ پێغەمبەری (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ناردووەو لەلایەن خواوه هەواڵی پێداوەو فەرموویەتی. كەواته: دان پێداهێنان (إعتراف) هەیەو، بەڕاست زانین (تَصديق) هەیه، دان پێداهێنان بریتییه له دەربڕینو ئاشكرا كردنو، بەڕاست دانان (تَصديق)یش بریتییه له قەناعەت هێنانو به ڕاست زانین بەدڵ، دەبێ هەردووكیان بن، ئەوجار ئیمان پێكدێو مسوڵمانەتیی دێتەدی، (بەڕای نووسەر).

كەواته: ئەوانەی كه دەڵێن: دەزانین ئیسلامو قورئان ڕاستنو، دەزانین خواو پێغەمبەر هەقن،وه هەرچی ئیسلام دەیڵێ هەقەو ڕاستە، بەڵام هیچ كردەوەو ڕەفتارو پەرێزێكیان نیه، ئایا ئەوانه تەنیا بەو بەڕاست زانینه دڵییەو، بەو دان پێداهێنانه زمانییه كه له دڵیاندایه، بەبڕوادار دادەنرێن؟ یاخود به مسوڵمان دەژمێردرێن؟ به ڕای نووسەر: بەڵێ، بەڵام بەڕای بەنده: نەخێر، چونكه دەبێ وێڕای ئەو بەڕاست زانینو قبووڵكردنه دەروونییەو دان پێداهێنانەی زمان، كردەوەی ئەندامەكانیش هەبێ، چونكه ئیمان ئاوا پێناسەكراوەو له داهاتووش باشتر ڕوونی دەكەینەوه: (الإِيـمَانُ: هُوَ التَّصْدِيقُ بِالقَلْبِ، وَالإِقْرَارُ بِاللِّسَانِ، وَعَمَلٌ بالجَوَارِحِ وَالأَرْكَان) ئیمان لەو سێ پایه سەرەكییه پێكدێ:

١- به ڕاست زانین (التَّصْدِيقُ)و قەناعەت هێنان بەدڵ.

٢- دان پێداهێنان به زمان (الإِقْرَارُ بِاللِّسَانِ).

٣- كردەوه ئەنجامدان بەئەندامەكان (وَعَمَلٌ بالجَوَارِحِ وَالأَرْكَان).

دەبێ هەرسێکیان بن، ئنجا ئیمان پەیدادەبێ، بەڵام لەوەدا کە ئایا کردەوە، کە بەشێکە لە ئیمان، بەشێکی پێکهێنەرە، یان بەشێکی تەواوکەرە؟، لەوەدا جیاوازیی هەیە لە نێوان زانایاندا، بەڵام زۆربەی زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەن کە کردەوەو ڕەفتارکردن بەشێکی پێکهێنەر (مُكَوِّن)ی ئیمانە، نەك تەنیا بەشێکی تەواوکەر (مُكَمِّل).

کەواتە: بەپێی ئەو ڕایەی کە کردەوە بە بەشێکی تەواوکەری ئیمان دەزانێ، ئینسان ئەگەر کردەوەشی نەبێ، مادام قەناعەتی نێو دڵو دان پێدانانی زمانی ببێ، بە بڕوادار لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام کەکردەوەی نەبوو، پێی دەگوترێ: بڕوادارێکی ناتەواوو خاوەن ئیمانێکی نەکاملو ناتەواو.

بەڵام بەپێی ڕایەکەی دیکە: دەبێ بەڕاست دانانو قبوولکردنی دڵو دانپێداهێنانی زمان، حەتمەن کردەوەشیان لەگەڵ دابێ، ئەوجار مرۆڤ بەبڕوادار لە قەڵەم دەدرێ.

موعتەزیلەو خەواریج ڕایان وابووەو، زۆرێك لە ئەهلی سوننەتو جەماعەتیش ڕایان وابووە، بۆ وێنە: پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پێی وایە، کەهەر کەسێك نوێژ نەکات کافرە، دەڵێ: نوێژ گەورەترین کردەوەیە لە ئیسلامداو، هەر کەسێك نوێژی نەبێ، بە کافری لە قەڵەم دەدا، بەڵام وەك گوتم: بەشێك لە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوەن، کە نەخێر کردەوە بەشێکی تەواوکەری ئیمانە، نەك بەشێکی پێکهێنەری، پێکهێنەرو تەواوکەریش فەرقیان ئەوەیە، کە ئەگەر ئەو شتە بەشێکی پێکهێنەر بێ، بەبێ وی دروست نابێ، بەڵام ئەگەر بەشێکی تەواوکەربێ، بەبێ ویش دروست دەبێ، بەڵام ناتەواوە.

ئنجا نووسەر لێرەدا دەڵێ: ئێمە ئەهلی قیبلەی خۆمان ناو دەبەین بەمسوڵمانیشو بەبڕواداریش، مادام ئەوەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە خواوە هێناویەتی، دانی پێدا دێنن کە ڕاستو دروستەو تەواوە، وە هەموو ئەوەی کەپێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتیو هەواڵی پێداوە لە خواوە، بەڕاستی دەزانن‌و قەناعەتیان پێی هەیە، ئەگەر وابن، هەم بە بڕواداریش لە قەڵەم دەدرێن‌و هەم بە مسوڵمان، بەڵام ئایا وشەی مسوڵمان و بڕوادار جیاوازییان چیە؟

ئیمان زیاتر پەیوەندیی بە دڵو دەروونەوە هەیە، بە دیوی پەنهانی ئینسانەوە هەیە، بەڵام ئیسلام پەیوەندیی بە ڕواڵەتو دیوی ئاشکرای ئینسانەوە هەیە، بۆیە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەو فەرموودەیەدا کە (مسلم) ڕیوایەتی دەکاو پێشەوا عومەر دەیگێڕێتەوە کە پرسیاری لێکراوە دەربارەی ئیسلام، فەرموویەتی: {«الإِسْلاَمُ: أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ وَتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِيَ الزَّكَاةَ، وَتَصُومَ رَمَضَانَ، وَتَحُجَّ الْبَيْتَ إِنِ اسْتَطَعْتَ إِلَيْهِ سَبِيلاً»} حديث صحيح.[(١)]

واتە: ئیسلام شایەتمان هێنانە بەتەنیا پەرستراوێتیی خواو، پێغەمبەرێتی (محمد) (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ئنجا نوێژ بەرپا کردنو زەکات دانو ڕۆژوو گرتنو حەج کردن لە ڕێی خوادا، ئەگەر توانات هەبێ، فەرموویەتی ئیسلام ئەوەیە، بەڵام کەدەربارەی ئیمان پرسیاری لێکراوە، فەرموویەتی:{«الإِيمَان: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ»} حديث صحيح.[(٢)]

واتە: ئیمان ئەوەیە بڕوا بێنی بە خواو بە فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرانیو ڕۆژی دواییو قەزاو قەدەر، سەیر دەکەین شەش پایەکانی ئیمان شتێکن، پەیوەندییان بەدڵو عەقڵی ئینسانەوە هەیە، کە نایان بینیێ، بڕواهێنان بەخوا، یان بەوانی دیکە، کەس نایبینێ، بەڵام ئیسلام ئاشکرایە: شایەتیی دان خەڵك دەیبیستێ، نوێژ خەڵك دەیبینێ، ڕۆژوو و حەجو زەکاتیش بە هەمان شێوە. کەواتە: ئیسلام ڕواڵەتییو بەرچاوەو، ئیمان پەنهانو شێردراوەیە، ئنجا ئیمان ئەسڵو بناغەیەو ، ئیسلام واقیعێکی کردەوەییە لەسەر ئیمان دادەمەزرێ، نوێژو ڕۆژوو زەکاتو حەج لە کەسێك چاوەڕێ دەکرێ، کە ئیمانی هەبێ، کەسێ ئیمانی نەبێ ،نوێژو ڕۆژوو حەجو زەکاتو کردەوەکانی دیکەی ئیسلامی لێ چاوەڕوان ناکرێ. کەواتە: هەموو کاتێك وشەی ئیمان (مەدح)ە، بەڵام مەرج نیە ئیسلام هەمیشە (مەدح) بێ، بۆ وێنە: دەبینین مرۆڤ پابەندیی ڕواڵەتیی هەیەو، نوێژیش دەکات، بەڵام مەرج نیە ئیمانی هەبێ، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قَالَتِ

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٩٥).

٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٩٥).

ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا ... ﴿١٤﴾ ﴾الحجرات، واتە: عەرەبە دەشتەكییەكان گوتیان: ئیمانمان هێناوە، پێیان بڵێ: ئیمانتان نەهێناوە، بەڵكو بڵێن: ئیسلام بووین، ﴿ ...وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْۖ ... ﴿١٤﴾ ﴾الحجرات، جارێ ئیمانتان نەچۆتە نێودڵ، وەك دەبینین خوا نكوولیی هەبوونی ئیمانیان لێدەكات، بەڵام دەفەرموێ: بڵێن ئیسلام بووین، واتە: بە ڕواڵەتیی تەسلیم بووین، ڕواڵەتێكمان پێوە دەبینرێ، وەك مسوڵمانەتیی، بەڵام ئیددیعای ئەوە نەكەن كە ئەو ڕواڵەتە ئەسڵ و بنچینەیەكی هەیە، بەڵام جاری واش هەیە ئیمان و ئیسلام لە جێی یەكدیش بەكاردێن، لە كاتێكدا كە جیا جیا بێن، بەڵام هەركاتێ پێكەوە بەكارهاتن، ئیمان یانی: بەڕاست دانانی ئەو حەقیقەتانەی كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە خوای بەرزەوە هەواڵی پێداون، ئیسلامیش یانی: ئیش پێكردنی ئەو حەقیقەتانەو لە خۆدا دەرەوشانەوەو ئاشكرا كردنیان، بەڵام بێگومان ئەوەی كەدەكرێتە پێوەرو تەرازوو بۆ هەڵسەنگاندنی خەڵك، كردەوە دیارەكانی ئیسلامن، وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: {«مَنْ صَلَّى صَلاتَنَا وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا فَذَلِكَ الْمُسْلِمُ الَّذِي لَهُ ذِمَّةُ اللهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ فَلا تُخْفِرُوا اللهَ فِي ذِمَّتِهِ»}حديث صحيح.[(١)]

واتە: هەر كەسێك نوێژی ئێمە بكات، وە ڕوو لە قیبلەی ئێمە بكات، وە سەربڕاوی ئێمە بخوات، ئەوە ئەو مسوڵمانەیە كە پەیمانی خواو پەیمانی پێغەمبەرەكەی هەیە. (یانی خواو پێغەمبەر بوونە كەفیل و زامنی ئەو ئینسانە كە دەبێ نەفس و ماڵ و ئابڕووی و هەموو شتێكی پارێزراو بێ لەلایەن مسوڵمانانەوە)، دەجا پەیمانی خوا مەشكێنن.

دیارە سەبارەت بە مەسەلەی ئیمان و ئیسلام، زانایانی ئیسلام كاتی خۆی مشت و مڕی زۆریان لەبارەیانەوە لەگەڵ تاقمە لادەرو داهێنەرەكاندا بووەو، ئەوەی كەباسمان كرد ڕای ئەهلی سوننەت و جەماعەت و جەماوەری مسوڵمانانی لەسەر كۆبوونەتەوەو، ئەو بۆچوونەیە كە بەڵگەكانی قورئان و سوننەت پشتگیریی لێدەكەن، دیارە لە بەرانبەر ئەهلی

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي برقم: (٣٨٤).

سوننەتو جەماعەتدا، موعتەزیلەو مورجیئەو خەواریج هەبوون، خەواریج گوتوویانە: هەر کەسێك گوناهێك بکات، ئەگەر هەزار جار پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و ئەوەی ئـەو گوتوویەتی، بەدڵ بەڕاست بزانێو دانی پێدابێنێ بە زمانو کردەوەکانی دیکەش ئەنجامی بدات، ئەگەر یەك گوناهی گەورە بکات، یەك نوێژ بچوێنێ، قەتلێك، یان زینایەك بکات، یان شەڕاب بخواتەوە، یەکێك لەوانە بکات، تازە کافرە!.

بەڵام موعتەزیلە تۆزێك لەوان سووکتر قەزیەکەیان گرتـوەو گوتوویانـە: هەرکەسـێك گوناهی گەورە بکات، لە ئیمان دەچێتە دەر، بەڵام کافر نابێو دەچێتە پلەیەك لە نێوانی ئیمان و کوفردا، پێی دەگوترێ: (الْمَنْزِلَةَ بَيْنَ الْمَنْزِلَتَيْن) پلەیەك لە نێوانی هەردووك پلەکەدا.

مورجیئەش بە پێچەوانەی خەواریجو موعتەزیلەوە گوتوویانـە: (لا يَضرُّ مَـعَ الإِيْمَـان ذَنْبٌ)، لەگەڵ ئیماندا هیچ گوناهێك زەرەری نیە، خەواریج زۆر بەدبین بوونو، مورجیئەش زۆر خۆش بین بوون، خەواریج زیاتر سەیری ئەو ئایەتو فەرموودانەیان کردوە کە هەڕەشە دەکەنو، مورجیئەش زیاتر سەیری ئەو ئایەتو فەرموودانەیان کردوە کە هیواو ئومێـدو دڵخۆشـییان تێدایـە، بـەڵام ئـەهلی سـوننەتو جەماعـەت، تەماشـای هـەردوو جـۆرە دەقەکانیان کردوەو، ڕایەکی نێوەڕاست (وَسَط)و میانەیان گرتوە.

ئنجا نووسەر یەکی دیکە - کە پێی وایە بەشێکی عەقیدەی ئیسلامییەو یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی پەیڕەوانی ڕێبـازی ڕاست- (أهـــل السنّة والجماعـة) دەخـــاتەڕوو و، دەڵـێ:

**٥٥) ( وَلا نَـــخُــوضُ فِي اللهِ، وَلا نُمَـــارِي فِي دِينِ اللهِ ):**

واتە: ئێمە دەربارەی خوای موتەعال زۆر پێوە ناچین، یانی: زۆر تێـی نـاڕژێینو پێـوە ناچینو تێیدا قووڵ نابینەوە. (وَلا نُمَارِي فِي دِينِ اللهِ)، لە ئایین و بەرنامەی خوادا مشتو مڕو دمەدمە ناکەین، کە زانیمان ئەو شتە خوا فەرموویەتی، یان پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی دەڵێین: بیستمانو فەرمانبەرییمان کرد (سَـمِعْنَا وَأَطَعْنـا)، بۆچـی؟ چونکە خوای پەروەردگار دەربارەی پێغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّم)و ئومەتەکـەی لـە

کۆتایی سوورەتی (البقرة)دا ئـــاوا دەفەرموێ: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ ... ﴿٢٨٥﴾ ﴾، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئیمانی هێنا بەوەی کە لە پەروەردگاریەوە بۆی هاتوەو، هەروەها ئیماندارانیش (لە ئوممەتی) بڕوایان هێنا، هەموویان بڕوایـان هێنـا بـە خواو فریشتەکانیو کتێبەکانیو پێغەمبەرانی، دەڵێن: جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرانی خواوە (لـەوەدا کـە هـەموویان پێغەمبـەرو خـاوەنی بەرنامـەی خـوایین، جیاوازییان ناکەینو ڕێزی هەموویان دەگرین، بەڵام لـەوەدا هەنـدێکیان لـە هەنـدێکیان گەورەتر بوون، ئەوە حیسـابێکی دیکەیـە) ﴿ ... وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ ﴾ ئەوەیە هەڵوێستی مسوڵمان سەبارەت بە دینی خوای بێ هاوتا: گوتیان: بیستمانو فەرمانبەرین ﴿ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا ﴾، داوای لێبوردنیشـمان هەیـە (لـە کـەمو کوڕیـەکانمان) ئـەی پـەروەردگارمان! ﴿ وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾هـەر بـۆ لای تـۆش دەگەڕێینەوە.

کەواتە: سەبارەت بە خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ)، ئینسانی مسوڵمان ئەدەبی وایە کەزۆر ورد نابێتەوە لە زاتی خواو لە سیفەتەکانی، بەجۆرێك کە بیەوێ چۆنییەتیو حەقیقەتەکـەیان بزانێ، چونکە عەقڵی ئینسان بۆ ئەوە دروست نەکراوە کە حەقیقەتوچۆنییەتی خوا بزانێ، عـەقڵی ئینسان - لەو بوارەدا- ئەرکی ئەوەیە کەبەڵگە بدۆزێتەوە لەسەر ئەوەی کەخاوەنو بەدیهێنەرێکی هەیە، ئەو خاوەنو بەدیهێنەرە پێغەمبەرانو پەیامو بەرنامەی بۆ ناردوون، بەڵێ، عەقڵ ئەرکەکەی ئەوەیە کە لەڕێگای نیشانەو بەڵگەکانـەوە، خـواو پـەروەردگارو خاوەنی خۆی بناسێ، هەڵوێستێکی شایستەو مەنتیقییانەی لە بەرانبەردا دەربـبڕێ، کـە هەڵوێستی بەندایەتییە، ئنجا لە شوێنەوار (أثر)دا هاتوە کە گوتراوە: (تَفَكَّروا فِي الخَلق، ولا تَفكَّروا في الخَالِق، فَإِنَّكُم لا تَقدرون قدره)، واتـە: بـیر لـە دروسـتکراوەکان (ی خـوا)

بكەنەوە، بەڵام بیر لە دروستكەر(خوا) مەكەنەوە، چونكە (هەر چۆنێكی بێ)، ناتوانن وەك پێویست ڕێزی بگرنو، ناتوانن چۆنییەتی خوا لە مێشكی خۆتاندا بجەجـمێنن.

ئنجا لە خاڵی پەنجاو شەش (٥٦)دا دێتە سەر باسی چۆنییەتی ئیمان هێنان بە قورئان بەو شێوەیەی كە پێشینی چاكمان لە هاوەڵانو شـوێنكەوتوانیان لەسـەری بوونو، دەڵـێ:

> ٥٦) ( وَلا نُجَادِلُ فِي الْقُرْآنِ، وَنَشْهَدُ أَنَّهُ كَلامُ رَبِّ الْعَـالَمِينَ، نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الأَمِينُ، فَعَلَّمَهُ سَيِّدَ الْمُرْسَلِينَ مُحَمَّدَاً، وَهُـوَ كَلامُ اللهِ تَعَالَى لا يُسَاوِيهِ شَيْءٌ مِنْ كَلامِ الْمَخْلُـوقِينَ، وَلا نَقُولُ بِخَلْقِهِ، وَلا نُخَالِفُ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ ):

واتە: دەربارەی قورئان مشتو مڕو دم بەدمە ناكەینو شایەدیی دەدەین، كە قورئـان فەرموودەی پەروەردگاری جیهانەكانە، ڕووحـی ئـەمین (كـە جیبریلـە) (علیـه السـلام) هێناویەتە خوارو فێری گەورەی پێغەمبەرانی كردوە، كە موحەممەدە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، وە قورئان قسەی خوای بەرزە، هیچ شتێك وەك وی نیە لە قسەی دروسـتكراوەكان، (وَلا نَقُولُ بِخَلْقِهِ)، ناشڵێین: قورئان دروستكراوە، پێچەوانەی كۆمـەڵی مسوڵمانان نابین.

موعتەزیلەكان هەراو ئاشووبێكی گەورەیان هەڵگیرساند، بۆ ئیسپاتی ئەوە كە قورئان دروستكراوی خوایەو خوا قورئانی دروستكردوە، بەڵام ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەڵێن: نەخێر قورئان سیفەتی خوایەو مەخلووقی خوا نیە، خوا قسەی هەیە، وەك چـۆن بـەزەیی هەیە، زانیاری هەیـە، دەسـتەڵات و ویسـتو ڕازی بـوونو تووڕەبـوونی هەیـە، ئەوانـە هەموویان سیفەتی خوان، ئنجا خوا فەرموودەشی هەیە، بەڵام فەرمایشتێك كە لە زاتـی خۆی دەوەشێتەوە، نەك وەك قسەی ئێمە.

ئنجا وەك چۆن سیفەتەكانی دیكە، خـوا (جل جلالـه) دروسـتی نـەكردوون، بـەڵكو سیفەتنیو لەگەڵ زاتەكەیدا هەر بوون كەلامی خواش لەگەڵ زاتەكەیدا هەر بـووە، بـەڵام لەو كاتەدا خوا كەلامەكەی دەفەرموێو فەرموویەتی، كە بە پێویستی زانیوە، بۆ وێنە: بۆ

بەنی ئیسرائیل تەوراتی لە ڕۆژگاری مووساداو، زەبووری لەسەردەمی داوود داو ئینجیلی لە سەردەمی عیسادا فەرمووە، وە قورئانی لە سەردەمی موحەممەددا (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّم) فەرمووە، بۆ ئێستاو بـۆ دوای ئێسـتاش. کەواتـە: بـەڵێ، خـوا لـە هـەربووەوە، فەرمایشتی بووەو خوا سیفەتی قسـەکردنی هـەبووە، بـەڵام لـەو کاتـەداو بـەو شـێوەو چۆنییەتییەی کە خۆی ویستی لەسەر بووە، قسەکەی فەرمووە.

ئنجا کە دەڵێ: (وَلا نُخَـالِفُ جَمَاعَـةَ الْمُسْلِمِينَ)، واتـە: ئێمـە پێچـەوانەی کۆمـەڵی مسوڵمانان ناجوڵێینەوە، کـە بڵـێین: قورئـان دروسـتکراو (مخلوق)ە، چـونکە هـاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کە لە هەموو کەس زیاتر لە ئایینی خوا حاڵی بوون، ئنجا شوێنکەوتوانو شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوانو پێشەوایانی ئێمە، هەموو ڕایان وابووە کە قورئان کەلامی خوایەو سیفەتی خوایەو خوا دروستی نەکردوە.

## مەسـەلەی بەکـافـردانـان :

ئەمجارە نووسەر لەم خاڵی پەنجاو حەوتـەم (٥٧)دا، باسـی مەسـەلەیەکی زۆر گـرنگ دەکات کە لەم ڕۆژگارەشـدا مسـوڵمانان زۆریـان پێویسـتە بـاش تێیـدا قـووڵ ببنـەوەو دووربـینیو وریـایی (إحتیـاط وحَـذَر)ی زۆری تێـدا بکـەن ، چـونکە دەرەنجـامی زۆر مەترسییداری لێدەکەونەوە لـەدنیاو دوارۆژدا، ئـەویش مەسـەلەی بەکافردانـەنان (عَـدَم تَكْفِير)ی مسوڵمانانو ئەهلی قیبلەیە، بەبێ بەڵگەیەکی ڕوونو بێ چەندو چوونو مشتو مڕ هەڵنەگرو دەڵـێ:

**٥٧) ( وَلا نُكَفِّرُ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ بِذَنْبٍ، مَا لَمْ يَسْتَحِلَّهُ ):**

واتە: هیچ کام لە ئەهلی قیبلە (لەوانەی ڕوو لە قیبلە دەکەن) کافریان ناکەین بە هیچ گوناهێك، کەسێك هەرچەندە گوناهی هەبن، بە هۆی گوناهەکانییەوە، بەکافری دانـانێین (مَا لَمْ يَسْتَحِلَّهُ) بە مەرجێك ئەو گوناهەی بە حەڵاڵ نەزانیبێ.

هەڵبەتە ئەگەر لێرەدا گوتبای: (وَلا نُكَفِّرُ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ بِكُلِّ ذَنْبٍ) زۆر چاكتر بوو، وەك (إبن أبي العِزّ الحَنَفي) گوتوویەتی، واتە: ئێمە هیچ كام لە ئەهلی قیبلە بە هەموو گوناهێك كافر ناكەین، (بە هەموو گوناهێك) نەك (بە هیچ گوناهێك) ، چونكە گوناح هەیە ئینسانی پێ كافر دەبێ، ئەگەر بەحەڵاڵیشی نەزانێ، بۆ وێنە: كەسێك قورئان فڕێ بداتە نێو پیسایی، یان كەسێك شەریك بۆ خوا بڕیار بدات، یان كەسێك سووكایەتیی بە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بكات، با بە حەڵاڵیشی نەزانێ پێی كافر دەبێ. كەواتە: ئەگەر گوتبای: (وَلا نُكَفِّرُ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ بِكُلِّ ذَنْبٍ) بە هەموو گوناهێك ئەهلی ڕووگە بە كافر دانانێین، ڕاستتر بوو، ئەگەرنا بە هەندێ گوناهان كافر دەبن.

ئنجا گوتوویەتی: (مَا لَمْ يَسْتَحِلَّهُ)، مادام ئەو گوناهە بە حەڵاڵ نەزانێ، ئەگەر گوناهێكی كردو بە حەڵاڵی زانی، با گوناهەكە لە خودی خۆیدا كوفریش نەبێ، پێی كافر دەبێ، بۆ وێنە: زینا بكات، غەیبەت بكات، درۆ بكات، پارووی حەرام بخوات، بڵێ: ئەو شتە بەحەرام نازانم، ئەوە كوفرە،چونكە: كە گوتی بە حەرامی نازانم، یانی: خوا نەیزانیوە!! ئاخر ئیمان، یانی: بەڕاست دانان (تَصْديق) بە دڵ و بەزمان، ئنجا كە گوتی: فلان شتە بەحەرام نازانم، مانای وایە بەدرۆ دانان (تَكْذيب)ی خوا دەكات، ئەوەش پێچەوانەی (تَصْديق)ە. كەواتە: ئیمانەكەی هەڵدەوەشێتەوە، ئەو حەقیقەتە، هەموو ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەسەری ڕێككەوتوون.

## بەرپەرچدانەوەی مورجیئە:

ئنجا لە خاڵی پەنجاو هەشت (٥٨)دا، لە میانەی خستنە ڕووی یەكی دیكە لە تایبەتمەندییە عەقیدەییو فیكرییەكانی ئەهلی سوننەتو جەماعەتدا، بەرپەرچی (مورجینە) دەداتەوەو، دەڵێ:

## ٥٨) ( وَلا نَــقُولُ: لا يَضُــرُّ مَعَ الإِيــمَانِ ذَنْبٌ لِمَنْ عَمِلَهُ ):

واتە: (هەرچەندە نالێین: خەڵك بە گوناهان کافر دەبێ)، بەڵام ناشڵێین: لەگەڵ ئیمانــدا گوناح زەرەری نیە بۆ کەسێك کە ئــەنجامی دەدات . واتــە: وەك خــەواریجو موعتەزیلــە نالێین: هەرچی گوناهی کرد، کافر دەبێ، بەڵام وەك مورجیئەش نالێین: هەرچی کە ئیمانی هەبوو، با هەزار گوناهان بکات، هیچ زەرەر ناهێنێ، بەڵکو دەڵێین: گوناح زەرەری هەیەو بەردەوامیی لەسەر گوناهی گەورە، سەر دەکێشێ بۆ کوفر، وەك چۆن بەردەوام بوون لەسەر گوناهی گچکە، سەردەکێشێ بۆ گوناهی گەورە. کەواتە: نالێین گوناهو تاوان کردن زیانی نیە لەگەڵ ئیماندا، بەڵکو مرۆڤــ ،با ئیمانیشی هەبێ کە گوناهو تاوانی کرد، زیانی زۆر چاکی پێدەگات، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەو گوناهە، مەگەر گوناهێکی وەك شیرك، یان کوفر بێ، یان گوناهەکە بە حەڵاڵ بزانێ، ئەگــەرنا ئیمانەکــەی هەڵناوەشــێتەوە، دەتــوانین بــۆ ڕوونکردنەوە بڵێین : بۆ وێنە: ئێمە لەم خانووە داین، ئەگەر فرۆکەیەك قەسفی ئێرە بکات، یان دوو سێ ئار پیجی لێبدەن، دیارە کەلێنی تێدەبێو هەندێ شوێنی زەرەری پێدەگات، بەڵام ئەسڵو بناغەی خانووەکە هەر دەمێنێ، ئنجا گوناح وەك ئەو قومبەلە، یان وەك ئەو ئارپیجیە وایە، کە بەهۆیەوە کەلێنێك لە ئیمان دەبێ، بــەڵام ئیمانەکــە لەگــەڵ هــەموو کەلێناندا هەر دەمێنێ، هەر گوناهێك کە دەیکەی کەلێن لە ئیمان پەیــدا دەبــێ، بــەڵام گوناهێك کە ئینسانی پێ کافر دەبێ، وەك شیرك، یان نیفاق، یان کوفری گەورە، ئەوانــە ئەسڵی ئیمانی لێ هەڵدەوەشێننەوە، وەك ئەوەی کەلە خانووەکەدا دینامیتێك بتــەقێنی، خانووەکە هەمووی لێك هەڵدەوەشێنێ، جا ئەهلی سوننەتو جەماعــەت وەك پێشــتریش باسمان کرد، لێرەشدا خەتی نێوەڕاستیان گرتوە، نالێن: بە هەموو گوناهێك خــەڵك کــافر دەبێ، ناشڵێن گوناه زیانی نیە.

لە خاڵی پەنجاو نۆیەمین (٥٩)دا، یەکی دیکــە لــە بنچــینە فیکریــیو ئاکارییــەکان (الأُصُول الفِكريّة والسلوكيّة)ی پێشینی چاك دەخاتە ڕوو و، دەڵێ:

٥٩) ( وَنَرْجُو لِلْمُحْسِنِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْ يَعْفُوَ عَنْهُمْ، وَيُدْخِلَهُمُ الْجَنَّةَ بِرَحْمَتِهِ، وَلا نَأْمَنُ عَلَيْهِمْ، وَلا نَشْهَدُ لَهُـمْ بِالْجَنَّـةِ، وَنَسْتَغْفِرُ لِمُسِيئِهِمْ، وَنَخَافُ عَلَيْهِمْ، وَلا نُـقَـنِّـطُهُمْ ):

واتە: ئومێدەوارین بە بەزەیی خوا بۆ چاكەكاران لە ئیمانداران، ئومێدو هیوای ئەوەیان بۆ دەخوازین، بە ڕەحمەتی خۆی بیانخاتە بەهەشتێوە (نەك بە كردەوەی خۆیان)، وە لێیـان دڵنیانین (كە ئەهلی بەهەشتن)، شایەدیی بەهەشتیی بوونیان بۆ نادەین، وە داوای لێبوردن بۆ خراپەكارانیان ( لە خوا) دەكەین‌و مەترسییمان لێیان هەیە (دۆزەخیی بن)، بەڵام (لە بەزەیی خوا) نائومێدیان ناكەین.

## هیچ كەس بە كردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشـت

كردەوەی هیچ ئینسانێك بایی ئەوە نیە پێی بچێتە بەهەشتیٚ، وەك پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەو بارەوە دەفەرمویٚ: {لَنْ يَدْخُلَ الْجَنَّةَ أَحَدٌ إِلاَّ بِرَحْمَةِ اللهِ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ وَلاَ أَنْتَ؟! قَالَ: وَلاَ أَنَا إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللهُ بِرَحْمَتِهِ} حديث صحيح[1].

واتە: هیچ كەسێك بە كردەوەی خۆی ناچێتە بەهەشت، مەگەر بە ڕەحمـەت‌و بـەزەیی خوا، گوتمان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)؟ فەرمووی: بەڵیٚ، منیش، مەگەر خوا بە ڕەحمەتی خۆی دامپۆشیٚ.

بەڵام بێگومان كردەوەی چاك، هۆیە بۆ ئەوەی ئینسان پێی بچـێتە بەهەشـتیٚ، وەك چـۆن گوناهو تاوان كردن، هۆیە بۆ چوونە دۆزەخ، بەڵام كردەوەی باش،هۆیەكی تـەواوو كافی نیە بۆ چوونە بەهەشت. واتە: كردەوە باشەكانی ئیمانداران، بەرانبـەرو بارتەقـای چوونـە بەهەشـتیان نین‌و، كردەوەكانیان هەرچـەندە زۆرو باش بن، شایستەیی ئەوەیان نیە ببنە نرخ‌و بەهای بەهەشتی پان‌و بەرین‌و ڕازاوەو نەبڕاوەی خوای میهرەبان‌و بەخشندە.

١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١١٥٠٤)، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

ئنجا کە دەڵێ: {هەرچەندە ئومێدەوارین خوا لە چاکەکاران خۆش بێ، بەڵام لێشیان ئەمین نین، شایەدییشیان بۆ نادەین بە بەهەشت}، دەڵێم: ئەو هاوەڵانە نەبێ، کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شایەدیی بەهەشتیی بوونی بۆ داون، جگە لەوان، شایەدیی بۆ هیچ کەس نادەین کە بەهەشتییە بەحەتمیی،دەڵێین: إن شاءالله لە بەهەشتییە، بەڵام بە دڵنیایی وا ناڵێین، چونکە بەس خوا بە قەتعیی ئەوە دەزانێ، هەر کەسێ بە قەتعیی وابڵێ، مانای وایە ئیددیعای زانینی غەیبی کردوە.

دواییش کە دەڵێ: {بۆ خراپەکارانی بڕواداران، داوای لێبووردن لە خوا دەکەین‌و ترسیشمان لێیان هەیە، بەڵام نائومێدیان ناکەین لە بەزەیی خوا}.

ئەمەش دیسان یەکی دیکەیە لە بەڵگەو نیشانەکانی هاوسەنگیی‌و میانڕەوێتیی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست، لە نێوان تێپەڕاندن‌و بەزایەدان (إفراط وتفريط)دا کە هۆکاری بنەڕەتیی لادان‌و خلیسکانی مسوڵمانانە لە ڕاستە شەقامی ئیسلام، چ لەبواری فیکرو عەقیدەو، چ لەبواری کردەوەو ڕەفتاردا.

ئنجا دێتە سەر خاڵی (٦٠) کە ئەویش هەر تەواوکەری مەبەستی خاڵی پێشوویە کە بریتیە لەوەی مرۆڤی مسوڵمان لەنێوان ترس‌و ئومێد (خَوْف وَرَجاء)دا بێ‌و، هەمیشە هەوڵ بدات وەك باڵندەیەك بەدوو باڵی ترس‌و هیوا بەرەو خوا بڕوات، دەڵێ:

٦٠) ( وَالأَمْـنُ وَالإِيَـاسُ يَنْقُلانِ عَـنْ مِلَّـةِ الإِسْلامِ، وَسَبِيلُ الْحَـقِّ بَيْنَهُـمَا لأَهْـلِ الْقِبْـلَةِ ):

واتە: دڵنیابوون و، بێ هیوایی‌و بێ ئومێد بوون (لە ڕەحمەتی خوا)، هەر کام لەو دوو سیفەتانە ( يَنْقُلانِ عَنْ مِلَّةِ الإِسْلامِ ) ئینسان لە ئیسلام دەگوازنەوەو دەیبەنە دەر، دیارە زۆربەی خەڵکیش ئەو مەسەلەیە نازانن‌و لەو ڕاستییە بێ ئاگان کە ئەمین بوون‌و دڵنیابوون لە تۆڵەو سزای خوا، بەو پەڕی دڵنیایی‌و مسۆگەرییەوە بڵێی: خوا فلان کەس سزا نادات، یان بڵێی من سزا نادات، یان بڵێی: من لە هەموو ئاوان پەڕیومەوەتەوە، ئەو جۆرە دڵنیا

بوونە هۆکاری کوفرە، چونکە: مانای وایە تۆ دەڵێی: ئاگام لە بڕیاری خوا هەیە، واتە: ئیددیعای غەیب دەکەی، ئیددیعای غەیب کردنیش کوفرە، خوا هەر خۆی دەزانێ سەرئەنجامان چی دەبێ، بە پێی ڕواڵەتی حاڵی کەسەکە، ئەگەر ڕواڵەتی چاکمان لێی دی، دەڵێین: ئومێدی چاکی بۆ دەکەین‌و بە پێچەوانەوە، ئەگەر ڕواڵەتی خراپمان لێی دی، دەڵێین: مەترسیی خراپەو تۆڵەی خوامان بۆی هەیە، بەڵام بە قەتعیی وا ناڵێین، دڵنیا بوون لە تۆڵەی خواو، بێ هیوا بوون لە بەزەیی خوا، سیفەتی کافرانن، خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿...فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٩٩﴾﴾ الأعراف، واتە: زیانباران نەبێ لە پلان‌و تەگبیری خوا ئەمین نین، وە دەفەرموێ: ﴿...وَلَا تَيْأَسُوا مِن رَّوْحِ اللَّهِ ۖ إِنَّهُ لَا يَيْأَسُ مِن رَّوْحِ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ ﴿٨٧﴾﴾ یوسف، واتە: کافران نەبێ، نائومێدو بێ هیوا نابن لە بەزەیی خوا. کەواتە: چ دڵنیابوون لە سزای خوا، چ نائومێد بوون لە ڕەحمەتی خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) ئینسان بەرەو کوفر دەبەن، جاری وایە جۆرە بێ ئومێدبوونێکی کەم، ئینسانی پێ گوناهبار دەبێ، بەڵام کە بێ ئومێد بوونەکەی قووڵبۆوە، هیچ ئومێدی بە ڕەحمی خوا نەما، مانای وایە کافر دەبێ، چونکە دیارە خوای نەناسیوە، دیسان دڵنیابوون لە سزای خوا بە شێوەیەك کە هیچ ترست نەمێنێ لە خوا، مانای وایە تۆ خوات نەناسیوە، بۆیە وا دڵنیای‌و ئەوەش سەردەکێشێ بۆ کوفر، با لەسەرەتاوە دڵنیابوون لە سزای خوا، یان نائومێدیی، کوفر نەبێ، بەڵام کەزۆر قووڵ بۆوە سەردەکێشێ بۆ کوفر.

ئنجا دەڵێ: (وَسَبِيلُ الْحَقِّ بَيْنَهُمَا لأَهْلِ الْقِبْلَةِ) ڕێگای حەق لە نێوان دڵنیابوون لە سزای خواو نائومێد بوون لە ڕەحمەتی خودایە. ڕێگای هەق ئەوەیە کەتۆ هەم ترسی تۆڵەی خوات هەبێ‌و هەم ئومێدی بەزەیی خوات هەبێ، بۆیە ئەهلی دڵ دەڵێن: ئینسانی بڕوادار بە دوو باڵی ترس و ئومێد (الخوف والرجاء) بەرەو خوا دەچێ، دەبێ باڵێکت ترس بێ‌و باڵێکت ئومێد بێ‌و مەترسی ئەوەت هەبی کە خوا تۆڵەت لێ دەستێنێ‌و سزات دەداتو

ناتبەخشێ، ئومێدیشت هەبێ كە خوا بتبەخشێ‌و عەفوت بكات‌و قەڵەم بەسەر گوناهو تاوانەكانت دا بهێنێ، ئینسان كە هەردوو لای بوون، ئنجا تەرازوو ڕادەوەستێ، وەك چۆن تەرازوو، ئەگەر لەلایەكیاندا شت هەبێ‌و لە لایەكەی دیكەدا شت نەبێ، تەرازووەكە لاتەڵ دەبێ، بەڵام ئەگەر لە هەردووكیاندا هاوسەنگ بێ، ئەوە تەرازوو ڕادەوەستێ، ئینسانی مسوڵمانیش بۆ ئەوەی دڵی تەرازوو ڕاوەستێ‌و هاوسەنگ بێ، پێویستە هەم ترسی هەبێ‌و هەم ئومێدیشی هەبێ.

كەواتە: (غرور) لە خۆبایی بوون‌و (يَأس) لەخۆ نائومێد بوون، سیفەتی ئینسانی مسوڵمان نین، ئینسانی بڕوادار نەتووشی لە خۆبایی بوون دەبێ، نەتووشی نائومێد بوونیش دەبێ، ئینسانی بڕوادار نەبەو شێوەیە كە بڵێ: من هەموو شتێكم، نەبەو شێوەیەشە، كە بڵێ من هیچم، نەخێر، بڕوادار ناڵێ من هەموو شتێكم،بەڵكو دەڵێ: هەر خوا هەموو شتێكە، وە بڕوادار ناشڵێ: من هیچم، بەڵكو بڕوادار دەڵێ: من شتم، بەڵام هەموو شتێك نیم، هەروەك سفر (هیچ)یش نیم.

## مرۆڤ بەچی كافر دەبێ و لە بازنەی ئیمان دەچێتە دەرێ؟!

سەرەنجام نووسەر لە كۆتایی حەوت تایبەتمەندییە فیكریی‌و عەقیدەیی‌و ئاكارییەكانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست (أتباع المنهج الصحيح)دا، دەڵێ:

٦١) ( وَلا يَخْرُجُ الْعَبْدُ مِنَ الإِيمَانِ إِلاَّ بِجُحُودِ مَا أَدْخَلَهُ فِيهِ ):

واتە: بەندە لە ئیمان ناچێتە دەر، مەگەر بە نكووڵیكردنی ئەو شتەی كە ئەوی بردۆتە نێو ئیمان. ئینسان بە دان هێنان بە تەنیا پەرستراوێتیی خواو پێغەمبەرایەتی موحەممەددا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەچێتە نێو ئیمان، چونكە كاتێك دانت بە تەنیا پەرستراوێتیی خوا (الله)دا هێنا، مانای وایە تۆ دەڵێی: تاكە بەدیهێنەرو خاوەن‌و پەروەردگار كە شایستەی ئەوە بێ بپەرسترێ‌و دروشم‌و دەستوور دابنێ‌و تاكە كەسێك خاوەنی هەموو سیفەت‌و ناوی

بەرزو پەسند بێت، خوا (الله)یە وە کە دانیشت بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەددا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هێنا، مانای وایە تۆ دان بەوەدا دێنی کە موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هەرچی فەرمووە، لەلایەن خواوە بۆی هاتوە، ئنجا ئەو شتانە چ عەقیدە بن، چ شەریعەت بن، چ بابەتی گشتییی‌و سەرەکیی بن، چ وردەکاریی (جُزْئي) بن، تۆ کەدانت بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەددا هێنا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مانای وایە دانت بە هەموو ئیسلامدا هێناوە، چونکە ئیسلام کێ هێناویەتی لە خواوە؟ موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەڵێ، کە دەڵێی: (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلاّ الله) یانی: دان دێنی بە یەکتایی خوادا لە بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتیی‌و پەرستراوێتیی‌و ناوو سیفەتەکانیدا، کە دەشڵێی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله)، مانای وایە: دانت هێنا بەوەدا کە موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خوا ڕەوانی کردوەو هەرچی کە فەرموویەتی، هەر هەمووی خوا پێی ڕاگەیاندوە، بۆیەش کەسێك هەزار جار بڵێ: (أَشْهَدُ أَن لا إِلَـهَ إلاّ الله) تاکو نەڵێ: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله) بە مسوڵمان لە قەڵەم نادرێ، باخواش بە تاك بزانێ، با بڕواشی هەبێ بە پەروەردگارێتیی‌و پەرستراوێتیی‌و ناوو سیفەتەکان، بەڵام دان بەپێغەمبەرایەتیی موحەممەددا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نەهێنێ، بە مسوڵمان لە قەڵەم نادرێ‌و بە بڕوادار حیساب ناکرێ، ، چونکە مسوڵمان ئەو کەسەیە کە بەرنامەی خوای قبووڵ بێ، لە ڕێی بڕوا هێنان بە موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) یشەوە نەبێ ناچیە نێو ئیسلامەوە، بۆیە نەصرانیی‌و جوولەکە،کە دەڵێن: ئێمە دەزانین پەروەردگارێك هەیە، خاوەنی هەموو سیفەتی چاکەو وایەو وایە...، بەڵام دان بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەددا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ناهێنن، ئەوانە پێیان ناگوترێ: بڕوادارو بە مسوڵمان لە قەڵەم نادرێن.

ئنجا دەڵێ: بەندە لە ئیمان ناچێتە دەرو ئیمانی لێ ناسەندرێتەوە، مەگەر بە ئینکاریی کردنی شتێك کە ئەوی بردۆتە نێو ئیمانەوە، (جُحُود) یانی: ئینکاریی کردن، خوای پەروەردگار دەربارەی ئالی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ... ﴿١٤﴾ ﴾النمل، واتە: ئینکارییان لێکرد {لە مووساو لە موعجیزەکانی}

هەرچەندە دڵنیاش بوون {كە مووسا پێغەمبەری خوایەو موعجیزەكانیشی ڕاستن} (جُحود)[1] ئەوەیە كەتۆ هەقێك بناسیو بزانی، بەڵام ئینكاریی لێبكەیو دانی پێدا نەهێنی. كەواتە: ئەوانەی پێیان وایە ئیمان ئەوەیە كە تۆ بزانی خوا هەقەو پێغەمبەرو (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئیسلام هەقن، نەیانپێكاوە، بەڵكو: ئیمان ئەوەیە كە بزانی ئەوانە هەقنو دانیان پێدا بهێنیو بۆشیان گەردنكەچ بی، ئەوە ئیمانە، وەك پێشتریش گوتمان.

كەواتە: بە قەتڵ، زینا، دزیی، شەڕاب خواردنەوە، قومار، بە هەرچی گوناهو تاوان هەیە غەیری ئەو گوناهانەی كە ئینسان پێیان كافر دەبێ، یان پێیان دەبێتە موشریك، یان پێیان دەبێتە مونافیق، یان مولحید، مسوڵمان بە گوناحو تاوانەكان كافر نابیو لەبازنەی ئیمان ناچێتە دەر، بەڵێ، ئیمانەكەی نوقسان دەبیو كەلێن ڕووی تێدەكا، بەڵام ئیمانەكەی هەڵناوەشێتەوە.

## تێبینییەكی پێویست لەسەر قسەكەی طەحاویی، كە دەڵێ: مرۆڤ بەس بە نكووڵیی لێكردن (جحود) كافر دەبێ :

طەحاویی لێرەدا كە دەڵێ: (وَلا يَخْرُجُ الْعَبْدُ مِنَ الإِيمَانِ إِلاَّ بِجُحُودِ مَا أَدْخَلَهُ فِيهِ) واتە: بەندە لە ئیمان ناچێتە دەر، مەگەر بە ئینكارییكردنی شتێك كە ئەوی بردۆتە نێو ئیمانەوە، واتە: مسوڵمان دوای ئەوەی كە ئیمان دێنێ، كافر نابیو لە ئیسلام ناچێتە دەر، مەگەر بە ئینكاریی كردنی یەكێك لەو ڕاستیيانەی كە پێیان بۆتە بڕوادارو مسوڵمان.

ئەو تەعبیرەی طەحاویی تەعبیرێكی كەمو كورتەو وەك پێویست و پڕ بە پێست نیە، چونكە مەرج نیە ئینسان تەنیا بە ئینكارییكردنی ڕاستییەكانی ئیسلام كافر بێ، بەڵكو جاری وایە ئینسان نكووڵیی لە ڕاستییەكانی ئیسلام ناكات، بۆ وێنە: فەرز بوونی نوێژو ڕۆژوو و زەكاتو حەجو جیهادو چیو چی...، بەڵام كافریش دەبێ، بۆ وێنە:

---

[1] جَحَدَ الأَمْرَ وجَحَد به يَجْحَدُ جَحْداً وجُحوداً: أَنكَره مَعَ عِلمِهِ بِهِ. المُعجَم الَسيط، ص١٠٧.

١) هەر كەسێك گاڵتە بە یەكێك لە شتەكانی ئیسلام بكات، یان گاڵتە بـە فەرمایشـتی خوای پەروەردگار، یان بەپێغەمبەر (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بكات، پێی كافر دەبێ، وەك خوا (عزّ وجلّ) لە سووڕەتی (التوبـة)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ... ﴿٦٦﴾ ﴾، واتە: ئەگەر لێیان {لەو دەغەڵ و دڵ نەخۆشانەی كە لە جەنگی تەبووك لە خزمەتی پێغەمبەردا (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّم) بوون} بپرسی بۆچی ئەو قسانە دەكەن؟ دەڵـێن: ئێمـە هـەر كـات بـەڕێ دەكـەین و قسەكانمان بە گاڵتەو سوحبەت كردوە، ئنجا خوای دادگـەر دەفـەرموێ: ئایـا گاڵتـە بەخواو ئایەتەكانی پێغەمبەرەكەی دەكەن؟ عوزر مەهێننەوە، بێگومان ئێوە لە دوای ئەوەی ئیمانتان هێنا بوو، كافر بوون. كەواتە: ئینسان بە گاڵتەو سووكایەتییكردن بە یەكێك لەو شتانەی خواو پێغەمبەری خوا فەرموویانە (صَلّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّم) كـافر دەبێ، با نكوولێیش نەكات.

٢) هەموو زانایانی ئیسلام دەڵێن: كافركەرەكان (مُكفِّرات) سێ جۆرن و ئەو شتانەی كـە ئینسان كافر دەكەن، سێ جۆرن:

أ- بڕوایی (إعْتِقادي).

ب- وتەیی (قَوْلي).

ج- كردەیی (عَمَلي).

بەڵێ، جاری وا هەیە هەندێ شت بە دڵی ئینسان دادێ، ئینسانی پێ كـافر دەبـێ، یان بە زمانیدادێ، یان بە كردەوە ئەنجامی دەدات:

١) بە دڵ، بۆ وێنە: ئینسان بە دڵی دابێ كە خوای كاربەجێ نەدەبوو وابكات، یان خـوا (جلّ جلالهُ) فلان شتەی نەزانیوە، یان پێغەمبەر (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فلان شتەی زوڵم بووە....هتد، ئەگەر شتێكی وای بەدڵ دابێ و دڵی لەسەر چەسپاند، پێی كافر دەبـێ،

بەڵام خەیاڵو خوتخوتە جیایە، بەڵام ئەگەر لە دڵیدا چەسپیو کردی بەجەزم، پێی کافر دەبێ، بادەریشی نەبڕیبێ بە زمان.

٢) یاخود قسەیەك بە زمانیدابێ، وەك ئینکاریی کردن، یان بەسووك تەماشا کردن، دیسان پێی کافر دەبێ.

٣) هەروەها هەر کردەوەیەکیش کە کوفر بێو کوفر بگەیەنێ، بۆ وێنە: ئەگەر قورئانێك بخاتە شوێنێکی پیسەوە، یان ئایەتێکی خوا بە تەوهینەوە فڕێ بدات، یان ناوی خوا فڕێ بداتە نێو شتێکی پیسەوەو بشزانێ ئەو وەرەقەیە ناوی خوای لەسەرە، پێی کافر دەبێ، یان گاڵتە بە ڕیش بکات، لەبەر ئەوەی سوننەتی پێغەمبەرە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) پێی کافر دەبێ، یان سەجدە بۆ بتو صەنەمێك، یان تاغووتێك بەرێ، پێی کافر دەبێ کەواتە: خاڵی شەستو یەکەمین (٦١)ەمین عیبارەتێکی کەم و کورتەو پڕ بەپێست نیە، چونکە ئینسان بەس بە ئینکاریی (جحود) کردن کافر نابێ، بەڵکو کۆمەڵێك شتی دیکەش هەن، ئینسانی مسوڵمانیان پێ کافر دەبێ[1].

******



١) شایانی باسە کە ئێمە لەبەرگی یەکەمی کتێبی: (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی...)دا باسێکی خستو خۆڵمان لەبارەی هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیمانو ئیسلامەوە کردوەو، بۆ چاك لێ تێگەیشتنی ئەم مەسەلە گرنگە، واباشە سەرنجی ئەوێ بدرێ.

ئەمجارە نووسەر دێتە سەر باسی پێناسەی ئیمان‌و نێوەڕۆكەكەی‌و چۆنییەتیەكەی‌و پایە سەرەكییەكانی‌و شەش خاڵی بۆ تەرخان دەكات، كە خاڵەكانی: (٦٢-٦٧)ن، دیارە ئێمە هەركام لە بەرگی (١)ی {ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی}و بەرگی (٢)ی (الإسلام كَما يَتَجَلّى في كِتابِ الله)مان بۆ توێژینەوەی لەبارەی ئیمانەوەو پێناسەكردنی‌و چۆنییەتی‌و نێوەڕۆكی‌و پایەكانی‌و بەرهەم‌و شوێنەوارەكانی لە ژیانی تاك‌و كۆمەڵ دا، تەرخان كردوە.

هەروەها لە كتێبی {خوا ناسیی، ئاین، ئیمان}یش دا لەچەند ڕوویێكەوە لێكۆڵینەوەی فیكرییمان لەبارەی ئیمانەوە كردوە.

بەهەرحاڵ، نووسەر لەم خاڵی شەست‌و دووەم دا، ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر باسی پێناسەی ئیمان‌و، دەڵێ:

٦٢) ( وَالإِيــمَانُ: هُــوَ الإِقْرَارُ بِاللِّسَانِ، وَالتَّصْدِيقُ بِالْجَنَانِ ):

واتە: ئیمان بریتیە لە دان پێدا هێنان بە زمان و، بەڕاست زانینی بە دڵ. ئەم پێناسەیە بۆ ئیمان، ڕاو بۆچوونی ئەبو حەنیفەیە كە دەڵێ: ئیمان لەو دوو شتانە پێكدێ، دان پێدا هێنانی بە زمان‌و بەڕاست زانینی بەدڵ، ئەوە ئەبو حەنیفە ڕای وایە (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، ئەگەرنا: شافعیی‌و مالیك‌و ئەحمەدو جەماوەری زانایان دەڵێن: ئیمان لە سێ بەشان پێكدێ، نەك لە دوان، دەڵێن: (وَالإِيـمَانُ: هُوَ الإِقْرَارُ بِاللِّسَانِ، وَالتَّصْدِيقُ بِالْجَنَانِ، وَالعَمَلُ بالأَرْكَان) واتە: ئیمان دان پێداهێنانە بە زمان‌و، بەڕاست زانینە بە دڵ‌و، كردەوەیە بە ئەندامەكان، بەڵام ئەبو حەنیفە دەڵێ: كردەوە بەشێك نیە لە ئیمان، بەڵكو كردەوە میوەو بەرهەمی ئیمانەو بەشێكی ئیمان نیە، جیاوازیی نێوان ڕای ئەبو حەنیفەو زاناو پێشەوایانی دیكە، كە ڕای زۆربەو جەماوەری زانایانن، ئەوەیەكە: ئەبوحەنیفە دەڵێ: كردەوەی چاك بەرهەم‌و میوەی ئیمانە، بەڵام باقی زانایان دەڵێن: نەخێر كردەوە بەشێكە لە

ئیمان، هەڵبەتە زۆربەی جەماوەری زانایانیش کە ڕایان وایە کردەوە بەشێکە لـە ئیمـان، ئەوانیش دیسان دوو ڕان:

ڕایەکیان کە زۆربەن دەڵـێ: کـردەوەی ئەندامـەکان بەشـێکی پێکهێنـەر (مُكَوِّن)ی ئیمانەو، بەبێ کردەوە ئیمان نایەتە دی.

ڕایەکیشیان کە کەمینەن دەڵێ: کردەوە بەشێکی تەواوکەر (مُكَمِّل)ی ئیمانە، واتـە: بەبێ کردەوەش ئیمان دێتە دی، بەڵام نوقسانو ناتەواوە.

بەڵام پێویستە بزانرێ ئەوانەش کە کردەوە بە پێکهێنەری ئیمان دەزانن دەڵێن: ئەسڵی کردەوەو ڕەگەز (جِنس)ی کردەوە، بەشێکە لـە ئیمـان، نـەك هـەموو کردەوەیـەك، وەك موعتەزیلەو خەواریج گوتوویانە، ، چونکە (المُعتَزِلة)و (الخَوارِج) دەڵێن: هـەموو کـردەوە چاکەکان پێکهێنـەری ئیمـانن‌و، هـەموو گونـاهو خراپـەکانیش دژی ئیمـانن، بۆیـە ئـەوان دەڵێن:

هەرکەسێك یەك فەرز بچوێنێ، یان یەك قەدەغە بشکێنێ، پێی کـافر دەبـێ، بـەڵام موعتەزیلـە لەجیـاتی کـوفر دەڵـێن: پێگـەی نێـوان دوو پێگـەکان (مَنزِلـة بَيـنَ الـمَنزِلَتَيْن)ی هەیە!

ئنجا وەك چۆن (خَـوارِج)و (مُعْتَزِلـة) تێیـان پەڕانـدوەو تووشـی (إِفـراط) بـوون، لـە بەرانبەریشیاندا سێ تاقم‌و پێڕ هەن کە بەپێچەوانەوە گیرۆدەی بەزایەدان (تَفْريط) بـوون، ئەوانیش بریتین لە:

مورجیئـەکان: کە بەگشتیی کردەوە لە ئیمان دا دەبڕن‌و دوادەخەن‌و دەڵێن: کردەوە هـیچ پەیوەندیی بە ئیمانەوە نیە: نەبەشێکی پێکهێنەریەتی‌و، نەتەواوکەریەتی‌و، تەنانەت نەبەرهەم‌و شوێنەواریشیەتی!

کەڕڕامیـەکان: دەڵێن: ئیمان بەس بریتیە لە دان پێداهێنانی بە زمان، واتە: هەر کەسێك بە زمان دانی پێداهێنا ئەوا بڕواداره، لە دنیادا بڕواداره، بەڵام لە قیامەت خوا سزای دەدات، ئەوە شتێکی دیکەیە.

جەهمییەكان: دەڵێن: ئیمان بەس بریتیە لە بەڕاست زانینی دڵ، مادام بە دڵ زانی خوا هەقەو پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هەقەو ئیسلام هەقە، ئەوە ئیماندارە.

شایانی باسیشە ئێمە لەو دوو كتێبەماندا كە چەند جارێك ئاماژەمان پێكردن‌و تەرخانمان كردوون بۆ ڕوونكردنەوەی ئیمان‌و عەقیدە، واتە:{ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی} بەرگی یەكەم‌و، (الإسلام كَما يَتَجَلّى في كِتابِ الله) بەرگی دووەم، بەدرێژیی بەڵگەمان لەسەر ئەوە هێناوەتەوە كە كردەوە بەگشتیی بەشێكە لە ئیمان‌و، ئیمان بەبێ وی نایەتەدی، هەروەها بەرپەرچی سەرجەم بیرۆكەكانی دیكەی دژ بە پێناسەی پێشینی چاك (تَعريف السلَف الصّالح)یشمان بۆ ئیمان داوەتەوە، بۆیە لێرە نامەوێ بەچەند ڕستەیەك باسی بكەم‌و هەقی خۆی پێ نەدەم.

كەواتە: دەبێ تێبینی لەسەر ئەو خاڵە دابنێین كە دەڵێ: (وَالإِيمَانُ: هُوَ الإِقْرَارُ بِاللِّسَانِ، وَالتَّصْدِيقُ بِالْجَنَانِ) دەبێ بڵێین: (وَالعَمَلُ بالأرْكَان)، ئەوە ڕای زۆربەی زانایانەو دواییش زیاتر ئەو ڕایەی نووسەر هەڵدەسەنگێنین.

ئنجا لەسەر پێناسەی ئیمان‌و داخوازییەكانی بەردەوام دەبێ‌و، دەڵێ:

٦٣) ( وَجَمِيعُ مَا صَحَّ عَنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنَ الشَّرْعِ وَالْبَيَانِ كُلُّهُ حَقٌّ ):

واتە: هەرچی كە لەرێیەكی ڕاستەوە لە پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە ئێمە گەیشتوە، لە شەریعەتی خواو لە ڕوونكردنەوەیەك كە پێغەمبەر دینی خوای پێ ڕوونكردۆتەوە، هەمووی هەقەو ڕاستە.

دیارە ئەوەش بەرپەرچدانەوەی قسەی ئەوانەیە، كە دەڵێن: فەرموودەكانی ئاحاد (أحاديث الآحاد) مەسەلەكانی عەقیدەیان پێ ناچەسپێ‌و دەبێ حەدیسی موتەواتیربێ،

بەڵکو هەرچی بۆمان دەرکەوت کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی، با تێشیدا نەگەین بە یەقین هەرچی بە گومانی زاڵ (الظن الرّاجح) پێمان وابوو کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی، دەبێ پێیەوە پابەند بین، دیارە هەتا پتەوتر بێ‌و یەقینمان دامەزراوتر بێ، کە ئەوە قسەی پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و ئەو فەرموویەتی، دەبێ زیاتری وەربگرین‌و هەتا کەمتریش بێ کەمتر، مەگەر دەقێکی سوننەت لەگەڵ قورئاندا تێك بگیرێ، یان لەگەڵ عەقڵ‌و زانست‌و واقیعدا، ئەو کاتە دەزانین کە هی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نیەو حوکمەکەی دەگۆڕێ، با لەڕووی سەنەدیشەوە بەهێز بێ، وەك زانایانی ڕۆچوو، هەندێك دەقی سوننەتیان لەبەر ئەو هۆکارانەی گوتمان وەرنەگرتوون[1].

ئەمجارە نووسەر مەسەلەیەکی دیکە وەك یەکێك لە بنەما فیکریی‌و عەقیدەییەکانی پێشینی چاك‌و پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست دەخاتە ڕوو، لەخاڵی شەست‌و چوار (٦٤)دا، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی نووسەر لەم خاڵەدا، بەناوی عەقیدەو فیکری سەرجەم زانایانی ئیسلامەوە دەیخاتە ڕوو، وانییەو ئەوە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان وانییە، وەك باسی دەکەین، بەڵام نووسەریش لەسەرەتای کتێبەکەیدا ڕوونی کردۆتەوە کە لەخستنە ڕووی عەقیدەی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتدا پشتی بە بیرو ڕایەکانی (أبو حنيفة)و دوو هاوەڵەکەی (أبو يوسف)و (محمد بن حسن الشّيباني) بەستوە کە، ئەمە دەقی قسەکەیەتی:

{هذا ذِكْرُ بَيان عَقيدة أهل السُنّة والجماعة عَلى مَذْهَب فُقَهاء المِلَّة: أَبـي حنيفة النُّعْمان بن ثابت الكوفـي، وأبو يوسف، يَعْقوب بن إبراهيم الأنصاري، وأبـي عبدالله،

---

١) کەواتە: لەبواری وەرگرتن‌و کارپێکردنی دەقەکانی سوننەت دا، جیاوازیی لەنێوان جۆری (متواتر) و (آحاد)دا نیەو، هەمووی دەبێ وەربگیرێ، چ لەبواری ئیمان‌و عەقیدەو، چ لەبواری شەریعەتدا، بەڵام لەو ڕووەوە جیاوازن، کە هەرشتێك بەشێوەی (تواتر) چەسپابێ لەبواری عەقیدەدا نکوولّیی لێکردنی سەردەکێشێ بۆ کوفر، بەڵام هی (آحاد) وا نیە. بڕوانە: (تيسير علم أصول الفقه) عبدالله بن يوسف الجديع، ص ١٤١، ١٤٢.

محمـد بن الحَسَن الشّـيباني رضوان الله عَليهِم، وَما يَعتَقِدونَ مِن أُصول الدِّين ويدينون بـهِ رَبَّ العالَميــن}.

٦٤) ( وَالإِيــمَانُ وَاحِــدٌ وَأَهْلُهُ فِي أَصْلِهِ سَــوَاءٌ، وَالتَّفَاضُلُ بَيْــنَهُمْ بِالْخَشْــيَةِ وَالتُّقَى، وَمُخَــالَفَةِ الْهَوَى، وَمُلازَمَــةِ الأَوْلَــى ):

واتە: ئیمــان، یەکەو خاوەنانی ئیمــان، ئەوانەی کە بڕوادارن، لــە ئەســڵ‌و بنچــینەی ئیماندا یەکسانن، بــەرزیی‌و نزمیــی لــە نێوانیانــدا بــە لەخواترســان‌و پارێزکــاریی‌و، ســەرپێچی کردنی ئارەزووو هەڵبژاردنی دوارۆژە (بەسەر دنیادا)، یان هەڵبژاردنی چاکتــرە بەسەر چاکدا.

لێرەشدا دیسان ڕای زۆربەی زانایانی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت، لەگــەڵ ڕای ئــەبو حەنیفەو دوو هاوەڵەکەیدا تێکدەگیرێ‌و، تەنیا ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێبێ) و ئەوانەی لەسەر مەزهەبەو ڕای وین دەڵێن: ئیمان یەکە، یانی بەپێی بۆچوونی ئــەبو حەنیفــە بــێ ئیمانی کەسێکی عەوام لەگەڵ ئیمانی ئەبو بەکری صیددیق (خوا لێــی ڕازی بــێ)، بــەڵکو لەگەڵ ئیمانی پێغەمبــەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) و، لەگــەڵ ئیمــانی فریشــتە نێزیکــەکان (المَلائِكة المُقَرَّبين)دا، هەموو یەکن، ئەدی ئایا بەرزیی‌و نزمییان نیــە؟؟ دەڵــێ: بــەرزیی‌و نزمییەکەیان لەوەدایە: کامەیان زیاتر لــە خــوا دەترســێ‌و، کامــەیان تــەقوای زیــاترەو، بەقسەی ئارەزووی ناکات‌و، کامەیان زیاتر دوارۆژ هەڵدەبژێرێ، یان چاکتر بەسەر چــاکدا هەڵدەبژێرێ، ئەوانە هۆکاری بەرزیی‌و نزمیی ئیمانەکانیانن! کەواتە: هۆکارەکــە ئەســڵی ئیمان نیە، بەڵکو بەرهەمی ئیمانە، چونکە لە خوا ترسان‌و، تەقواو، هەڵبژاردنی دوارۆژ، بەرهەمی ئیمانن، لەسەر بۆچــوونی ئــەبو حەنیفــەو دوو هاوەڵەکــەی‌و ژمارەیــەك لــە زانایان، بەڵام جەماوەری ئەهلــی ســوننەت‌و جەماعەت دەڵێن: نەخێــر، بەڵکو لە ئەسڵی ئیماندا بەرزیی‌و نزمیی هەیە، ئیمانی پتەو هەیەو ئیمانی پتەوترین هەیە، وەئیمانی لاواز هەیەو لاوازترین هەیە، چەندان ئایەت‌و فەرموودەی پێغەمبــەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّم) دەلالەت لەسەر ئەوە دەکەن‌و، بەڕوونیی باسی کــەمیی‌و زیــادیی‌و، بــەرزیی‌و نزمیــی ئیمــان دەکــەن.

## چوار بەڵـگە لەسەر هەڵوەشـاندنەوەی قسـەی نووسەر، کە دەڵێ:ئیمان یەك جـۆرە:

یەکـەم: خوا (تبارك وتعـالى) دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ﴾الأنفـال،

واتە: بڕواداران بەس ئەوانەن کاتێك باسی خوا دەکرێ، دڵیـان ڕادەچـڵەکێ‌و کاتێـك ئایەتەکانی خوایان بەسەردادەخوێنرێنەوە، ئیمانیان زیاد دەکەن.

دووەم: لە ئایەتێکی دیکـەدا دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى ... ﴿١٧﴾ ﴾محمد،

واتە: ئەوانەی ڕێی ڕاستیان گرتـوە، زیـاتر خسـتنییە سـەر ڕێـی ڕاسـت .کەواتـە: هیدایەت زیاد دەکات‌و بەوەش ئیمان زیاددەکات.

سێیەم: هەروەها فەرموویـەتی: ﴿ ... فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾التوبة، واتە: بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هێناوە (ئەو سووڕەتە دابەزێنراوە) ئیمانی زیادکردن‌و دڵخۆش بوون.

چوارەم: فەرموودەی پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەو بارەوە هەن، کاتێك کەسـێك گوناهێك ئەنجام دەدات، ئیمانەکەی نامێنـێ، وەك لەم دەقـەدا دەردەکـەوێ: {عَـنْ أَبي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ النَبِـيِ قَالَ: «لا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُـؤْمِنٌ، وَلا يَشْـرَبُ الْخَمْـرَ حِـينَ يَشْـرَبُهَا وَهُـوَ مُـؤْمِنٌ، وَلا يَسْـرِقُ السَّـارِقُ حِـينَ يَسْـرِقُ وَهُـوَ مُؤْمِنٌ»} حديث صحيح[1].

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨١٨٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٣٤٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٨٧٠)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩٣٦).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّم) فەرموویەتی: زینـاكەر لە كاتێكـدا، كە زینـا دەكات ئیمانی نیە، شـەڕاب خۆریش لە كاتی شەڕاب خواردنەوەكەی دا ئیمـانی نیە، دزیش لە كـاتی دزیـی كردنەكەیـدا، ئیمـانی نیە!

كەسێك كاتێك زینا دەكات، لە كاتی زیناكەی دا ئیمانی نامێنێ، یانی ئەو ئیمانەی بیگێڕێتەوە لە زینا، نامێنێ، بەڵام ئەسڵی ئیمانەكەی ماوە. كەواتـە: ئیمانەكـەی كـەم دەكات‌و هەر گوناهێك كە ئینسان دەیكات، لە كـاتی گونـاح كردنەكەیـدا، ئیمانەكـەی پلەیەك، یان چەند پلەیەك دادەبەزێ، وە هەر تاعـەتێك كـە دەیكـات پلەیـەك، یـان زیـاتر ئیمانەكەی پێ زیاد دەكـات، ئەوەش شتێكی هەست پێكراوە: ئایەتێكت بەسەردا دەخوێنرێتەوە، زیاتر شارەزا دەبیت‌و ئیمانەكەت زیاد دەكات، فەرموودەكانی پێغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) زیاتر فێر دەبی، كاریان پێدەكەی‌و ئیمانەكەت زیاد دەكات.

كەواتە: ئیمان بەتاعەت زیاد دەكات، بە گوناهو سەرپێچیی كەم دەكات، وەك زانایانی پێشین گوتوویانە: (الإِيـمانُ يَزِيدُ وَ يَنقُص، يَزِيدُ بالطّاعَة، وَيَنقُصُ بالمَعصية) واتە: ئیمـان زیادو كەم دەكات، بەفەرمانبەریی زیاد دەكات‌و بەسەرپێچیی كەم دەكات. بۆیـە دەبـێ تێبینی لەسەر ئەو خاڵەی دابنێین كە دەڵێ: (وَالإِيـمَانُ وَاحِدٌ)، نەخێر ئیمـان یـەك نیـە، بەڵكو جۆراو جۆرە، هەروەها، كە دەڵێ: (وَأَهْلُهُ فِي أَصْـلِهِ سَوَاءٌ) نەخێر، ڕای بـەهێزترو پەسندتر ئەوەیە كە لە ئەسڵی ئیمانیشدا خەڵك وەك یەك نین، ئیمانی ئەبو بەكری صیددیق وەك ئیمانی كەسێكی دیكە نیە، ئیمانی كەسێك كە ئیمان لە دڵیدا وەك شاخی قەندیل‌و كێوەڕەشەو، بە هیچ شێوەیەك بە ڕەشەبای هیچ شوبهەو شەهوەتێك نـاجووڵێ‌و نالـەقێ، وەك ئیمانی كەسێك نیە كە لەسـەر قەراغێكـە، بـە پشـوە بـای شـوبهەو شـەهوەتێك، ئیمانەكەی دەلەقێ‌و نامێنێ!!

ئنجا نووسەر لە خاڵی (٦٥)دا، باسی بنەمایەكی دیكەی فیكریی و عەقیدەیی دەكات كە پێی وایە خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسوڵمانانە، دەڵێ:

٦٥) ( وَالْمُؤْمِنُـــونَ كُلُّهُمْ أَوْلِيَـــاءُ الرَّحْمَـــــنِ، وَأَكْرَمُهـــــُمْ عِنْــــدَ اللهِ أَطْوَعُهـــُمْ وَأَتْــبَعُـــهُـــمْ لِلْقُــرْآنِ ):

واتە: بڕواداران هەر هەموویان دۆستی خوای بەبەزەیین، هەموویان بە دۆستی خوا لـە قەڵەم دەدرێن، وە بەڕێزترینیان لەلای خوا ئەوەیە، كە زیاتر گەردنكەچی خوایە، زیاتر بە دوای قوڕئان دەكەوێ.

دیارە هەر باسی قوڕئانی كردوە، دەنا سوننەتی پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّم) ڕوونكەرەوەی قوڕئانە، هەروەها قسەو بەرهەمی زانایانیش، شەرحو تەفسـیری قوڕئـانو سوننەتە. كەواتە: هەر كەسێك بڕوادار بێ، هەتا ئیمانەكەی زیاتر بێ، دۆستایەتیی لەگەڵ خوادا زیاتر دەبێ، ئەوەیان لەلای خوا بەڕێزترە كە زیـاتر بەقسـەی خـوا دەكـاتو بـۆی ملكەچترەو بە شەرعی خواوە پابەندترە.

نووسەر لە خاڵی (٦٦)دا باسی شەش پایەكانی ئیمان دەكات، شـایانی باسیشـە لـە قوڕئان دا تەنیا باسـی پێنج پایە كـراوە، وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿ ...وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ... ﴿١٧٧﴾ ﴾ البقـرة، بـەڵام لـە سـوننەتدا باسـی ئیمـان بەقـەدەریش كـراوە، وێـڕای پێـنج پایەكـەی دیكـە، وەك لـەو فەرموودەیـەدا هاتوە كە بە (حَديث جبريل) ناسراوە: {«الإِيْمَانُ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ وَمَلاَئِكَتِـهِ

وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ»}حديث صحيح[1]. ئاشكراشە كە ئیمان بەقەدەری خوا هەر دەچێتەوە نێو ئیمان بەخواو سیفەتەكانی، چونكە ئیمان بە قەزاو قەدەر، یانی: ئیمان بە زانیاریی‌و ویست‌و دەستەلاٌت‌و دادگەریی‌و حیكمەتی ڕەهای خوا عز وجل، دەڵێ:

> ٦٦) ( وَالإِيمَانُ: هُوَ الإِيمَانُ بِاللهِ، وَمَلائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الآخِرِ، وَالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، وَحُلْوِهِ وَمُرِّهِ مِنَ اللهِ تَعَالَى ):

واتە: ئیمان بریتیە لە بڕواهێنان بە خواو بە فریشتەكانی خواو بە كتێبەكانی خواو پێغەمبەرانی خواو بە ڕۆژی دوایی، وە بە ئەندازەگیریی كردنی خێرو شەڕ، چاكەو خراپە، شیرین‌و تاڵ، هەمووی لە خوای بەرزەوەیە.

ئەوانە شەش پایەو بنچینەكانی ئیمانن، بەلاٌم ئیمان تەنیا ئەو شەش[2] پایە نیەو ئیمان هەر ئەوەندە نیە، بەڵكو چەند لق‌و پۆپی دیكەی لێ دەبنەوە، بۆ وێنە:

١/ بڕواهێنان بە (جن) ئەویش بەشێكە لە ئیمان، بەلاٌم ئەویش خراوەتە نێو بڕواهێنان بە فریشتەكان.

٢/ ئیمان هێنان بە نیعمەت‌و سزای ژیانی دوای گۆڕ.

٣/ بڕواهێنان بە هاتنە خوارەوەی عیسا (علیه السلام)، هاتنی دەججاڵ‌و هاتنی یەئجووج‌و مەئجووج‌و نیشانەكانی دیكەی هاتنی ڕۆژی دوایی، وەكو دواتر دەیگەینێ، ئەوانەش

---

١ ) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٠٢).

٢) دیارە پایەكانی هەر شتێك بناغەی ئەو شتەن، نەك كۆی ئەو شتەو، دیارە شتی دیكەشی هەیە كە لەسەر پایەكان وەستاوە.

هەموو دەبێ ئینسان ئیمانی پێیان هەبێ، بەڵام بڕوا بەڕۆژی دوایی بوون، هەموو ئەوانە دەگرێتە خۆی. كەواتە: ئەوانە شەش پایەو بنچینەی سەرەكیی ئیمانن، ئەگەرنا پێكهاتەكانی ئیمان هەر ئەوەندە نین.

نووسەر لە خاڵی (٦٧)دا هەر قسەكانی پێشووی تەئكید دەكاتەوەو، باسی جیاوازیی نەخستنە نێوان پێغەمبەرانیش (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) دەكات لە ڕووی بەڕاست دانانو ئیمان پێهێنانیانەوەو، دەڵێ:

> ٦٧) ( وَنَحْنُ مُؤْمِنُونَ بِذَلِكَ كُلِّهِ، لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ، وَنُصَدِّقُهُمْ كُلَّهُمْ عَلَى مَا جَاءُوا بِهِ ):

واتە: ئێمە بڕوامان بەوەی باسكرا هەمووی هەیە، جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ كام لە پێغەمبەرانی خواوە، لەوەدا كە ئەوەی لەخواوە هێناویانە هەموویان بەڕاست دادەنێین. واتە: جیاوازییان ناخەینە نێوان، لە ئەسڵی پێغەمبەرایەتییەكەیانداو، لەوەدا كە هەقنو بەرنامەی هەقیان بۆ هاتوە، ئەگەرنا بەرزیيو نزمییان لە نێوان دا هەیە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمویّ: ﴿...وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ... ﴿٥٥﴾﴾ الإسراء، واتە: بێگومان هەندێك لە پێغەمبەرانمان بەرز كردۆتەوە بەسەر هەندێكیاندا، لە ئەسڵی پێغەمبەرایەتییەكەیاندا وەك یەكن، ئەگەرنا لە پێگەو پلەو پایەیاندا، گەورەو گەورەتریان هەیە، بەرزیان هەیەو بەرزتریان هەیە، تەواوو تەواوتریان هەیە، پێغەمبەری ئێمە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سەروەری هەموویانە، ئنجا كە دەڵێ: (نُصَدِّقُهُمْ كُلَّهُمْ عَلَى مَا جَاءُوا بِهِ) واتە: هەموویان بەڕاست دەزانین لەوەدا كە لە خواوە هێناویانە، هەموو پێغەمبەران بەڕاست دەزانین كە ئەوەی هەواڵیان پێداوە لە خواوە، ڕاستەو هیچی پێچەوانەی

حەقیقەت‌و واقیع نیە، چونكە مەرجی پێغەمبەرایەتیی بریتیە لە (عِصمة)، واتە: پارێزران لە درۆو خیانەت و شاردنەوە، لە هەرچی كە شەخصیەتی پێغەمبەرێكی پێ لەكەداربێ، یان زیان بگەیەنێ بەو پەیامەی كە پێغەمبەران ڕای دەگەیەنن. كەواتە: هەرچی پێغەمبەران فەرموویانە، هەقەو ڕاستە، كە دەگوترێ: فلان فەرموودە بێهێز (ضعیف)ە، یان هەڵبەستراو (موضوع)ە، مەبەست ئەوە نیە كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هەڵی بەستوە، یان قسەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بێهێزە، نەخێر، بەڵكو یانی: لەڕووی سەنەدەكەیەوە بێهێزە[1]، ئەگەرنا ئەگەر بۆمان دەركەوێ شتێك پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی، ئەوە هەمووی بەهێزو تەواوە.

*******



١) كاتی خۆی بۆیە ئەوەم گوتوە، چونكە كەسانێكی غەرەزاویی‌و سەرو سینە نەخۆش، یان سادەو كەم هۆش هەبوون، ئەو جۆرە پڕو پاگەندانەیان لەدژ دەكردین كە لە وتارو دەرس‌و كتێبەكانماندا باسی جۆرەكانی سوننەتمان دەكرد لە ڕووی پلەبەندیی یەوە كە لە ڕووی زنجیرەی ڕاوییەكانەوە: موتەواتیرو ڕاست (صحیح)و چاك (حسن)و بێهێز (ضعیف)و هەڵبەستراو (موضوع)یان هەیە.

# یازده (١١)

# تایبەتمەندیی عەقیدەیی و فیکریی و سیاسیی و فیقهیی

# ئەهلی سوننەت و جەماعەت



نووسەر (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، بۆ دووبارە دەگەڕێتەوە سەر خستنە ڕووی تایبەتمەندییەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست کە ئەمجارە تایبەتمەندییەکان جۆراو جۆرن‌و وێڕای لایەنی عەقیدەیی‌و فیکریی، لایەنی سیاسی‌و عیبادیی‌و فیقهییشی پێ گرتوونەوە!

بەڵێ، ئەمجارە لە میانەی دە (١٠) خاڵ دا کە خاڵەکانی: (٦٨-٧٧)ن نووسەر یازدە (١١) تایبەتمەندیی جۆراو جۆری ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت دەخاتەڕوو کە بێگومان مەبەست لەو کارەی بە پلەی یەکەم، بەرپەرچدانەوەی بیرۆکە پەیداکراوو داهێنراوەکانی بیدعەت چییەکان (أَهْل البِدع) بووە لە: خەواریج‌و شیعەو موعتەزیلەو قەدەرییەو مورجیئەو جەهمییەو...هتد.

کە هەر کامێکیان لە لایەنێك‌و بابەتێك، یان زیاتردا لایانداوەو، تووشی هەڵەو خلیسکان بوون‌و، لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و هاوەڵانی بەگشتیی‌و بەتایبەت چوارجێنشینە سەر ڕاستەکانی: (أبو بكرو عمر و عثمان و علي) و شوێنکەوتوانیان لە جیلی شوێنکەوتوان (تابعين)و ئەوانەی دواییان، دوورکەوتوونەوە.

ئنجا دێتە سەر خستنە ڕووی تایبەتمەندیی یەکەم لەو یازدە (١١) تایبەتمەندییانەی کە لەم بڕگە دە خاڵییەدا باسیان دەکات‌و، دەڵێ:

٦٨) (وَأَهْلُ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي النَّارِ لا يَخْلُدُونَ، إِذَا مَاتُوا وَهُمْ مُوَحِّدُونَ، وَإِنْ لَمْ يَكُونُوا تَائِبِينَ، بَعْدَ أَنْ لَقُوا اللهَ عَارِفِينَ، وَهُمْ فِي مَشِيئَتِهِ وَحُكْمِهِ إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ، وَعَفَا عَنْهُمْ بِفَضْلِهِ، كَمَا ذَكَرَ فِي كِتَابِهِ: ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ [النساء:٤٨، ١١٦]، وَإِنْ شَاءَ

عَذَّبَهُمْ فِي النَّارِ بِعَدْلِهِ، ثُمَّ يُخْرِجُهُمْ مِنْهَا بِرَحْمَتِهِ وَشَفَاعَةِ الشَّافِعِينَ مِنْ أَهْلِ طَاعَتِهِ، ثُمَّ يَبْعَثُهُمْ إِلَى جَنَّتِهِ، وَذَلِكَ بِأَنَّ اللهَ تَعَالَى تَوَلَّى أَهْلَ مَعْرِفَتِهِ، وَلَمْ يَجْعَلْهُمْ فِي الدَّارَيْنِ كَأَهْلِ نُكْرَتِهِ الَّذِينَ خَابُوا مِنْ هِدَايَتِهِ، وَلَمْ يَنَالُوا مِنْ وَلايَتِهِ، اللَّهُمَّ يَا وَلِيَّ الإِسْلامِ وَأَهْلِهِ ثَبِّتْنَا عَلَى الإِسْلامِ حَتَّى نَلْقَاكَ بِهِ ):

واتە: خاوەنی گوناهە گەورەکان لە ئوممەتی پێغەمبەر موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، لە ئاگری دۆزەخدا بە هەمیشەیی نامێننەوە، بە مەرجێك كاتێك دەمرن یەكتاپەرست بن.

وەك لە باسەكانی ڕابردوودا گوتمان: یەكتاپەرستیی (التوحيد) سێ بەشە:

یەكەم: خوا بەیەككگرتن لە بەدیهێنەرایەتییدا، خوا بە تاكە بەدیهێنەرو پەروەردگارو هەڵسوڕاوو مشورگێڕی بوونەوەر بزانین.

دووەم: خوا بەیەككگرتن لە پەرستراوێتییدا كە (بەس خوا) بە تاكە پەرستراوو بەندایەتیی بۆ كراو بزانین.

سێیەم: خوا بە یەككگرتن لە ناوو سیفەتەكانیدا، ئەو ناوو سیفەتانەی كە بۆ خوایان بڕیار دەدەین كەسی دیكەیان تێدا بەشدار نەكەین، دەڵێ: ئەوانەی دەمرن، با خاوەنی گوناهی گەورە گەورەش بن، مادام خاوەنی ئەو جۆرە تەوحیدە بن، هەڵبەتە وێڕای تەوحید، بڕواهێنان بە پێغەمبەرایەتی (موحەممەد)یش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەویش دیارە هەر پەیوەستی تەوحیدە، بۆیە كە لە هەندێ فەرموودەی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هاتووە: {«أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ»}حديث صحيح[1].

١) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢١).

واتە: فەرمانم پێکراوە کە جەنگ لەدژی خەڵك[١] بکەم، تاکو دەڵێن: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّٰهُ) ئەوە مەبەست ئەوە نیە، هەر بە گوتنی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ) مرۆڤ دەبێتە مسوڵمان، بەڵام (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ) دروشمو نیشانەی مسوڵمان بوونە، ئەگەرنا بەبێ (مُحَمَّد رَسُول اللّٰه) ئینسان نابێتە مسوڵمان، بابایەکی نەصرانیی، یان جوولەکەیەك، یان کەسێك کە ڕەنگە بڕوای بە هیچ دینێك نەبێ، بەڵام قەناعەتی بەبوونی خوا هەیە، زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی خوادەناسن، بەڵام ئەوەی کافرو مسوڵمان لەیەك جیادەکاتەوە، ئەوەیە کەمسوڵمان دەڵێ: بەڵێ، منیش خوادەناسم، بەڵام ئەو خوایەی دەیناسم، دەیپەرستمو، موحەممەدی (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ناردوە بە پێغەمبەرو دینو بەرنامەی پێدا ناردوە، ئنجا مـن موحەممەدیشم (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە پێغەمبەر قبووڵەو ئیسلامیشم بە دینو بەرنامە قبووڵە.

کەواتە: ئەوەی مسوڵمانو کافر لەیەك جیادەکاتەوە، مەسەلەی شوێن کەوتنی پێغەمبەرە (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و هەڵوێستە سەبارەت بە موحەممەد (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، نەك هەڵوێست سەبارەت بە خوا، وەك گوتمان: جوولەکەو نەصرانیەکانیش دەزانن خوا هەیە، دەزانن خوا پەروەردگارە، بەدیهێنەرە، ڕۆزییدەرە، مرێنەرە، ژیێنەرە، بەڵام ئەوەی مسوڵمان لە جوولەکەو نەصرانییەکان لە یەك جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە ئەوانیش دان بە پێغەمبەرانی دیکەدا دێنن، بە تایبەت پێغەمبەرانی خۆیان، بەڵام دان بەپێغەمبەرایەتیی موحەممەد (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دانانێن، هەر کەسێکیش بڕوای بە یەکێ لە پێغەمبەران نەبێ، وەك ئەوە وایە بڕوای بە هیچیان نەبێ، ، چونکە ئینسان لەسەر بناغەی موعجیزەو بەڵگە بڕوا بە پێغەمبەران دێنێ، ئەدی بۆچی بڕوا بە مووسا، یان عیسا دێنێ (عَلَيهِما السَّلام) لەبەر ئەوەی موعجیزەی هەیە، بەڵام بڕوا بە موحەممەدیش ناهێنێ کە موعجیزەی موحەممەد (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) گەورەترەو تەواوترەو پتەوترەو بەردەوام تریشە، لە هی مووساو عیسا (عَلَيهِما السَّلام).

---

١) واتە: خەڵکێك کە سەنگەر لە ئیسلامو مسوڵمانان دەگرنو دژایەتییان دەکەن.

مووساو عیسا بەهۆی قورئانەوە بۆمان دەردەکەوێ موعجیزەیان هەبووە، دەنا کتێبەکانی مێژوو زۆر جێگای متمانە نین، ئنجا بەمردنی مووساو عیسا (علیهما السلام) موعجیزەکانیشیان کۆتاییان پێهاتوە، بەڵام موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، چونکە پێغەمبەری هەموو مرۆڤایەتییە، بۆخۆی وەفاتی کردوە، بەڵام موعجیزەکەی هەر بەردەوامە. کەواتە: هەرکەس بڕوا بە یەکێ لە پێغەمبەرانی خوا نەهێنێ، وەك ئەوە وایە بڕوای بە هیچیان نەبێ، بەتایبەت گەورەو پێشەوایان موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، چونکە موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەڕاست دانەر (مصدق)ی هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی، بەڵکو ئێمە بەهۆی ئەوەوە پێغەمبەرانی پێشووش دەناسین، وە بەهۆی پەیامی ئەوەوە دەزانین کە خوای پەروەردگار پەیامی دیکەشی ناردوون، ئەگەرنا سەرچاوەیەکی متمانە پێکراوو بڕوا پێکراومان نیە، کە پێغەمبەرانمان پێ بناسێنێ.

کەواتە: لێرەدا نووسەر کە دەڵێ: (إذا ماتوا وهم موحدون) ئەوانەی خاوەنی گوناهی گەورە گەورەن لە ئوممەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، بۆ هەمیشە لە ئاگردا نامێننەوە، بەڵکو دوای سوتانیان بە قەدەر تاوانەکانیان ڕزگاریان دەبێ، بە مەرجێك کاتێك کە دەمرن خوا بەیەکگرو یەکتاپەرست (مُوَحِّد) بن، مەبەست ئەوە نیە، کە هەر بڕوایان بە (لا إلـه إلاّ الله) بێ، بەڵکو دەبێ بڕوایان بە (مُحَمَّد رَسُولُ الله)ش بێ، لە حەقیقەتیشدا یەکتاپەرستیی ڕاستەقینەو خوا بەیەکگرتنی ڕاستەقینە لە هەر سێ بوارەکەدا، تەنیا لە پەیامو بەرنامەی پێغەمبەرماندا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە تەواویی دێتە دی، چونکە تەماشا دەکەین جوولەکەکان، خوا بەیەکگر نین: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ ... ﴿٣٠﴾ ﴾التوبة، واتە: جوولەکەکان گوتیان: عوزەیر کوڕی خوایە، ئەوە کەی خوا بەیەکگرتنە؟ هەروەها نەصرانییەکانیش بەهەمان شێوە: ﴿ ...وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ... ﴿٣٠﴾ ﴾التوبة، واتە: نەصرانییەکان گوتیان: مەسیح کوڕی خوایە، ئەوە کەی خوا بەیەکگرتنە؟ هەروەها بتپەرستەکان چەندان بتیان لەگەڵ

خوادا دەپەرست، هەندێکیان دەیانگوت: مەلائیکــەتەکان کچـی خـوان، شـــەیتانەکان کوڕی خوان، ئەوە کەی خوا بەیەکگرتنو خواناسینە؟؟ بەڵێ، تەوحیدی ڕاستەقینە، تەنیا لە ڕێی موحەممەدەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەناسرێ، بۆیە هەر کەسێك بڕوای بەو نـەبێ، مانای وایە ئیمانی نیە.

دوایی دەڵێ: (وَإِنْ لَمْ يَكُونُوا تَـائِبِينَ) ئەوانە،کە خاوەنی گوناهی گـەورە گـەورەن، بـا تۆبەشیان نەکردبێ، بە مەرجێك خاوەنی تەوحیدی ڕاستەقینە بن، بۆ هەمیشە لە ئاگری دۆزەخ دا نامێننەوە (بَعْدَ أَنْ لَقُوا اللهَ عَارِفِينَ مُؤْمِنِين)، مادام گەیشتبنە خوا، بەخواناسیی ئیماندارانە.

نووسەری کتێب کە لێرەدا دەڵێ: (عارفين) مادام گەیشـتبنە خـوا بـە (عـارف)یـی، عـاریف، یانی: خواناس، ئـەو وشـەیە لێـرەدا بێهێـزە، وەك خـاوەنی کتـێبی {شـەرحی طەحاویی}[1] دەڵێ: ، چونکە نەصرانییەکیش (عارف)ە بەخواو، یەهودییەکیش (عارف)ە بەخوا، بگرە ئیبلیسیش خوا دەناسێو ئەبو جـەهلیش خـوای دەناسـی، بـەڵام مەسـەلە خواناسین نیە، مەسەلە ئیمان هەبوونە بە خوا، خواناسین و ئیمان پـێ هـەبوونیش، زۆر جیاوازن، خواناسین ئەوەیە، کە تۆ بزانی خوا هەیە، جا بە قسـەی دەکـەی یـان ناکـەی، گرنگ ئەوەیە، کە دەزانی خوا هەیـە، ئیبلـیس سـوێند دەخـوا دەڵـێ: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ ﴾ ص، بە عیززەتی تۆ قەسەم (ئەی خوایە)، من هەموویان گومڕا دەکەم، یانی: ئیبلیس خوای زۆر چاك دەناسی، چونکە وتووێـژی لەگـەڵ خـوادا کـردوەو سوێندی بە خوا خواردوە، بەڵام ئایا ئیبلیس بە بڕوادار (مُؤْمِن) لە قەڵەم دەدرێ؟ نەخێر، چونکە هەر مـەعریفەتی هەیە بەرانبەر بـە خـوا، بـەڵام ئـەدەبی نیـە بەرانبـەر بـەخوا، بەندایەتیی نیە بەرانبەر بە خوا، تەصدیقی نیە لە بەرانبەری خوادا، کەواتە هیچ!!، یـان خەڵکێکی عەوامو نەشارەزا، کاتێك پێی دەڵێی: ئیسلام ئاوایەو پێغەمبەر ئاواو قورئـان

١) إبن أبي العِزِّ الحنفي.

ئاوا، دەڵێ: منیش دەزانم !! خواو پێغەمبەرو قورئانو ئیسلام هەموویان هەقنو هەموویشی دەزانم، وا دەزانێ، ئەو زانینەی دەیكا بە بڕوادار (مُؤْمِن)، بەلاّم نەء، شەیتانیش لە منو تۆ زۆر چاكتر زانیویەتی، كە بەس خوا پەروەردگارو بەدیهێنەرە، بۆیە كاتێك ویستوویەتی شەڕ لەگەڵ وەچەی ئادەم دا بكات، داوای لەخوای بەرز كردوە: ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾الحجر، واتە: گوتی خوایە بمهێڵەوە، تا ڕۆژی دوایی. كەواتە: شەیتانیش دەزانێ كە ژیانو مردن بە دەست خوایە، بۆیە داوای مۆڵەتی ژیانی لە خوا كردوە، بەڵێ، شەیتان زۆر چاك خوای ناسیوە، بەلاّم ناسینەكە، چونكە گەردنكەچیی و بەندایەتیی لەگەڵدا نەبووە، هیچ نیە .

كەواتە: ئەو خەڵكە كە دەڵێ: ئیسلام هەقە، مادام پابەندیی پێوەی نیە، زانینی بەبێ توانین، هیچ نیە، زانین كە نەبێتە حاڵو كردەوە لە ئینساندا هیچ نیە. كەواتە: لێرەدا دەبوو گوتبای: (بَعْدَ أَنْ لَقُوا اللهَ عَارِفِينَ، مُؤْمِنِينَ) ئەو ڕستەیە جوانتر بوو بە پێزو بەهێزتریش بوو، ئەوانەی كە بە ئیمانەوە دەگەنە خوای بێ هاوەڵ، با گوناهیشیان هەبێو، با پەشێمانیش نەبووبنەوە، مادام ئەسڵی ئیمانیان تێدا هەبێ، لە دۆزەخدا هەمیشەیی نابن، (وَهُمْ فِي مَشِيئَتِهِ وَحُكْمِهِ) خاوەنی گوناهە گەورەكان لە ژێر ڕكێفو ویستو بڕیاری خوادان (إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ، وَعَفَا عَنْهُمْ بِفَضْلِهِ)، ئەگەر ویستی لێیان دەبووریو چاوپۆشییان لێ دەكات، لە ڕووی چاكەو بەخششی خۆیەوە (كَمَا ذَكَرَ فِي كِتَابِهِ) وەك خوای خاوەن پایەو بارەگای بەرز لە كتێبی خۆیدا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ... ﴿٤٨﴾ ﴾النساء، واتە: خوا لەوە نابوورێ هاوبەشی بۆ بڕیار بدرێ، بەلاّم غەیری ئەوە، هەرچی بیەوێ دەبوورێ، ئەگەر كەسێك تۆبەشی نەكردبێ، لەوانەیە خوای لێبوردە عەفووی بكات، ئەگەر خوا ویستی، بەلوتفو بەخششی خۆی دەیانبەخشێ، (وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ فِي النَّارِ بِعَدْلِهِ)، ئەگەر ویستیشی، بەدادگەری خۆی لە ئاگری دۆزەخ ئازاریان دەدا (ثُمَّ يُخْرِجُهُمْ مِنْهَا بِرَحْمَتِهِ وَشَفَاعَةِ الشَّافِعِينَ مِنْ أَهْلِ طَاعَتِهِ)،

دوای ئەوە كەبە دادگەریی خۆی، ئەوانەی خاوەنی گوناهە گەورەكانن، لە ئوممەتی پێغەمبەر(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەمەرجێك ئیمانیان بووبێ‌و ئیمانەكەیان هەڵنەوەشاندبێتەوەو، شتێكیان نەكردبێ شایەتمانەكەیان هەڵوەشاندبێتەوە، دوای ئەوەی كە لە ئاگری دۆزەخدا دەیانسووتێنێ، بەقەدەرگوناهەكانیان، دوایی دەریان دەهێنێ بۆ ڕەحمەت‌و بەزەیی خۆی، بە هۆی تكای تكاكارانەوە لەوانەی فەرمانبەریی خوا دەكەن، كە گەورەو پێشەوای تكاكاران موحەممەدە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ئنجا وەكو لە هەندێ فەرمووداندا هاتووە، شەهیدان‌و دۆستانی خواو زانایان، هەركەسەو بە قەدەر قسە ڕۆیشتنی لەلای خوای پەروەردگار شەفاعەت دەكەن، (ثُمَّ يَبْعَثُهُمْ إِلَى جَنَّتِهِ) پاشان ئەو گوناهبارانە كە لە دۆزەخدا سووتێنراون‌و ئەشكەنجە دراون، بەڵام خوا بە ڕەحمەتی خۆی بەهۆی تكای تكاكارانەوە ڕزگاری كردوون، دەیانهێنێ بۆ بەهەشتی خۆی، (وَذَلِكَ بِأَنَّ اللهَ تَعَالَى تَوَلَّى أَهْلَ مَعْرِفَتِهِ وَلَمْ يَجْعَلْهُمْ فِي الدَّارَيْنِ كَأَهْلِ نُكْرَتِهِ) دەڵێ: ئەوەش لەبەر ئەوەی خوای بەرز سەرپەرشتیی‌و دۆستایەتیی ئەوانە دەكات كە دەیناسن (ناسینێك كەوا لەخاوەنەكەی دەكات، بەندایەتیی بۆ خوا بكات) نە لە دنیاو نە لە دوارۆژدا، وەك ئەوانەی سەیر نەكردوون، كە نایناسن‌و ئینكاریی لێدەكەن، (الَّذِينَ خَابُوا مِنْ هِدَايَتِهِ، وَلَمْ يَنَالُوا مِنْ وَلايَتِهِ)، ئەوانەی كە ڕەنج بە خەسار بوون لە هیدایەتی خواو،دەست بە تاڵ‌و بێبەش بوون لە لێبوردنی خوا.

به كورتیی: خوا (عز وجل) ئەوانەی كە دەیناسن و پێی ئاشنان، ئاشنایەتیی‌و ناسینێكی تایبەتی كە پێی دەگوترێ: ئیمان، وەك ئەوانەی تەماشا نەكردون كە بێبەشن لە هیدایەت‌و دۆستایەتیی خوا.

ئنجا نووسەری كتێبەكە لە كۆتایی ئەم خاڵەدا، ئەم دوعایە دەكات: (اللَّهُمَّ يَا وَلِيَّ الإِسْلامِ وَأَهْلِهِ) خوایە! ئەی دۆست‌و سەرپەرشتی ئیسلام‌و ئەهلی ئیسلام، (ثَبِّتْنَا عَلَى الإِسْلامِ حَتَّى نَلْقَاكَ بِهِ)، پێیەكانمان بچەسپێنە لەسەر ئیسلامەتیی، تاوەكو بە ئیسلامەوە دێینەوە خزمەت تۆو بە دیدارت شاد دەبین، ئێمەش دەڵێین: ئامین.

# نوێـژ لەپشـت كردن و نوێژی جەنازە لەسـەر كردنی تێكڕای مـسـولـمـانـان

ئنجا باسی تایبەتمەندییەكی فیقهی بواری عیبادەت دەكات، كە بریتیە لە نوێژ لەپشت كردنو نوێژی جەنازە لەسەركردنی سەرجەم مسوڵمانانو، دەڵێ:

٦٩) ( وَنَرَى الصَّلاةَ خَلْفَ كُلِّ بَرٍّ وَفَاجِرٍ مِنْ أَهْلِ الْقِبْلَةِ، وعَلَى مَـنْ مَـاتَ مِـنْـهُـمْ ):

كە ئەوەش یەكێكی دیكەیە لەو شتانەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، وەك بنچینەیەك لە بنچینەكانی دینداریی، لەسەری ڕێك كەوتوون و كۆكن.

واتە: پێمان وایە دروستە نوێژ بكرێ لە دوای هەر كەسێكی باشو خـراپ لـە ئـەهلی قیبلە، هەروەها پێمان وایە دروستە نوێژ (ی جەنازە)یان لەسەر بكرێ بەگشتیی.

سەبارەت بەو خاڵە، پێویستە ئەو ڕوونكردنەوە بخرێتە ڕوو:

وا پێدەچێ (طەحاویی) ئەو وتەیەی لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وەرگرتبـی، كـە دەفـەرموێ: {يُصَلُّونَ لَكُمْ، فَإِنْ أَصَابُوا فَلَكُمْ، وَإِنْ أَخْطَأُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ} حديث صحيح[1].

واتە: (پێشەواو حوكمڕانەكانی ئێوە) نوێژتان بۆ دەكەن، ئنجا ئەگەر پێكایان، (واتـە نوێژەكەیان بەو شێوەیە كرد كە شەرع فەرموویەتیو خواو پێغەمبەر پێیان خۆشە) ئـەوە قازانجی ئێوەشەو قازانجی خۆشیانە، وە ئەگەر هەڵەیان كرد، (واتە: نوێژەكەیان بە شێوەیەك

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٦٤٨)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٦٦٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، شرح: (يصلون لكم) أي: الأمراء والولاة، (فلكم وعليهم) أي: فلكم ثواب الصلاة وعليهم عقاب ما أخطؤوا.

كرد كە هەڵە بوو) ئێوە نوێژی خۆتان هەر تەواوو دروستە، بەڵام ئەوان نوێژەكەیان ناتەواوە. (یان ئێوە پاداشتتان هەیەو، ئەوانیش گوناهبارن).

شایانی باسیشە زۆربەی زانایان لەبارەی نوێژكردن لەپشت ئەوانەوە كە پێش نوێژیی دەكەن لە بەرپرسانو غەیری وانیش، لەسەر چەند شتێك ڕێك كەوتوون:

١- دەڵێن: لەدوای هەر كەسێكەوە كە بزانی گوناهبار (فاسق) نیەو، بیدعەت چیی (مبتدع) نیە، بە ئیتیفاقی هەموو زانایانی پێشینو دواییین (سَلَف و خَلَف)، دەبێ نوێژ بكرێ.

٢- هەر كەسێك فاسق، یان موبتەدیع بێ، ئنجا بیدعەتی عیبادەتیی، یان بیدعەتی عەقیدەیی، نوێژی لە دوا ناكرێ، بە مەرجێك بزانی ئەو نوێژ لەپشت نەكردنە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی وی لەو فیسقو بیدعەتو تاوانەی، ئەوەش دیسان زانایان لەسەری كۆكن، چونكە دەڵێن: ئەوە جۆرێكە لە فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپە، با ئەو كابرایە حاكمو دەسەڵاتداریش بێ.

٣- هەر كاتێك پێشەواو حوكمڕانی مسوڵمانان كە مسوڵمانان هەڵیانبژاردوە بە بەرپرسو حوكمڕانی خۆیان، لەسەر ئاستێكی بەرز، یان لەسەر ئاستێكی نزم، واتە: حوكمڕانی گشتیی بێ، یان بەرپرسێكی گچكەبێ، هەركاتێك نەفەرێكی دیاریی كرد بۆ پێش نوێژیی، دەبێ نوێژی لە دوا بكرێ، با ئەو ئینسانە ئەهلی فیسقو بیدعەتیش بێ، چونكە ئەگەر نوێژی لە دوا نەكرا، تۆ لە دوات نەكردو ئەو لە دوای نەكرد،وردە وردە ڕیزی مسوڵمانان تێكدەچێ،، چونكە نوێژ لە دوا كردنەكە باش نیەو ناپەسند (مكروه)ە، بەڵام ئەوە زیانەكەی زۆر كەمترە لەوەی لە ئەنجامی نوێژ لەدوانەكردنیدا، مسوڵمانان ببنە چەند بەشێك، ئنجا بوخاریی بۆی گێڕاوینەتەوە كە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرو ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێیان ڕازی بێ)، نوێژیان لە دوای حەججاجی كوڕی یوسوفی سەقەفییەوە كردوە، لەگەڵ ئەوەشدا كە حوكمڕانێكی زۆر فاسقو زاڵمو غەددار بووە، بەڵام ئەوەش دەبێ بگوترێ: كە ئەگەر گونجا مرۆڤ نوێژ لەدوای كەسێكی فاسقو ستەمكارو ئەهلی بیدعەت نەكات، وا باشترە كە لەدوای نەكات، بەمەرجێك نوێژی جەماعەت و هەروەها جومعەكەی نەچێت. واتە: ئەگەر لەو شوێنەدا بۆت گونجا

نوێژ لە پشتی کەسێکی واوە نەکەی، ئەگەر کەسێکی لەو چاکتر هەبێ، وابکە، بەڵام بە مەرجێك کە بە هۆی نوێژ لە دوا نەکردنەکەتەوە نوێژی جەماعەتو جومعەکەت نەچێ، بەڵام ئەگەر هەر ئەوکەسە خراپە هەبوو، دەبێ جومعەکەت نەچێ.

٤- ئەگەر نوێژت لە دوای ئیمامێکەوە کرد، بەڵام بە ئیعتیقادو بۆچوونی تۆ ئەو ئیمامە شتێکی هەیە، کە نوێژەکەی دروست نیە، ئایا لەو حاڵەتەدا دروستە نوێژی لەدوا بکەی یان نا؟ بۆ وێنە: لە مەزهەبی ئەبو حەنیفەدا بە خوێن لێهاتن دەست نوێژ بە تاڵ دەبێتەوە، ئنجا ئایا ئەگەر کابرایەکی حەنەفیی مەزهەب نوێژی لە دوای ئیمامێکی شافیعیی مەزهەب کرد، کە ئەو ئیمامە خوێنی لێهاتوە لە لای مەزهەبی شافیعیش بە خوێن لێهاتن دەست نوێژ هەڵناوەشێتەوە، ئیدی ئیمامەکە خوێنی لێهاتو نوێژیش دەکات، ئایا کابرای حەنەفیی مەزهەب بۆی دروستە ئیقتیدای پێ بکات؟ ئەوەش زۆرێك زانایان لەسەری یەکدەنگن کە بەڵێ، هەرچەندە بەشێکیشیان ڕایان جیاوازەو دەڵێن: هەر کاتێك مەئموم زانی ئیمامەکەی دەست نوێژەکەی هەڵوەشاوەتەوە، بۆی نیە ئیقتیدای پێ بکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە بەهێزترە کە (مالیك) گوتوویەتی: بەڵێ، دەبێ نوێژی لەدوا بکات، ئیستیدلالیش بەو فەرموودەیەی سەرەوە دەکات کە گوتمان: { يُصَلُّونَ لَكُمْ، فَإِنْ أَصَابُوا فَلَكُمْ، وَإِنْ أَخْطَأُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ }حديث صحيح[1].

کەواتە: مادام ئەو حەدیسە صەحیحەمان هەیە، ئیمام با نوێژەکەی بە بۆچوونی تۆ بەتاڵ بێ، بەڵام تۆ نوێژەکەت تەواوەو ئەویش هی خۆی لەسەر خۆی.

لەوبارەشەوە ئەم بەسەرهاتەمان هەیە: (أبو يوسف) کە قوتابی (أبو حنيفة) بوو لەگەڵ (هارون الرشيد)دا حەجی کرد (ڕەحمەتی خوایان لێبێ)، ئنجا (هارون الرشيد) کەڵەشاخ (حِجامة)ی لە خۆی گرت و بەبێ ئەوەی دەستنوێژ نوێ بکاتەوە بوو بە ئیمام، (أبو يوسف)یش کە لەسەر مەزهەبی (أبو حنيفة)یە ئیقتیدای پێ کرد، لێیان پرسی: چۆن

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٦٤٨)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٦٦٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، شرح: (يصلون لكم) أي: الأمراء والولاة، (فلكم وعليهم) أي: فلكم ثواب الصلاة وعليهم عقاب ما أخطؤوا.

نوێژت لە دوا كرد كە بە ڕای تۆ دەست نوێژەكەی بە تاڵ بۆتەوە؟ گوتی: نەخێر، مادام پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وای فەرمووەو یەكڕیزیی مسوڵمانان وا دەپارێزرێ، چاكترە نوێژەكە بكرێ‌و چاوپۆشیی لەو مەسەلەیە دەكەم.

## حوكمی كوفرو شیرك و نیفاق بەسەر مسوڵمانان دانەدان بەبێ بەڵگەی ڕوون و ئاشكرا

ئنجا نووسەر دێتە سەر تایبەتمەندیی سێیەم لەم بڕگەیەدا، كە مەسەلەیەكی زۆر گرنگ‌و هەستیارەو، پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بەلایەنی عەقیدەیی‌و فیكرییەوە هەیەو دەرهاوێشتەی گرینگ‌و گەورەی هەن لە ژیانی كۆمەلایەتیی‌و سیاسیی مسوڵماناندا، ئەویش مەسەلەی هەڵسەنگاندنی خەڵكی مسوڵمانە، لەڕووی ئیمان‌و ئیسلام‌و كوفرو شیرك‌و نیفاقەوەو، دەڵێ:

> ٧٠) ( وَلا نُنَزِّلُ أَحَداً مِنْهُمْ جَنَّةً وَلا نَارًا، وَلا نَشْهَدُ عَلَيْهِمْ بِكُفْرٍ وَلا بِشِرْكٍ وَلا بِنِفَاقٍ، مَا لَمْ يَظْهَرْ مِنْهُمْ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ، وَنَذَرُ سَرَائِرَهُمْ إِلَى اللهِ تَعَالَى ):

واتە: ئێمە هیچ كام لە ئوممەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بڕیاری یەكجارەكیی بۆ نادەین كە لەبەهەشتییە، یان لە دۆزەخدایە، ناڵێین: فلان كەس تازە حەساوەتەوەو ئەوە لە بەهەشتە، هەروەها ناڵێین: با فلان كەس دەست لە خۆی بشوات، تازە هەر دۆزەخییە، شتی وا ناڵێین، لە فەرموودەی پێغەمبەردا هەیە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: لە نێو گەلی ئیسرائیل لە پێش ئێوەدا دوو برا هەبوون، یەكێكیان زۆر مسوڵمان و چاكەكار، ئەوی دیكەیان زۆر تاوانبارو خراپەكار، ئەوەی چاك بوو، هەرچەندە ئامۆژگاریی خراپەكەی دەكرد، نەدەگەڕایەوە، ڕۆژێك زۆر ڕقی لێ هەڵسا، سوێندی خوارد گوتی: تۆ چاوت بەبەهەشتی خوا ناكەوێ، كابرای گوناهبار گریاو گوتی: تۆ چووزانی! پاشان: هەردووكیان

مردن، خوای پەروەردگار کاتێك لێی پرسینەوە، بە گوناهبارەکەی فەرموو: چونکە تۆ لە ڕەحمی من ڕەشبین نەبووی‌و، منت دەناسی‌و پێت وابوو ڕەحمەتی من هەموو شتێك دەگرێتەوە، بڕۆ تۆم عەفوو کرد، ئەوەی دیکەشی هێنا پێی فەرموو: تۆ وەکیلی من بووی لەسەر زەوی، تا بەندەکانی من لە ڕەحمەتی من نائومێد بکەی؟ تۆ بڕۆ بۆ دۆزەخ، مادام بەوەندە عیبادەتەی خۆت لەخۆت بایی بووی[1]!

کەواتە: ئێمە نە کاتێك چاکەو تاعەتی کەسێکمان بینی، دەڵێین: بەهەشتییە، نە،کەخراپەو تاوانمان لە کەسێ دیت، دەڵێین: دۆزەخییە، بەڵکو وەك نووسەری کتێب لە خالّی پەنجاو نۆیەمین دا گوتی: ئومێدەوارین بۆ بڕوادارانی چاکەکار، خوای پەروەردگار لێیان خۆشبێ‌و بیانباتە بەهەشتێ، بۆ خراپەکارانیش داوای لێبووردنیان بۆ لە خوا دەکەین‌و ترسیشمان لێیان هەیە، بەلّام نائومێدیان ناکەین لەڕەحمەتی خوا، ئەوە عادەتی مسولّمانە، (وَلا نَشْهَدُ عَلَيْهِمْ بِكُفْرٍ وَلا بِشِرْكٍ وَلا بِنِفَاقٍ)، هەروەها شاهێدییان لەسەر نادەین، بەوەی کە فلاّن کەس کافرە، یان فلاّن کەس موشریکە، یان فلاّن کەس مونافیقە، نەك هەر ئەوە نالّێین، بەڵکو ناشلّێین: فلاّن کەس کوفری تێدایە، یان شیرکی تێدایە، کە ئەو دوو قسانەش جیاوازییان هەیەو دوایی ڕوونی دەکەینەوە، (مَا لَمْ يَظْهَرْ مِنْهُمْ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ) مادام هیچ کام لە شیرك‌و کوفرو نیفاقیان لێ وەدەر نەکەوێ، ئێمە شاهێدییان لەسەر نادەین، (وَنَذَرُ سَرَائِرَهُمْ إِلَى اللهِ تَعَالَى) نهێنیی‌و پەنهانەکانیان حەوالّەی خوا دەکەین، وەك زانایانی ئیسلام لەوبارەوە گوتوویانە: (نَحْنُ نَحْكُمُ بالظَاهِرِ وَاللهُ يَتَوَلّى السَّرَائِر) واتە: ئێمە لەسەر ڕوالّەت بڕیار دەدەین‌و، نهێنییەکانیش هەر لەلای خوان. بەس خوا نهێنی خەڵکی دەزانێ‌و دەروونی خەڵکی دەزانێ، کەسی وا هەیە ڕوالّەتێکی چاك پێشان دەدات، بەلّام دەروونێکی وێرانی هەیە، هەیە ڕوالّەتێکی خراپی هەیە، بەلّام ڕەنگە لەلای خوا عوزرێکی بەدەستەوە هەبێ، بە هەرحالّ حوکم بەسەر خەڵکدا نادەین،

١) أخرجه أحمد: (٣٢٣/٢و ٣٦٣)، وأبو داود: ٤٩٠١ عن أبي هريرة، وإسناده حسن كما قال شعيب الأرنؤوط.

بڕوانە: صحيح إبن حبان بترتيب ابن بَلْبان، ج١٣ ص٢٠، ٢١، رقم: ٥٧١٢.

حوکمی پەنهانیی، بەڵام دەڵێین: فلان شتە گوناهەو فلان شتە چاکە، (مَا لَمْ يَظْـهَرْ مِنْهُمْ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ) هەتا شـتێکیان لەو بارەوە لێدەرنەکەوێ، هەرکاتێك کوفر، یاخود شیرك، یاخود نیفاقمان لە کەسـێك بینی، دەڵێین: ئەوە کوفرە، یان شیرکە، یـان نیفاقـە، بـەڵام ئەمە جیایە لە کافرو موشریكو مونافیق بوون، کە گـەلێك مسـوڵمان فـەرقی ئـەو دوو تەعبیرانە ناکەن، بۆ وێنــە:

١)- سوێند خواردن بە غـەیری خوا، کوفرەو شیرکە: وەك لەم دەقەدا هاتوە: {عَنِ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: «مَنْ حَلَفَ بِغَيْـرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ»}حديث صحيح[1]. واتە: هەرکەسـێك سـوێند بـە غـەیری خـوا بخوات، ئەوە کوفری کردوە، یان شیرکی کردوە.

٢)- شین گێڕانو تانەو تەشەر لە نەسەب دان، دوو سیفەتی کـافرانن: {عَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): «اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِى النَّسَبِ وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ»}حديث صحيح[2]. واتە: دوو ڕەفتار خەڵك بەهۆیانەوە تووشی کوفر دەبن: تانەدان لە ڕەچەڵەكو شین گێڕان لەسەر مردوو.

٣)- نوێژ نەکردن کوفرە: وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە: {عَـنْ بُرَيْـدَةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: «الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ الصَّلاَةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ»}حديث صـحيح[3] واتە: ئەو پەیمانەی کە لـەنێوان ئێمـەو کافرانـدا هەیـە نوێـژە، هەرکەسێك نوێژی نەکرد، ئەوە کوفری کردوە. کوفر هەبوون لە ئینساندا مانـای وایـە سیفەتێکی کافرانی تێدایە.

---

١ أخرجه الترمذي برقم: (١٥٣٥) هذا حديث حسن، قال الشيخ الألباني: صحيح.

٢ أخرجه أحمد برقم: (١٠٤٣٨)، ومسلم برقم: (٦٧)

٣) أخرجه أحمد برقم: (٢٢٩٨٧)، والترمذي برقم: (٢٦٢١)، وقال: حسـن صـحيح غريـب، والنسـائي بـرقم: (٤٦٣)، وابن ماجه برقم: (١٠٧٩)، وابن حبان برقم: (١٤٥٤)، والحاكم برقم: (١١)، وقال: صحيح الإسناد قال الشيخ الألباني: صحيح.

ئەو سیفەتانەی لە فەرموودەکانی سەرەوەدا هاتوون، کە فەرموودەی دیکەشمان هەن لەو بابەتە، ئەوە دەگەیەنن کە ئەو سیفەتانەی لە فەرموودەکان دا هاتوون، سیفەتی کافرانن، بەڵام مەرج نیە هەر کەسێك سیفەتێکی کافرانی تێدا بێت، کافر بێ، یان سیفەتێکی موشریکان، یان هی مونافیقان، بەهەمان شێوە، جاری واهەیە کەسێك دە (١٠) سیفەتی کافرانی تێدان، بەڵام ئەصلی ئیمانەکەی هەر پارێزراوە، بۆ وێنە: ئەو بینایەی کە ئێمە لێی دانیشتووین دەگونجێ پەنجا گوللەی (ئار پی جی) لێبدرێ، بەڵام هەر ڕواڵەتو دیمەنی خانووی پێوە بمێنێ، کونو کەلەبەری دەبن، بەڵام بینایەکە هەر ماوە، بەڵام کافر بوونو موشریك بوونو مونافیق بوون، وەك ئەوە وایە، ئەو بینایە بێنی (دینامێت)ێکی تێدا بتەقێنیەوە، ئەسڵو فەسڵی بەسەر یەکدا نەهێڵێ، ئەوە وەك کافرو موشریكو مونافیق بوونی مسوڵمانە! کەواتە: دەبێ زۆر لەوە وریا بین، ، چونکە تۆمەتی کافرو موشریك و مونافیق بوون، بەسەر خەڵکیدادان زۆر قورسە.

## پاراستنی خوێن و گیانی مسوڵمانان

ئنجا دێتە سەر باسی چوارەمین تایبەتمەندیی لە یازدە (١١) تایبەتمەندییە جۆراو جۆرەکانی، کە نووسەر لەم بڕگەیەدا بۆ ئەهلی سوننەتو جەماعەتی خستوونە ڕوو، کە بریتیە لەوەی دەبێ خوێنو نەفسی مسوڵمانان، سەلامەتو پارێزراو بێ، مەگەر بەبەڵگەی شەرعیی ڕوونو بێ چەندو چوونو، دەڵێ:

> ٧١) ( وَلا نَرَى السَّيْفَ عَلَى أَحَدٍ مِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ، إِلاَّ مَنْ وَجَبَ عَلَيْهِ السَّيْفُ ):

واتە: ئێمە پێمان وایە دروست نیە شمشێر (واتە: چەك) بەکاربهێنرێ بەرانبەر بە هیچ کام لە ئوممەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، مەگەر کەسێك کە بەکارهێنانی چەکی

بەرانبەر پێویست بووە. لەو بارەوەش فەرموودەی ڕاست هاتوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: {«لاَ يَحِلُّ دَمُ رَجُلٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَلاَثٍ: النَّفْسُ بِالنَّفْسِ، وَالثَّيِّبُ الزَّانِي، وَالتَّارِكُ لِدِينِهِ الْمُفَارِقُ لِلْجَمَاعَةِ»} حديث صحيح.[1]

واتە: خوێنی هیچ پیاوێك كە شایەدیی دەدات، كە: جگە لەخوا هیچ پەرستراونین، وە كە من پێغەمبەری خوام، حەلاڵ نیە، تەنیا بە یەكێك لە سێ شتان نەبێ: كەسێك كەسێك دەكوژێ بە ناهەق، ئەوەش تۆڵەی لەسەرە، (مەگەر خاوەن خوێنەكە عەفووی بكات، یان خوێنەكەی وەربگرن) كەسێك ژنی هەیەو زینا دەكات، (یان ئافرەتێك مێردی هەیەو زینا دەكات)، وە ئەو كەسەی كە دینی خۆی واز لێ دەهێنێ و لەكۆمەڵی مسوڵمانان دەچێتە دەرەوە.

كەواتە: تەنیا بەیەكێك لەو سێ شتە، خوێنی مسوڵمان حەلاڵ دەبێ، ئەگەرنا دروست نیە مسوڵمان لە بەرانبەر مسوڵماندا چەك بەكاربهێنێ.

هەڵبەتە حاڵەتی دیكەش هەن، بۆ نموونە: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: {مَنْ قُتِلَ دُونَ مَظْلَمَتِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ} حديث صحيح.[2]

واتە: هەر كەسێك لەسەر ستەملێكراویی خۆی بكوژرێ، شەهیدە، ئەو كەسەی كە زوڵمت لێدەكات، با مسوڵمانیش بێ، ئەگەر زوڵمی لێكردی و دەستبەرداری زوڵمەكەی نەبوو، بۆت هەیە بیكوژی، دیارە بەمەرجی خۆیەوەو لە هەڵو مەرجی خۆیدا، كە ئەوەش شەرعزانان بە درێژیی باسیان كردوە.

١) أخرجه أحمد برقم: (٣٦٢١)، والبخاري برقم: (٦٤٨٤)، ومسلم برقم: (١٦٧٦)، وأبو داود برقم: (٤٣٥٢)، والترمذي برقم: (١٤٠٢) وقال: حسن صحيح، والنسائي برقم: (٤٠١٦)، وابن ماجه برقم: (٢٥٣٤).

٢) أخرجه النسائي برقم: (٤٠٩٣) قال الشيخ الألباني: صحيح.

## چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ حوکمڕان و کاربەدەستانی ستەمکاردا

لەم خاڵی حەفتاو دووەم (٧٢)ەدا، نووسەر باسی پێنجەمین تایبەتمەندیی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست (أهل السنّة وَالجَماعة) دەکات کە مەسەلەیەکی زۆر گرنگو دژوارە لەبواری سیاسەتی شەرعییدا، ئەویش بریتیە لە چۆنییەتی مامەڵەکردنی کۆمەڵگای مسوڵمان، لەگەڵ حوکمڕانو کاربەدەستانیدا بەگشتییو بەتایبەت، لە کاتێکدا لارو ستەمکار دەبن.

دیارە نووسەر ڕاو بۆچوونێك لەو بارەوە باس دەکات، کە مشتو مڕی زۆر هەڵدەگرێ، منیش سەرنجو تێبینیم لەسەری هەیەو، ناشتوانم ئەوەی بە پێویستی دەزانم لێرەدا بیلێم، بۆیە بە پێویستی دەزانم سەرنجی خوێنەری بەڕێز بۆ دوو لە کتێبەکانم ڕابکێشم، کە لەو بارەوە تا ڕاددەیەکی باش لێکۆڵینەوەم تێدا کردوون، ئەوانیش:

١/ (الإِسلام كَما يَتَجلّى في كِتابِ الله) بەرگی (٧).

٢/ (ئیسلامو دەوڵەتداریی) بەرگی (٢).

هەرچەندە لە کۆتایی ئەم باسەش دا بە کورتییو گوشراویی قسەیەك لەو بارەوە دەکەم.

نووسەر دەڵێ:

> ٧٢) ( وَلا نَرَى الْخُرُوجَ عَلَى أَئِمَّتِنا وَوُلاةِ أُمُورِنَا وَإِنْ جَارُوا، وَلا نَدْعُو عَلَيْهِمْ، وَلا نَنْزِعُ يَدًا مِنْ طَاعَتِهِمْ، وَنَرَى طَاعَتَهُمْ مِنْ طَاعَةِ اللهِ فَرِيضَةً، مَا لَمْ يَأْمُرُوا بِمَعْصِيَةٍ، وَنَدْعُو لَهُمْ بِالصَّلاحِ وَالْمُعَافَاةِ ):

واتە: پێمان وایە دروست نیە، کە یاخیبوونو دەرچوون هەبێ لە فەرمانبەرییو گوێڕایەڵیی حوکمڕانانو کاربەدەستانمان، هەرچەندە زوڵمو ستەمیش بکەن، وەتووکو دوعای خراپیش لە حوکمڕانو کاربەدەستەکانمان ناکەینو، دەستیش ناگێڕینەوە لە

فەرمانبەریی‌و گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانەکانیان، وە پێشمان وایە کە بە قسەکردنیان‌و فەرمانبەریی بۆ کردنیان فەرزەو فەرمانبەریی کردنە بۆ فەرمانی خوا (جل جلاله)، مادام فەرمان کردن نەبێ بە سەرپێچیی، وە بۆشیان دەپاڕێینەوە کە خوا چاکیان بکاو ساغ‌و سەلامەتیان بکات‌و زیاتر هیدایەتیان بدات.

زانایانی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت، پێشەوایانی ئێمە زۆر دووربین‌و لێزان بوون، قسەیەك هەیە دەڵێ: (حُكْم غَشوم خَيْر مِن فِتْنَةٍ تَدوُم) حوکمڕانییەکی زاڵمانە، چاکترە لە گێچەڵ‌و ئاشووبێك، کە هەر بەردەوام بێ.

ئەوان لەسەر ئەو بناغەیە گوتوویانە: هەر کاتێك پێشەواو حوکمڕانێك خراپەیەکی کرد، خەڵك بڵێن: دەی وەرن، با شۆڕش بکەین‌و لێی ڕاپەڕین، ئەوە هەرگیز بارودۆخیان ئارام نابێ، چونکە ئینسان مەعصووم نیە، هەموو کەسیش خولەفای ڕاشیدین نیە، بەرپرس شتێکی هەردەبێ، کە هەڵەو بێ کەم‌و کوڕییەك هەر دەبێ، مەگەر حوکمڕان لە ئاستێکی زۆر بەرزی تەقواو خواناسیی‌و ئەخلاقی بەرزو عیبادەت دابێ، دەنا ستەم‌و لادانێکی هەر دەبێ، جا هەر کاتێك حوکمڕانێکی مسوڵمانان، هەڵەیەکی کردو مسوڵمانان بێن لێی ڕاپەڕن، قەت حوکمی ئیسلامی سەقامگیر نابێ، لەبەرئەوە گوتوویانە: دروست نیە یاخی بین‌و لە فەرمانبەریی دەسەڵاتدارانمان دەربچین، با زوڵم‌و ستەمیش بکەن‌و دروست نیە دوعای خراپیشیان لێ بکەین‌و، دەست لە بەیعەت‌و پەیمانیان بکێشینەوە،بە قسەکردنیشیان فەرزە لەو شتانەدا کە چاکەیە، بەڵام ئەگەر فەرمانیان بە خراپە کرد، بە قسەیان ناکرێ، دەبێ دوعای خێرو چاکەو هیدایەتیشیان بۆ بکەین.

ئەم بنەمایەی (طەحاویی) بە ناوی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتەوە دەیڵێ، لە چەندان فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وەردەگیرێ، بۆ وێنە:

<u>فەرموودەی یەکەم:</u> پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرمووێ: {مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصى اللهَ، وَمَنْ أَطَاعَ أَمِيرِي فَقَد أَطَاعِنِي، وَمَنْ عَصى أَمِيرِي

فَقَدْ عَصَانِي} حديث صحيح.[١]

واتە: هەر کەسێك بە قسەی من بکات، بە قسەی خوای کردوە، وە هەر کەسێك لە فەرمانی من دەرچێ، لە فەرمانی خوا دەرچووە، وە هەر کەسێك بە قسەی ئەمیرێك بکات کە من دامناوە، ئەوە بە قسەی منی کردوە، وە هەر کەسێك لە قسەی ئەمیرێك دەربچێ، کە من دامناوە، ئەوە لە قسەی من دەرچووە.

فەرموودەی دووەم: {السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ} حديث صحيح.[٢]

واتە: لەسەر مسوڵمان پێویستە فەرمانبەریی (سەرووی خۆی بکات) لەو شتەدا کە پێی خۆشەو لەوەشدا کە پێی ناخۆشە، مەگەر فەرمانی پێ بکرێ بە گوناهو سەرپێچیی خوا، ئەگەر فەرمانی پێکرا بە سەرپێچی، ئەوە نە دەبێ گوێ بگرێ، نەدەبێ فەرمانبەریی بکات.

فەرموودەی سێیەم: {مَنْ رَأَى مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا يَكْرَهُهُ، فَلْيَصْبِرْ، فَإِنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ يُفَارِقُ الْجَمَاعَةَ شِبْرًا، فَيَمُوتُ إِلا مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً} حديث صحيح.[٣]

واتە: هەر کەسێك لە بەرپرسو ئەمیری خۆی شتێکی دی، پێی ناخۆش بوو، با ئارام بگرێ، چونکە هەر کەسێك بستێك لە کۆمەڵی مسوڵمانان دوور بکەوێتەوەو بمرێ، ئەوە بە مردنێکی (سەردەمی) نەفامێتیی دەمرێ.

١) أخرجه أحمد برقم: (٧٤٢٨)، والبخاري برقم: (٢٧٩٧)، ومسلم برقم: (١٨٣٥)، والنسائي برقم: (٤١٩٣)، وابن ماجه برقم: (٢٨٥٩) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٢٧٨)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٦٧٢٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٣٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦٢٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٧٠٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٢٠٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨٦٤) عَن عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا.

٣) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٨٢٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٦٤٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٤٩)، عَنِ ابنِ عبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا.

هەڵبەتە فەرموودەی دیكە زۆرن، بەڵام كۆتایی بە فەرموودەیەكی دی دێنین، كە فەرموودەی چوارەمە:

فەرموودەی چوارەم: {«خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ، وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ». قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَفَلاَ نُنَابِذُهُمْ بِالسَّيْفِ، فَقَالَ: «لاَ مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلاَةَ وَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْ وُلاَتِكُمْ شَيْئًا تَكْرَهُونَهُ، فَاكْرَهُوا عَمَلَهُ وَلاَ تَنْزِعُوا يَدًا مِنْ طَاعَةٍ»}حديث صحيح.[1]

واتە: باشترین پێشەواو حوكمڕانانی[2] ئێوە، ئەوانەن كە ئێوە خۆشتان دەوێن‌و ئەوانیش ئێوەیان خۆش دەوێ، دوعایان بۆ دەكەن‌و دوعاتان بۆ دەكەن، بەڵام خراپترین پێشەواو حوكمڕانانی ئێوە ئەوانەن، كە دەیانبوغزێنن‌و دەتانبوغزێنن، لەعنەتتان لێ دەكەن‌و لەعنەتیان لێدەكەن. ئنجا پرسییان: ئەی پێغەمبەری خوا! لەو كاتەدا لەگەڵیان بە شمشێر ڕووبەڕوو نەبینەوە ؟ فەرمووی نەخێر، مادام نوێژتان لەنێودا بكەن، ( واتە: مادام دروشمەكانی ئیسلامیان تێدابن ) وە هەركات شتێكتان لە حوكمڕانەكانتان بینی، كە پێتان ناخۆشە، كردەوەكەی ببوغزێنن، بەڵام دەست لە فەرمانبەرێتی دەرمەهێنن.

بەڵام با ئێمە لەم واقیعە بێ سەروبەرەی خۆمانەوە تەماشای ئەو بنەمایە نەكەین، كە ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت دایان ناوە، چونكە ئەوانەی ئێستا حوكم بەسەر مسوڵمانان دا دەكەن، ئەوانە نین كە زانایان دەیڵێن، كوا پێش نوێژییمان بۆ دەكەن؟ زۆریان نەك هەر نیشانەو دروشمەكانی ئیسلامیان پێوە نابینین، بەڵكو دروشمی كوفرو شیركیان پێوە دەبینین! بۆیە ئەوانە ئەو فەرموودانەیان بەسەردا ناچەسپێن، وە دەرچوون لە فەرمانبەرییان‌و بە قسەنەكردنیان، نەك هەر دروست (جائِز)ە، بەڵكو فەرزە، بەڵام هەر كاتێك حوكمڕانێكی

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٠٢٧)، وَمُسْلِم برقم: (١٨٥٥)، وَالبَزَّار برقم: (٢٧٥٢)، برقم: (٥٨٦) عَنْ عَوْفِ بن مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

٢) كەواتە: جاری وا هەیە دەگونجێ مسوڵمانان كاربەدەستانێكیان هەبن بیانبوغزێنن، بەڵام سەرەڕای ئەمەش، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هەر ناوی لێناون پێشەواو حوكمڕان: (أَئِمَّتِكُمْ).

مسوڵمانان هەبوو، با هەڵەو کەمو کوڕییەکیشی هەبێ، مادام هەر بڕوادار بێو هەر شەریعەت پیادە بکات، هەتا پێش نوێژیی بۆ مسوڵمانان بکاتو دروشمەکانی ئیسلامی پێوە ببینرێن، وێڕای کەمو کوڕییەکانیشی، دەبێ بە قسەی بکەین لەو شتانەدا کە شەرعیین، بەڵام لە شتە ناشەرعییەکاندا بە قسەی ناکەین.

## هەڵوەستەیەك لە بەرانبەر:

## مەسەلەی مامەڵەکردنی کۆمەڵگا لەگەڵ حوکمڕانی ستەمکاردا:

**خوێنەری سەنگین!**

ئەوەی ڕابرد دەقی ئەوەیە کەکاتی خۆی گوتوومە، واتە: بیستو یەك (٢١) ساڵ لەمەوبەر لەساڵی (١٩٩٣)دا کە بێگومان ئێستا هەندێك تێبینیو ڕەخنەم لێی هەنو پاش لێکۆڵینەوەی زیاترو ئەزموونی زیاتر، لەهەندێك ڕووەوە، بیروڕاو بۆچوونی دیکەم بۆ درووست بوون، بەڵام - وەك پێشتریش گوتم- لێرە دەرفەتی خستنە ڕووی هەموویم نیەو، لەو دوو کتێبەدا کە پێشتر ئاماژەم پێدان، بە درێژیی لەوبارەوە دواوم، بەڵام لێرەش بە پێویستم زانی چەند دێڕێك لەو بارەوە بنووسم:

یەکەم: وەك لە دەقی دەرسەکانیش دا گوتوومە: دەبێ وریابینو ئەو واقیعەی کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرماییشتەکانی لەبارەوە فەرموون، کە حوکمڕانانی مسوڵمانی پابەند بەشەریعەتەوە حوکمڕانییان کردوە، زۆر جیاوازە لەم واقیعەی ئێستای زۆربەی هەرەزۆری کۆمەڵگاکانی مسوڵمانان کە کەسانێك حوکمڕانیانن شەریعەت ناناسن!

دووەم: ئنجا هەر دەقی هەندێ لەو فەرموودانەی كە نووسەر پشتی پێ بەستوون بۆ ڕایەكەی، پێچەوانەی ڕایەكەی دەگەیەنن! بۆ نموونە: ئەو دەڵێ: (وَلا نَدْعُو عَلَيْهِمْ) واتە: تووكو دوعای خراپیان لێ ناكەین، كەچی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: (...وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ...) كەواتە: حوكمڕانی خراپ دەبوغزێنرێو نەفرەتیشی لێ دەكرێ.

سێیەم: بەداخەوە مامەڵەیەكی گوڵبژێرییانە (تَعامُل إنْتِقائي) لەگەڵ فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كراوە، بۆ نموونە: باسەرنجی ئەم دوو فەرموودەیە بدەین، كە بێگومان بۆچوونو ڕایەكی دیكەمان لەوبارەوە بۆ درووست دەكەن:-

١/ {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَا مِنْ نَبِيٍ بَعَثَهُ اللهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إِلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ، ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لا يَفْعَلُونَ وَيَفْعَلُونَ مَالا يُؤْمَرُونَ، فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَمُؤْمِنٌ، وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنْ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ»}حديث صحيح.[1]

٢/ {عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «أَفْضَلُ الْجِهَادِ كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ». أَوْ « أَمِيرٍ جَائِرٍ»} حديث صحيح.[2]

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ڕاوەستان لەدژی حوكمڕانانی لادەرو ستەمكار بەهێزو بەرەنگار بوونەوەیان، بەجیهاد ناودەبات!

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤٣٧٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٠).

٢) أَخْرَجَهُ أَبو داود برقم: (٤٣٤٦)، وَصَحَّحَهُ الشيخ الألباني.

كەواتە: چۆن ئەو دوو جۆرە فەرمایشتانە كۆدەبنەوەو ئەو تێكگیرانە ڕواڵەتییەی لە نێوانیاندا هەیە چارەسەر دەكرێ؟

وەڵام: بەوە كە هەركام لەو فەرمایشتانە لەجێی خۆیاندا بەكاربێنو بڵێین: لە سوننەتدا، هەركام لە {دان بەخۆداگرتن}و {بەرەنگاربوونەوەی ستەمكارانو هەوڵدان بۆ لادانیان} هەنو جیاوازیی هەلو مەرجەكانیش، ئەو دوو هەڵوێستە دەخوازێ، هەركامیان لەكاتو شوێنی خۆیدا[١].

## گرتنی ڕێبازی پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و خۆپاراستن لە دووبەرەكیی و لادان

ئەمجارە نووسەر لەخاڵی (٧٣)دا شوێنكەوتنی ڕێبازی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و لەگەڵ كۆمەڵی مسوڵماناندا بوونو، پەرتەوازە نەبوون دەكاتە شەشەمین تایبەتمەندیی مسوڵمانان، لەم بڕگەیەی كتێبەكەیداو، دەڵێ:

> ٧٣) ( وَنَتَّبِعُ السُّنَّةَ وَالْجَمَاعَةَ، وَنَجْتَنِبُ الشُّذُوذَ وَالْخِلافَ وَالْفُرْقَةَ ):

واتە: ئێمە بە دوای ڕێو شوێنی پێغەمبەر دەكەوین (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و خۆمان دوور دەگرین لە ڕیزپەڕیی‌و دووبەرەكیو پەرتەوازەیی. ئەمەش بنەمایەكە جەماوەری مسوڵمانان (ئەهلی سوننەتو جەماعەت) لەسەری كۆبوونەوە، كە دەڵێ: بە دوای سوننەت دەكەوین، سوننەت یانی: ڕێباز (طَرِيق) كە مەبەست ڕێگای پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ

١) لە بەرگی دووەمی كتێبی: (ئیسلامو دەوڵەتداریی)دا {بنەمای تۆیەمی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیی} بەدرێژیی باسی ئەو مەسەلەیەم كردووە.

عَلَيْهِ وَسَلَّم)، بەدوای درێژە پێدەرانی ڕاستە شەقامی ئیسلام دەكەوین كـە خەلیفـە سـەر ڕاستەكان (الخلفاء الراشدون)ن.

كەواتە: جەماعەت، یانی كۆمەڵی مسوڵمان، كە لەسەر ڕێی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ماونەوە كە هاوەڵانن، وە ئەوانەی بەڕاستی بەدوای وان كەوتوون، هەروەك خـوای كاربەجێ دەفەرموێ: ﴿...وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ... ﴿١٠٠﴾﴾التوبة، واتـە: ئەوانـەی بەڕاستی بە دوای ئەوان كەوتوون. كەواتە: جەماعەت، یانی ئەو كۆمەڵە كە لەسەر ڕاستە شەقامی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ڕۆیون ،كە هاوەڵانن، ئنجا شوێنكەوتوانن، ئنجا ئەوانەی دوای ئەوانن، یانی: ئێمە بە دوای ئەوانە دەكەوین‌و خۆمان دووردەگـرین لـەڕیز پەڕیی: خەواریج، جەهمییە، شیعە، موعتەزیلە، مورجیئە، قەدەرییە... هتد، كە ئەوانە هەموو ڕیزپەڕو لاڕێ بوون‌و لە حەقیقەتدا هـەر بـە مسـوڵمان دەژمێـردرێن، بـەڵام بـە مسوڵمانی ڕیزپەڕو لاڕێ دەژمێردرێن، خۆشمان دوور دەگرین لە نـاكۆكیی‌و جیـاوازیی‌و، بەردەوام هەوڵدەدەین ئیش بكەین لەسـەر ئـەو مەسـەلانە، كـە مسـوڵمانان لەسـەریان یەكدەنگن، نەك ڕاجیایی هەڵگرەكان، وە خۆشمان دوور دەگرین لە تاقم تاقمێنە، ئەوەیـە مانای: ئەهلی سوننەت‌و جەماعـەت.

(وَنَجْتَنِبُ الشُّذُوذَ وَالْخِلافَ وَالْفُرْقَةَ) سێ وشەی بەكارهێناون، خۆمان دوور دەگرین لە: (شذوذ) یانی: شتی ناوازەو شتی شازو ڕیزپەڕ، (خِـلاف) یانی ناكۆكیی[1] (فِرقـة) یـانی: پەرتەوازەیی، لێرەدا پرسیارێكی ئاوا دەكرێ: ئایا لە نێو ئەهلی ئیسلامدا ڕاجیایی دەبێ، یان نا؟ وە كە دەبێ چۆن بێ؟ وە جیاوازیی لەنێوان ڕاجیایی‌و پەرتەوازەییدا چییە؟

دیارە ئیسلام لە ئەنجامی ئەوەدا، كە بەرنامەیە بۆ ژیان، دەقەكانی قورئان‌و سوننەت چەندان مانایان لـێ وەردەگیرێـن، بـۆ ئـەوەی كە،بەكـەڵكی هـەموو ڕووداوو مەسـەلەو بەسەرهاتەكان بێن، بۆ ئەوەی كە هێندە فراوان‌و بە پێز بن، بگونجێ كە یاساو دەستووریان

١) مەبەست لە (خِلاف) لێرەدا (ڕاجیایی) نیە، كە شتێكی ئاسایی یە، بەڵكو مەبەست ناكۆكیی‌و ناتەبایی‌و پێكەوە نەگونجانە.

لێ وەربگیرێن، وە بۆ هەموو ڕووداوو مەسەلە جیا جیاكانی ژیـانی مرۆڤــــایەتی هــەتا ئینسانێك لەسەر زەوی دەمێنێ، لە ئەنجامی ئەوەدا حەتمەن جیاوازیی دەبـێ لــە نێـوانی زانایاندا، جیاوازیی دەبێ لە چۆنییەتی حاڵی بوون لە قوڕئانو سوننەتی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم).

كەواتە: بەڵێ، جیاوازیی لە بیرو بۆ چـووندا، جیـاوازیی لــە حــاڵی بوونـدا، شـتێكی چاوەڕوانكراوو سروشتییە لە نێو مسوڵمانانـدا، بــەڵام تەفرەقــەو پەرتــەوازەیی، شـتێكی نەگونجاوەو، پێچەوانەی سروشتی ئیسلامەو پێچەوانەی ڕووحی برایــەتیی ئیسلامییشــە، بەڵام مسوڵمانان لە ئەنجامی چاك حاڵی نەبوونیان لە دیندا، جاری وایە لە هەندێ شـتدا دەكەونە جیاوازییەوە كە نابێ ڕاجیایی لەوێدا هەبێ، بۆ وێنە: كاتی خــۆی موعتەزیلــەو مورجیئەو خــەواریج و شــیعەو جەبرییــەو قەدەرییــەو ئەوانــە، لــە هەنـدێ مەســەلەدا كەوتوونەتە خیلافو جیاوازییەوە، لەگەڵ ئەهلی ســوننەتو جەماعــەت دا، كــە دەبـوو نەكەونە كێشەو ئیختیلافەوە، قوڕئــان مەخلووقــە، یــان مــەخلووق نیــە؟ ئــەوە كــەئایا سیفەتەكانی خوای بەرز، عـەینی زاتن، یان غـەیری زاتـــن؟ یان خوای گەورە چــۆن چـۆتە سەر عەڕش؟ یان باسی ئەو مەسەلانە، كە عـەقڵی ئینسان مەودای نیــە زۆریــان بــە دوا بكەوێ، نەدەبوو ببن بە جێی مشتو مڕو جیاوازیی نێوان مسوڵمانان، بەڵكو دەبــوو وەك ئەهلی سوننەتو جەماعـەت بكەن، وەك پێشـەوا گەورەكان كە گوتوویانە: ئەو مەسـەلانە كە عـەقڵی ئینسان چاكیان تێ بڕ ناكات، ئێمە دەڵێین: ئیمانمان پێیان هێنا بەو شێوەیەی كە خواو پێغـەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مـەبەستیانە، ئیــدی زۆریــان بــە دوا ناكــەوین، چونكە عەقــــڵ زۆری مەجال نیە بە دوایان بكەوێ، بۆ وێنە: مەســەلەی قەدەر، بابەتێكی زۆر ئاڵۆزو قووڵە، هەر هێندە لەگەڵیدا دەڕۆین، كە ئایەتو حەدیسەكان باســی دەكــەن، باقی دیكە زۆر پێیدا قووڵ نابینەوە، زیاد لەو ئەندازەیەی كە عـەقڵ تێیــدا بــڕ دەكــات. ئەگەرنا: بەڵێ، شتانی وا هــەن لــە ئیســلامدا، كــە زانایــان تێیانــدا بكەونــە ڕاجیــایی (إختلاف)ەوە ،كە وردە مەسەلەكانن (المسائل الجزئية)، بەڵام ئەوانە نابنە هۆی تەفرەقــەو دووبەرەكــێ، بەڵكو بە پێچەوانەوە دەبنە هۆی بەپیتز بوونو فراوان بوونی ئیسلام، چونكە

پێشەواكانی سەرمەزەبو ئەوانی دیكەش، كە لە هەندێ مەسەلەی وردو گچكەدا كەوتوونەتە ڕاجیاییەوە، ئەوە بۆتە ئاسانكاریی بۆ مسولْمانانو بەپێز بوونو فراوان بوونی ئیسلام.

بەلْێ، مسولْمانان لە بابەتە جوزئی و فەرعییەكاندا جیاوازییان هەیە، وەك چۆن هاوەلانی پێغەمبەر (صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلّم) لەو مەسەلانەدا جیاوازییان هەبوو، بەلام ئێمە لە شتە بنچینەییو بنەڕەتییەكاندا، هەموومان یەكین، ئێمە لە بنچینەكانی عەقیدەو عیبادەتو ئەخلاقو بنەما سەرەكییەكانی بواری حوكمو سیاسەت دا، دەتوانین كۆكو تەبابین، بۆ وێنە: هەموو یەكدەنگین كە دەبێ نوێژ بكەینو، نوێژەكان پێنجنو، لە فلانو فلان وەختەدا بكرێنو، مەرجەكان ئاوابنو ... هتد، بەلام: دەست چۆن بگیرێو، پەنجە چۆن بجوولێنرێو، ئەو مەسەلە جوزئییانە، كە زەرەر لەوەحدەتی مسولْمانان نادەن، لەو مەسەلانەدا جیاوازیی هەیە، ئەگەر مشتو مڕو لێك تێنەگەیشتنێكیش هەبێ، لەو وردە بابەتانەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە كە مسولْمانان ساوان لە ئیسلامەتییداو كرچو كالْن، ئەگەر زیاتر لە دینەكەیان تێبگەن، زیاتر یەكڕیزییو تەباییيان بەهێز دەبێ، ڕیزیان مەحكەم تر دەبێ.

### لێرەدا مەسەلەیەك هەیە بەباشی دەزانم ئاماژەیەكی پێ بكەم:

كاتی خۆی لە سەردەمی پێغەمبەردا (صَلّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلّم)، ئەبو بەكرو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دوو بالْی ئیسلام بوون، ئەبو بەكر بە لای نەرمییدا دەچوو، عومەر بە لای توندییدا دەچوو، كاری مسولْمانانیش بەو جۆرە چاك دەبێ، كە هەم كەسانی نەرمو نیانو، هەم كەسانی توندیشیان هەبن، هەر یەكەو لە شوێنی خۆیدا. كاتی خۆی مسولْمانان بەسەلیقەی جۆراوجۆرەوە هەبوون، چونكە ئیسلام فراوانو بەپێزە، جێی چەندان جیاوازیی سەلیقەو بۆچوونی تێدا دەبێتەوە، ئەمڕۆش بە هەمان شێوە مسولْمانان، ئەگەر جیاوازییەكیان هەبێ، لە بواری سەلیقەو بۆچوون دایە، لە هەندێ شتی جوزئیدایە، ئەگەرنا، لە ئەسلْدا كە ئیسلام دەبێ حاكم بێو بەرنامەی ژیان بێ، هەموو تەوژمی ئیسلامیی یەك قسەو یەك هەلْوێستە.

## خۆشەویستی چاكەكاران و بوغزاندنی خراپەكاران

ئنجا لە خاڵی (٧٤)دا، طەحاویی بنەمایەكی ئاكاریی (قاعِدة سلوكية)ی گرنگو گەورە دەكاتە حەوتەمین تایبەتمەندیی مسوڵمانان لەم بڕگەیەدا، دیارە ئەو بنەمایەش: {خۆشویستنی كەسانی دادگەرو دەستپاكو، ڕق لێبوونەوەی كەسانی ستەمكارو ناپاك}ە، تایبەت نیە بە ئەهلی سوننەتەوەو، خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسوڵمانانە، دەڵێ:

> ٧٤)- ( وَنُحِبُّ أَهْلَ الْعَدْلِ وَالأَمَانَةِ، وَنُبْغِضُ أَهْلَ الْجَوْرِ وَالْخِيَانَةِ ):

واتە: ئەوانەی كە دادگەرو دەستپاكن، خۆشمان دەوێنو ئەوانەی ستەمكارو ناپاكن، ڕقمان لێیانە. ئیمانیش تەنیا كاتێك تەواو دەبی، كە مسوڵمان خۆشویستنو ڕق لێبوونەوەی لەبەر خوابێ، وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: {«مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ وَأَعْطَى لِلَّهِ وَمَنَعَ لِلَّهِ، فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيمَانَ»} حديث صحيح.[1]

واتە: هەر كەسێ لەبەر خوا خەڵكی (باشی) خۆش بوێو، لەبەر خوا ڕقی لە خەڵك (ی خراپ) بێتەوە، وەلەبەر خاتری خوا ببەخشێو، لەبەر خوا دەست بگرێتەوە، ئەو كەسە ئیمانی تەواوە.

بەڵێ، خۆشویستنی ئەوانەی دادگەرو ئەمینن، وە ڕق لێبوونەوەی ئەوانەی خائینو ستەمكارن، لە تەواویی ئیمانە، ئینسان دەبێ هەر بەوەندە واز نەهێنێ كە بڕوادار بێ، بەڵكو دەبێ لە ڕیزی ئیمانداراندا بێ، وە نابێ هەر بەوەندە واز بێنێ كە واز لە كوفر بێنێ، بەڵكو دەبێ واز لە ڕیزی كافرانیش بێنێ، ئینسانی بڕوادار وەك چۆن ئەهلی بڕوایە، دەبێ لەگەڵ كەسانێكیش دابێ، كە ڕێبوارانی ڕێی ئیمانن، وە دەبێ دژی كاروانێك بێ، كە ڕێبوارانی ڕێی كوفرو خراپەن.

---

١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٨٣)، عن عوفِ بن مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ . قَالَ الشيخ الألباني: صحيح.

## بەبێ زانیـاریی و شـارەزایی، قسـەنەکـردن دەربـارەی هـیـچ مەسـەلەیەك

لە خاڵی (٧٥)دا نووسەر مەسەلەیەکی دیکەی فیکریی دەکاتـە هەشـتەمین بنـەمای تایبەتمەندیی مسوڵمانان، کە بێگومـان خـاڵی هاوبەشـی نێـوان سـەرجەم مسـوڵمانانی عـاقڵمەندە، ئەویش ئەوەیە کە هەرشـتێکیان نەزانی، بڵێن: خـوا زانـاترە (أَللهُ أعْلَم). دەڵـێ:

**٧٥) ( وَنَقُولُ: اللهُ أَعْلَمُ فِيمَا اشْتَبَهَ عَلَيْنَا عِلْمُهُ ):**

واتە: وە لە هەر شتێکدا کە ئەو شتە بۆ ئێمە جێی دوودڵـیی‌و گومان بـوو، دەڵـێین: خوا زاناترە. واتە: ئەهلی سـوننەت‌و جەماعەت عادەتیان وایە کـە تەکـەللوف ناکـەن، شتێك کە نەیزانن، دەڵێن: نایزانیـن، مسوڵمانی ڕاستەقینە ئاوایە، بۆیـە کاتێـك چـل (٤٠) پرسـیاریان لە ئیمام مالیك کـردوە، لـە وەڵامـی (٣٦) پرسـیاردا گوتوویـەتی نـازانم، بەس چواریـانی وەڵام داوەتەوەو گوتوویەتی: دەزانم.

کەواتە: هەرشتێك کە ئینسان نەیزانی، نابێ بڵـێ: چۆن دەبـێ بڵـێم نـازانم؟! وەك (الشَّعْبِيّ) کە یەکێکە لە زانایانی تابیعـیـن، گوتوویەتی: {لا أَدْرِي: نِصْفَ الْعِلْمِ}[1]، واتە: نازانم نیوەی زانیارییە، چونکە بڵێی: دەزانـم‌و نەشـزانی، خۆت‌و خەڵکیش بەهەڵەدا دەبەی، دین دەبێ لەسەر بناغەی زانست‌و زانیاریی‌و یەقین ڕابگەیەنرێ.

ئنجا (أبو جعفر الطحاوي) لە خـاڵی (٧٦)دا، مەسـەلەی مەسـح کـردن لەسـەر دوو خوففەکان (المَسحُ عَلى الخُفَّيْن) کە مەسەلەیەکی فیقهیـی یـە لـەبواری خـوا پەرسـتییدا دەکاتە نۆیەمین تایبەتمەندیی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت، کە دروشمێکە لە ژمارەیەك لە

---

١) أَخْرَجَهُ الدَّارِمِيُّ برقم: (٤٦٨٣)، قال حُسَيْن سليم أسد: إسنادُهُ صحيح.

تاقمو دەستەكانی لادەرو داهێنەر (مُنْحَرِفُ وَ مُبْتَدِعْ) جیایـان دەكـاتەوە، بەتایبـەت شیعە، دەڵـێ:

**٧٦) ( وَنَـرَى الْمَسْحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ(١) فِي السَّـفَرِ وَالْحضَـرِ، كَمَا جَـاءَ فِـي الأثـَرِ):**

واتە: پێمان وایە، ڕەوایە مەسح لەسەر دوو خوففەكان بكرێ، چ ئینسان لەسەفەر بێ، چ لە ماڵەوە بێ، هەروەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هاتوە. ئەوەش پێچەوانەی بیرو بۆچوونی شیعەكانە،كە ئەوان پێیان وایـە، دروسـت نیـە مەسـح لەسـەر خوففەكان بكەن، بەڵكو ئەوان مەسـح لەسـەر پێیـەكانیان دەكـەن، لـە جیـاتی ئـەوەی كەپێیەكانیان بشۆن، لەگەڵ ئەوەشدا كە فەرموودەی پێغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّم)ی لەسەرە،كە دەفەرموێ: { وَيْلٌ لِلأعْقَابِ مِنَ النَّارِ }حديث صحيح.(٢)

واتە: وەیل بۆ ئـەو كەسـانە،كە پاژنـەی پێیـەكانیان ناشـۆن، دەسـتنوێژ هـەڵگرتنی پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ئەو هەموو هاوەڵانە ڕیوایەتیان كردوە، كە پێیەكانی شۆردوە.

كەواتە: شیعە، كە مەسح دەكەن لەسەر پێیەكانیان، پێچەوانەی سوننەتو ڕێو شوێنی پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). لێرەدا مەسەلەكە مـەسەلەیەكی فیقهییە، بەڵام چونكە وەك دروشمێكی ئەهلی سوننەتو جەماعەتی لێهاتوە، بۆیە لێرەدا باسی كردوە، ئەگەرنا مەسەلەكە لە بابەتەكانی عەقیدە نیە، بەڵكو مەسەلەیەكە لە مەسـەلەكانی عیبـادەت، وەمـن تێبینییم لەسەر باسكردنی هەیە لەگەڵ بابەتی عـەقیدەدا.

---

١) خُفّ: گۆرەوی لە چەرم دروستكراوە، وەك پێڵاوێكی سووك (خفیف) وایە.

٢) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٨٣) عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، قال الألباني: صحيح، عن عوفِ بن مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

## ئەنجامدانی حەج و جیهاد

## لەگەڵ حوکمڕانان دا

لەکۆتایی ئەم بڕگەیەدا نووسەر لە خاڵی (٧٧) هەردووك بنەمای: دەو یازدە (١٠و ١١)، وەك دوو تایبەتمەندیی دیکەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەخاتەڕوو ،کە بریتین لە: هەڵسان بەجێ بەجێکردنی هەردووك پایەی گرنگی: حەجو جیهاد (الحج والجهاد) لەگەڵ حوکمڕانانی مسوڵمانان‌دا، ئنجا چاکەکاربن، یان خراپەکار، بەهیچ بیانوویەك ئەو دوو فەرزە گەورەو گرینگەی ئیسلام پەك ناخەن، وەك عادەتی ژمارەیەك لە تاقمو پێڕە لادەرو داهێنەرەکان، دەڵێ:

> ٧٧) ( وَالْحَجُّ وَالْجِهَادُ مَاضِيَانِ مَعَ أُولِي الأَمْرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، بَرِّهِمْ وَفَاجِرِهِمْ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ، لا يُبْطِلُهُمَا شَيْءٌ وَلا يَنْقُضُهُمَا ):

واتە: حەجو جیهادکردن بەردەوامن لەگەڵ کاربەدەستانی مسوڵمانان، ئنجا ئەو کاربەدەستانە چاك بن، یان خراپ بن، مادام ئیماندار بن (شتێکیان نەکردبێ ئیسلامەتییان هەڵوەشابێتەوە، هەتا دروشمەکانی ئیسلامیان پێوە ببینرێن، دروستە هەم حەجیان لەگەڵدا بکرێو هەم جیهادیش)، هەتا ڕۆژی دوایی، هیچ شتێك ئەو حەجو جیهادە بە تاڵ ناکاتەوەو هەڵناوەشێنێتەوە.

یانی: مسوڵمانان تاکو کاربەدەستیان هەبن، دەبێ حەج هەر بکرێو جیهادیش هەر بکرێ، چونکە جەنگو جیهاد، بەرزترین لوتکەی ئیسلامەو، پەرژینی پاراستنی

باغی ئیسلامە، بۆیە شان بە شانی كاربەدەستانی مسوڵمانان، با ئەو كاربەدەستانە وەك پێویستیش نەبن، پێویستە ئەو دوو دروشمە گەورەو گرنگەی ئیسلام، كە ڕەهەندی: فیكریی‌و عەقیدەیی‌و عیبادیی‌و ئەخلاقیی‌و كۆمەڵایەتیی‌و ئابووریی‌و سیاسیان هەیە، هەر بەردەوام بن‌و پەكیان نەخرێ.

******

# ئیمان بە فریشتان و
# ژیانی بەرزەخ و
# گۆڕو زیندووکرانەوەو
# لێپرسرانەوەو
# بەهەشت و دۆزەخ

نووسەر لەمەودوا شەش خاڵ تەرخان دەكات - خاڵەكانی: (٧٨-٨٣)- بۆ خستنەڕووی ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی - لەڕوانگەی ئەهلی سوننەتو جەماعەتەوە- لەبارەی سێ بابەتی گەورەو گرینگ، هەركام لەو سێ بابەتە، یەكی دوو خاڵیان بۆ دادەنێ:

١- ئیمان بە فریشتە پارێزەرەكانی كردەوەكانی مرۆڤانو، بە فریشتەی مەرگ (ملك الموت) كە گیانكێشانی مرۆڤانی پێ سپێرراوە، كە نووسەر خاڵەكانی: (٧٨و٧٩)ی بۆ تایبەت كردوون.

٢- ئیمان بە ژیانی پاش مەرگو هەبوونی پاداشتو سزای گۆڕ- واتە: پاش خرانە نێو گۆڕو بەخاك سپێرران- پرسیار لێكران لەلایەن دوو فریشتەوە، بەناوی: (مُنكَر و نَكیر) كە نووسەر هەردووك خاڵی: (٨٠ و ٨١)ی بۆ تەرخان كردوون.

٣- ئیمان بە زیندووكرانەوەو كۆكرانەوەو لێپرسرانەوەو، كێشرانی كردەوان بە تەرازوو (وَزْنُ الأعْمالِ بالميزانْ)و، ڕەتبوون بەسەر پردی سەرپشتی دۆزەخ دا، كە (صراط)ی پێدەگوترێ، وە ئیمان بەبەهەشتو دۆزەخو ئامادەكرانیان بۆ كەسانی شایستەیان، كە نووسەر هەردووك خاڵی: (٨٢ و٨٣)ی بۆ داناون.

شایانی باسیشە لە ڕیزبەندیی ئەم سێ بابەتەدا، نووسەر ڕەچاوی ڕیزبەندیی كاتیی (الترتيب الزمني) كردوە وەك ئاشكرایە.

## ئیمان بە فریشتەکانی خوا:

## تۆمارکەرانی کردەوان و فریشتەی مەرگ

سەرەتا (الطحاوي) دێتە سەر بابەتی یەکەم لەو سێ بابەتەو، دەڵێ:

٧٨) ( وَنُــؤْمِــنُ بِالْكِرَامِ الْكَاتِــبِــينَ، فَإِنَّ اللهَ قَــدْ جَعَلَهُــمْ عَــلَيــْنَا حَــافِظِـــينَ ):

واتە: بڕوا دێنین بە نووسەرە بەڕێزەکان، ، چونکە خوا بەسەرمانەوە کردوونییە پارێزەر، ئاشکرایە مەبەست لە نووسەرە بەڕێزەکان، ئەو فریشتە بەڕێزانەن کە خـوای پـەروەردگار بەسـەر ئێمەوەی داناونو، کردەوەو قسەو مەبەسـتو نیازەکانیشـمان دەنووسـن، چـونکە دەڵێ: (فَإِنَّ اللهَ قَدْ جَعَلَهُمْ عَلَيْنَا حَافِظِـينَ) بێگومان خـوا بەسـەر ئێمـەوەی کردوونەتـە پارێزەر، یانی: هەموو جووڵانەوەو هەڵسو کەوتو هەستو نەستمان دەپارێزنو تۆمـاری دەکەن، لەو بارەوەش هەم دەقی قورئانو، هەم فەرموودەکانی پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) زۆرن، بۆ وێنە:

١- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الإنفطـار)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ۝١٠ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ۝١١ ﴾، واتـە: بێگومـان پارێزەرانتـان بەسـەرەوەن، بـەڕێزنو دەنووسن، (یانی: کردەوەکانتان دەنووسن).

٢- هەروەها لە سوورەتی (ق)دا دەفـەرموێ: ﴿ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ۝١٧ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ۝١٨ ﴾، واتە: کاتێ کە وەردەگرن دوو وەرگرەکە، لە لای ڕاستو لای چـەپ ئامـادەنو دانیشـتوون (جموجۆڵی ئینسـان

تۆماردەکەن)، هیچ وشەیەك لە دەمی ئینسـان نایەتـە دەر، مەگـەر چـاودێرێكی ئامادەی لەلایە، یەکسەر تۆماری دەکات.

٣- ئنجا وەك لە فەرموودەکانی پێغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەردەکـەوێ، ئـەو فریشتانە بەس کردەوەی ئینسان نانووسن، بەڵکو نیازو مەبەستی نێو دڵیشی هەر دەنووسن، وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لـە فەرموودەیـەکی قودسـییدا دەفەرموێ: {قَالَ اللهُ عَزَّ وجَلَّ: إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِسَيئَةٍ فَلاَ تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا سَيئَةً، وإِذَا هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا عَشْرَاً} حَدِيثٌ صَحِيحٌ.[١]

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: خوای زاڵی پایـەدار دەفـەرموێ: هەر کات بەندەی من بەدڵی داهات خراپەیەك بکات، لەسەری مەنووسن، (هەر لەبەر ئەوە کەبەدڵی داهاتوە) جا ئەگەر کردی، خراپەیەکی بۆ بنووسن، وە هـەرکاتێك چـاکەیەکی بە دڵدا هاتو ئەنجامی نەدا، چاکەیەکی بۆ بنووسـن، ئەگـەر ئەنجامیـدا، دەچـاکەی بـۆ بنووسن.

کەواتە: مەلائیکەت نیازو مەبەستی نێو دڵی ئینسانیش هەر دەنووسن، خوای زانـاو شارەزا توانایەکی وای داونەتێ، بزانن چ هەستو نەستێك بـەدڵی ئینسانیشـدا دادێ، چ خێر چ شەڕ.

ئنجا بەتایبەت باسی فریشتەی مەرگ (مَلَك الَموت) دەکات، کە لەهەندێك کتێبانـدا ناوی بە(عزرائیل) هاتوە، بەڵام مادام لە قورئانو سوننەتدا نەهاتوە، پشتی پێ نابەسترێو ڕەنگە لەخاوەن کتێبانیش وەرگیرابێ، دەڵێ:

## ٧٩) ( وَنُؤْمِنُ بِمَلَكِ الْمَوْتِ، الْمُوَكَّلِ بِقَبْضِ أَرْوَاحِ الْعَالَمِينَ ):

واتە: بڕوا دێنین بەفریشتەی مردن، کە ڕاسپێردراوە بەکێشانی گیانی جیهانییان، (ملك الموت) کە خوای پەروەردگار هەر بە (ملك الموت) ناوی بردوەو، ئەو فریشتەیە، کە تەرخان

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: (٣٤٩)، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

کراوە بۆ سەرپەرشتییکردنی گیان کێشان، وەك چۆن جوبرائیل تەرخان کراوە بۆ گەیاندنی وەحی بۆ پێغەمبەران (عَلَيهمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، وە میکائیل تەرخان کراوە بۆ دابەشکردنی بژێوو ڕۆزیی، خوای بێ وێنە لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾﴾ السجدة، واتە: پێیان بڵێ: فریشتەی مردن کە پێتان سپێردراوە، گیانتان دەکێشێ، دوایی بۆ لای پەروەردگارتان دەگێڕدرێنەوە.

ئنجا یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: لێرەدا خوای کاربەجێ، گیان کێشانی ئێمەی لەسەر فریشتەی مەرگ (ملك الموت) تەرخان دەکات ،ئەدی بۆچی لە سوورەتی (الأنعام)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿... حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾﴾، واتە: هەتا کاتێك یەکێك لە ئێوە مردنی دەگاتێ، نێردراوانی ئێمە (فریشتەکانی ئێمە) گیانی دەکێشن و کەمتەرخەمیی تێدا ناکەن. بۆچی لێرەدا عایدی هەموو مەلائیکەتەکانی کردوە، بەڵام لەوێ دەفەرموێ: (ملك الموت)؟

دیسان بۆچی لە سوورەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا ... ﴿٤٢﴾﴾، واتە: خوا نەفسەکان (ڕووحەکان) وەردەگرێ لە کاتی مردنیاندا؟

کەواتە: گیان کێشان، عایدی سێ شوێنان کراوە:

١/ لە لایەك دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا ... ﴿٤٢﴾﴾!

٢/ لە لایەکی دیکە دەفەرموێ: ﴿... حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾﴾!

٣/ وە لە لایەکی دیکە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ... ﴿١١﴾﴾ السجدة، لە وەڵامدا دەڵێین: ئەو سێیانە هیچیان دژی یەکدی نین:

یەكەم: خوا بەدیهێنەرو سەرپەرشتیارو پەروەردگاری هەموو شتێكە. كەواتە: هەموو شتێك دەگێڕدرێتەوە بۆ لای خوا.

دووەم: خوای پەروەردگار فریشتەیەكی بە ناوی فریشتەی مەرگ (ملك الموت) تەرخان كردوە بۆ سەرپەرشتییكردنی گیان كێشان.

سێیەم: ئەو (ملك الموت)ەش، چەند سەربازێكی لەبەر دەستدان، كە فریشتەكانی خوان. كەواتە: دەگونجێ بڵێین: خوا، گیانەكان دەكێشێ، وە دەگونجێ بڵێین (ملك الموت)، وە دەگونجێ بڵێین: چەند فریشتەیەك، چونكە ئەوان ڕاستەوخۆ پرۆسەی گیان كێشانەكە ئەنجام دەدەن.

## جیاوازیی ڕووح و نەفس و جۆرەكانی نەفس

ئنجا سەبارەت بەوە كە: ڕووح چییە؟ نەفس چییە؟ جیاوازییان چۆنە؟ چەند جۆرە نەفس هەن؟ لە نێو زانایاندا مشتومڕو جیاوازیی هەیە، جارێ ڕووح ،زانایان زۆریان قسە لێكردوە، بەڵام حەقیقەتەكەی ئەوەیە، كەخوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ ﴾الإسراء، واتە: پرسیارت لێدەكەن دەربارەی ڕووح، بڵێ: ڕووح كاری پەروەردگارمە، ئەندازەیەكی كەم نەبێ زانیارییتان پێنەدراوە. خوای زانا دەفەرموێ: ئەندازەیەكی كەمتان زانیاریی پێدراوە، بۆیەش لێرەدا ئاماژە بەوە دەكا، واتە: بەو ئەندازە كەمە ناتوانن حەقیقەتو ماهیەتو چۆنییەتی ڕووح بزانن، بەڕاستییش لەوەتەی خوا ئەو ئایەتەی ناردۆتە خوارەوەو لەپێش ئەوەش، زانایان هەرئەوەندە دەڵێن: كە بەڵێ، ڕووح حەقیقەتی هەیە، بەڵام چۆنییەتییەكەی نازانین ،بەڵام بە پەرێزو شوێنەواری دەزانین، كە دەچێتە بەدەنی ئینسانەكانەوەو، پاشان لەكاتی مردن دەچێتە دەرێ.

### ئنجا ئایا جیاوازیی نێوان ڕووح و نەفس چییە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: لە قورئاندا چوار وشە بەکار هاتوون: (عَقـل، قَلـب، نَفـس، رُوح)، ئەوانە هەر چواریان بۆ ئەو حەقیقەتە پەنهانو شێردراوەیە بەکارهـــاتوون، کـە دەروونو ماهیەتی ئینسان پێکدێنێ، بەڵام وەك (أبو حامد الغزالي) لە کتێبی (إحْیاء)دا دەڵێ: وە کاتێك خوا دەیەوێ تەعبیر لە حەقیقەتی ئینسان بکات دوور لە جیسـم، بە (ڕووح) ناوی دەبات، وە کاتێك کە تەعبیر لە حەقیقەتی ئینسان دەکات، بە تێکەڵیی لەگەڵ جیسم، بە (نەفس) ناوی دەبات، کاتێك تـەعبیر لـە حەقیقـەتی ئینسـان دەکـات، وەك سـەنتەری مـەعلوومـاتو بیرو هۆش، بە (عەقڵ) ناوی دەبـات، کـاتێکیش تـەعبیر لـە حەقیقـەتی ئینسان دەکات، وەکو سەنتەری ویستنو بڕیاردانو خۆشویستنو هەستو سۆز، بە (قەلب) ناوی دەبات کەواتە: (روح و نفس و عقل و قلب) چوار ناون بۆ یەك حەقیقەت.

ئنجا لە قورئاندا نەفس سێ سیفەتی لێ هەڵدراون:

١) النَّفْس الأمّارة: ﴿... إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ ... ﴿٥٣﴾﴾ یوسف.

٢) النَّفْس اللَّوَّامَـة: ﴿وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾﴾ القیامة.

٣) النَّفْس المُطْمَئِنَّة: ﴿يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾﴾ الفجر.

ئنجا ئایا بەحەقیقەت، ئینسان سێ نەفسی هەن؟

زانایان دەڵێن: نەخێر، بەڵکو ئینسان یەك نەفسی هەیە، بەڵام ئەو نەفسە سێ حاڵەتی هەن:

١- حاڵەتێك کە دوورە لە شەرعو تەسلیمی شـەیتان بـووەو، بـە دوای ئـارەزووی خـۆی دەکەوێ، پێی دەگوترێ: (النفس الأمّـارة). واتە: نەفسێك کە زۆر فەرمان دەکات بـە خراپە.

٢- لە كاتێكدا ئەو نەفسە لە شەیتان‌و ئارەزووەكانی هەڵدەگەڕێتەوەو بەرەو شەرع دێت، بەڵام تەواو تەسلیم نەبووە، پێی دەگوترێ: (النَّفس اللَّوَّامة)، چونكە بەردەوام سەرزەنشتی خاوەنەكەی دەكات‌و لۆمەی دەكات، ئەوەت بۆ خوارد ؟! ئەوەت بۆ گوت؟! ئەوەت بۆ كرد ؟!.

٣- كاتێك ئەو نەفسە تەواو تەسلیمی فەرمانی خوا دەبێ‌و تەواو ساغ دەبێتەوە، پێی دەگوترێ: (النَّفسُ المُطمَئِنّة)، نەفسی ئۆقرە گرتوو و داسەكناوو سەقامگیر.

## قۆناغی دوای مردن و گۆڕ و ژیانی بەرزەخ

ئنجا دێتە سەر بابەتی دووەم كە بابەتی ژیانی بەرزەخ‌و قۆناغی دوای مردن‌و گۆڕەو، ئەوەی لەو قۆناغەدا ڕوودەدات، ئاماژەی پێدەكات وەك بەشێك لە عەقیدەی ئیسلامیی، هەرچەندە لەو بارەوە، تەنانەت لەنێوان زانایانی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتیشدا، ڕاجیایی زۆرە لەسەر وردەكارییەكان، بەڵام لەسەر ئەصڵی هەبوونی جۆرێك لە پاداشت‌و سزا لەژیانی بەرزەخ‌و دوای مردن دا پێش قیامەت،زانایان یەكدەنگن، لە خاڵی ژمارە (٨٠)دا، دەڵێ:

> ٨٠) ( وَبِعَذَابِ الْقَبْرِ لِمَنْ كَانَ لَهُ أَهْلاً، وَسُؤَالِ مُنْكَرٍ وَنَكِيرٍ فِي قَبْرِهِ عَنْ رَبِّهِ وَدِينِهِ وَنَبِيِّهِ، عَلَى مَا جَاءَتْ بِهِ الْأَخْبَارُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ، وَعَنِ الصَّحَابَةِ رِضْوَانُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ ):

واتە: بڕوامان هەیە بە ئازارو ئەشكەنجەی قەبر بۆ كەسێك كە شایستەی بێ، (شایستەی سزای گۆڕ بێ، كەواتە: دیارە هەموو كەس لە گۆڕدا سزا نادرێ) وەبەپرسیار

لێكردنی مونكەرو نەكیر (ناوی دوو فریشتانە كە لە گۆڕدا لە ئینسانەكان دەپرسنەوە) كە سێ پرسیاری سەرەكیی لێدەكەن: لە پەروەردگاری، لە ئایینو بەرنامەكەی، لە پێغەمبەرەكەی، وەك هەواڵمان پێگەیشتوە لە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و، هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ).

سەبارەت بە سزای دوای گۆڕ، خوای دادگەر لە چەند شوێنێكدا ئاماژەی پێدەكا، بۆ وێنە:

١/ لە سوورەتی (غافر)دا دەفەرموێ: ﴿...وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ ﴿٤٥﴾﴾، واتە: سزایەكی ترسناكو ئازارێكی بەئێش دەورەی دارو دەستەی فیرعەونیدا، ﴿النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا... ﴿٤٦﴾﴾غافر، ئایا ئەو ئازارو ئێشە بریتیە لە چی؟ بریتیە لە ئاگرێك كە بەیانیانو ئێواران، دارودەستەی فیرعەون لەسەر ئەو ئاگرە ڕادەنوێنرێنو پێی دەسووتێن، ﴿...وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ ﴿٤٦﴾﴾ غافر، كاتێك كە قیامەتیش دێ، ئالی فیرعەون بخەنە نێو توندترین ئازارەوە.

كەواتە: پێش قیامەت، دارو دەستەی فیرعەون بەیانیانو ئێواران بە ئاگر دەسووتێن، ئەوەش بەڵگەیەكی ڕوونو ڕاشكاوە لەوەدا كە ئینسان لە دوای مردنێ تووشی سزا دەبێ، ئەگەر كافربێ، پێش ئەوەی قیامەت بێ.

٢/ دیسان خوای كاربەجێ لە سوورەتی (الطور)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٧﴾﴾، واتە: بێگومان بۆ ئەوانەی كە ستەمكار بوون لە پێش ئەوەدا (واتە: پێش سزای ڕۆژی دوایی)، عەزابێكی كەمتر هەیە، بەڵام زۆربەیان

نازانن،جا ئەوە دەگونجێ عەزاب دانێك بێ، بەدەستی مسوڵمانان لە شەڕو جەنگدا، وە دەشگونجێ مەبەست پێی سزای گۆڕ بێ، كە ئەوەش زیاتر پێدەچێ، چونكە مەرج نیە هەموو كافرێك بەدەستی مسوڵمانان سزا بدرێ، بەڵام هەموو كافران پێش قیامەت دوای ئەوەی، كە دەمرن لە جیهانی بەرزەخدا سزا دەدرێن.

٣/ پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەو بارەوە فەرموودەی زۆرن، بۆ وێنە:

فەرموودەی یەكەم: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: {إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ، وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ، أَتَاهُ مَلَكَانِ، فَيُقعِدَانِه فَيقُولاَنِ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هذَا الرَّجُلِ (لِمُحَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم) فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ ، فَيُقَالُ لَهُ: أُنْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ، قَدْ أَبْدَلَكَ اللهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنَ الْجَنَّةِ فَيَرَاهُمَا جَمِيعاً} حديث صحيح[1].

واتە: بەندە دوای ئەوەی لە گۆڕەكەی دەنرێ، (ئەوانەی كە لەگەڵی چوون بۆ سەرقەبران) دۆستو ڕەفیقانی دەگەڕێنەوە (بۆ ماڵی خۆیان ئەو بەجێ دێڵن لەوێدا)، دەنگی نەعلەكانیان دەبیستێ (كاتێ كە دەگەڕێنەوە) دوو فریشتە دێن بۆ لای دایدەنیشێنن، پێی دەڵێن: دەربارەی ئەو پیاوە چی دەڵێی؟ (دەربارەی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم))، ئەگەر بڕوادار بێ دەڵێ: شایەتیی دەدەم كە پێغەمبەری خواو بەندەی خوا بووە، (ئەو فریشتەیە) پێی دەڵێ: تەماشای ئەو شوێنە بكە كە لە ئاگردا بۆت دانرابوو (ئەگەر كافربای دەچوویە نێوی) خوا گۆڕیوی بەو شوێنە خۆشەی لە بەهەشتێ، ئنجا هەردووكیان (شوێنەكەی دۆزەخیو شوێنەكەی بەهەشتی) دەبینێ.

فەرموودەی دووەم: {عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَرَّ النَبِي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِقَبْرَيْنِ، فَقَالَ: إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَبْرِئُ مِنَ الْبَوْلِ، وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهَا

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٢٩٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١٢٧٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٣٩٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٥٣) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

نِصْفَيْنِ، فَغَرَزَ فِي كلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً، قَالُوا يَا رَسُولَ اللهِ! لِمَ فَعَلْتَ هذَا؟ قَالَ: لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا} حديث صحيح[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە لای دوو قەبراندا ڕەت بوو، فەرمووی: خاوەنی ئەو دوو قەبرانە سزا دەدرێن، لەسەر شتێکی زۆر گەورەش سزا نادرێن، یەکێکیان لەسەر ئەوە سزا دەدرێ، کە لە کاتی میزکردنێدا خۆی پاك نەدەکردەوە، هی دووەمیشیان لەسەر ئەوە سزا دەدرێ، کە قسەی لە نێوانی خەڵکی دەهێناو دەبرد (دوو ڕووی هەبوون)، ئنجا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لقێکی دارخورمای هێنا کردی بە دوو بەشەوەو، هەر بەشەی لەسەر یەکێك لە قەبرەکان چەقاند، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆچی وات کرد؟ فەرمووی: بەڵکو سزایان لەسەر سووك ببێ، ئەگەر ئەو دوو دارە وشك نەبن (ئەگەر بروێنەوە سێبەریان لێدەکات) ئایا چ حیکمەتێك لە وەدایە؟ ئێمە نازانین، گرنگ ئەوەیە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: بەشکم بەهۆی ئەوەوە سزایان لەسەر سووك ببێ.

فەرموودەی سێیەم: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّم) إِذَا قُبِرَ أَحدكُمْ أَوْ الإِنْسَان أَتَاهُ مَلَكَانِ أَسْوَدَانِ أَزْرَقَانِ يُقَال لأَحَدِهِمَا: الْمُنْكَر وَالاخَر النَّكِير، فَيَقُولانِ لَهُ مَا كُنْت تَقُول فِي هَذَا الرَّجُل لِمُحَمَّدٍ؟ فَهُوَ قَائِل مَا كَانَ يَقُول، فَإِنْ كَانَ مُؤْمِنًا قَالَ: هُوَ عَبْد اللَّه وَرَسُوله أَشْهَد أَنْ لا إِلَه إِلاَّ الله، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْده وَرَسُوله، فَيَقُولانِ لَهُ: إِنْ كُنَّا لَنَعْلَم أَنَّك تَقُول ذَلِكَ، ثُمَّ يُفْسَح لَهُ فِي قَبْره سَبْعُونَ ذِرَاعًا فِي سَبْعِينَ ذِرَاعًا وَيُنَوَّر لَهُ فِيهِ فَيُقَال لَهُ: نَمْ نَوْمَةَ الْعَرُوس لا يُوقِظهُ إِلاَّ أَحَبّ أَهْله إِلَيْهِ، حَتَّى يَبْعَثهُ اللَّه مِنْ مَضْجَعه ذَلِكَ، وَإِنْ كَانَ مُنَافِقًا قَالَ: لا أَدْرِي، كُنْت أَسْمَع النَّاس يَقُولُونَ شَيْئًا، فَكُنْت أَقُولهُ، فَيَقُولانِ لَهُ: إِنْ كُنَّا لَنَعْلَم أَنَّك تَقُول ذَلِكَ ،

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٨٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢١٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٩٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٧٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٠٦٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٤٧).

ثُمَّ يُقَال للأرْضِ : اِلْتَئِمِي عَلَيْهِ ، فَتَلْتَئِم عَلَيْهِ حَتَّى تَخْتَلِف فِيهَا أَضْلاعه، فَلا يَـزَال مُعَذَّبًا حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّه مِنْ مَضْجَعه ذَلِكَ} حديث صحيح[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: کاتێك مردوو نێژرا، یان ئینسان نێژرا، دوو فریشتەی ڕەشی شین دێنە لای، یەکێکیان پێی دەگوترێ: (مونکەر)، ئەوی دیکەشیان (نەکیر)، بە مردووەکە دەڵێن: چی دەڵێی سەبارەت بە ئەو پیاوە، موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)؟ ئەویش ئەو وەڵامە دەداتەوە کە لە دنیادا لەسەری بووە، ئەگەر بڕوادار بێ، دەڵێ: بڕوام وایە کە پێغەمبەری خوایەو بەندەی خوایە، وەشایەدیی دەدەم کە جگە لە خوا، هیچ پەرستراو نیە موحەممەد بەندەو ڕەوانەکراویەتی، دەڵێن: ئێمەش دەمانزانی کە تۆ وا دەڵێی، ئنجا گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێ ،حەفتا گەز بە حەفتا گەز، بۆی دەبێتە شوێنێکی زۆر خۆش و، بۆی ڕۆشن دەکرێتەوەو پێی دەگوترێ: بخەوە، وەك ئەو بووکەی (یان وەك ئەو زاوایەی)[2] کە خۆشەویسترین کەسی نەبێ، بە خەبەری ناهێنێ، هەتا خوا زیندووی دەکاتەوە لەو شوێنەی خۆیدا، بەڵام ئەگەر مونافیق و دەغەڵ بێ: {کە پرسیاری لێدەکەن لە بارەی موحەممەدەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)} دەڵێ: نازانم، من شتێکم دەبیست کە خەڵکی دەیانگوت، منیش هەر ئەوەم دەگوت، پێی دەڵێن: ئێمەش دەمانزانی کە تۆ وا دەڵێی، دوایی بە زەوی دەگوترێ: لێی وێك بێوەو ڕای گوشە! ئەویش لێی وێك دێتەوە تاوەکو پەراسووەکانی تێك دەپەڕن، بەو شێوەیە لە عەزابدا دەبێ، تاکو خوا زیندووی دەکاتەوە، لە شوێنەکەی خۆی لە ڕۆژی دواییدا.

---

١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ حِبَّانَ برقم: (٣١١٧) قال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي.

٢) المعجم الوسيط، ص ٥٩٢، (العروس: المرأة مادامت في عُرسها وكذلك الرجل). کەواتە: وشەی (عروس) بۆ بووك و زاوا بەکاردێ، بەڵام (عروسة) تەنیا بۆ ئافرەت و (عريس)یش تەنیا بۆ پیاو (زاوا).

كەواتە: ئەوەی كەلە قورئانو سوننەت دەفامرێتەوەو وەردەگیرێ، ئەوەیە كەسزادانی گۆڕ هەیەو، لە خاڵی داهاتووشدا تیشكی زیاتری دەخەینەسەر.

لە خاڵی ژمارە (٨١)یشدا هەر لەسەر باسی بابەتی پێشوو (سزاو پاداشتی جیهانی بەرزەخو گۆڕ) بەردەوام دەبێو، دەڵێ:

**٨١) ( وَالْقَبْرُ رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ، أَوْ حُفْرَةٌ مِنْ حُفَرِ النِّيرَانِ ):**

واتە: گۆڕ، یان باغو باخچەیەكە لە باخچەكانی بەهەشت، یان چاڵێكە لەچاڵەكانی دۆزەخ. ئێمە لە ڕابردوودا باسی ئەوەمان كرد، كە ئینسان دوای ئەوەی دەمرێ، یان دەكەوێتە خۆشییەوە،ئەگەر ئەهلی ئیمانو كردەوەی چاك بووبێ، یان دەكەوێتە ناخۆشییەوە، لەوبارەوە چەند شتێكمان باس كردو، چەند فەرموودەیەكو چەند ئایەتێكیشمان هێنانەوە، لێرەشدا سەبارەت بە چۆنییەتی گیان كێشرانو، لێپرسینەوە لە قەبردا، دوو فەرموودەی دیكەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دێنینەوە، كە دووەمیان تۆزێك درێژە، بەڵام شتی گرنگی زۆریان تێدایە:

فەرموودەی یەكەم: {عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا مَعَ جَنَازَةٍ فِي بَقِيعِ الْغَرْقَدِ فَأَتَانَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَجَلَسَ وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ وَمَعَهُ مِخْصَرَةٌ يَنْكُتُ بِهَا ثُمَّ رَفَعَ بَصَرَهُ، فَقَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ إِلاَّ وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهَا مِنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، إِلاَّ قَدْ كُتِبَتْ شَقِيَّةً أَوْ سَعِيدَةً، فَقَالَ الْقَوْمُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَفَلا نَمْكُثُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى السَّعَادَةِ وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقْوَةِ فَسَيَصِيرُ إِلَى الشِّقْوَةِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): بَلْ اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشِّقْوَةِ فَإِنَّهُ يُيَسَّرُ لِعَمَلِ الشِّقْوَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ

السَّعَادَةِ فَإِنَّهُ يُيَسَّرُ لِعَمَلِ السَّعَادَةِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ ﴾الليل} حديث صحيح.[١][٢]

واته: عەلی كوڕی ئەبو تالیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ جەنازەیەك بووین لە بەقیعی غەرقەد (كە شوێنێكە)، پێغەمبەر تەشریفی هاتو دانیشت، ئێمەش لە دەوری دانیشتین، دارێكی (یان گۆچانێكی)[٣] بچووكی پێ بوو، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ڕووی لە زەوی كردو گۆچانەكەی لە زەویەوە دەژەنی، دوایی فەرمووی: هیچ ئینسانێك نیە، مەگەر خوا شوێنەكەی لە بەهەشتێ، یان لە دۆزەخێدا نووسیوە، نووسراوە، كە ئایا بەدبەختە، یان بەختەوەرە، خەڵكەكە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بۆچی بەو شێوەیەی خوا نووسیویەتی چاوەڕێ نەكەین و واز لە كارو كردەوە بێنین!! (خوا ئەوە نووسیویەتیو بڕیاریداوە، با ئێمەش هیچ كردەوەیەك نەكەین)، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وەلامی دایەوە: (وەلامدانەوەكە بە حەقیقەت زۆر وردەو، زۆر ئیشكال لە مەسەلەی قەدەر چارەسەر دەكات) بەڵكو كاربكەن، ئنجا هەر كەسێ لە بەختەوەران بێ، حەتمەن بەرەو كردەوەی بەختەوەران دەچێ، (خوا وای لێدەكات كە كردەوەی بەهەشتییان ئەنجام بدات) هەر كەسێكیش لە ڕیزی بەدبەختان نووسرابێ، ئەوە كردەوەی دۆزەخییان ئەنجام دەدات، دوایی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: كردەوەی چاك بكەن، هەر كەسە ئەو كردەوەی بۆ ئاسان دەكرێ بۆ ئەو شوێنەی، كە بۆی دروستكراوە، بەختەوەران ئاسان دەكرێن بۆ كردەوەی بەهەشتییان، ئەوانەش كە بەدبەختن وەردەچەرخێنرێنو ئاسان دەكرێن بۆ كردەوەی دۆزەخییان، دوایی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ ﴾الليل، هەر

---

١) رَوَاهُ أحْمَد برقم: (١٠٦٧)، وقال الشيخ شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

٢) ئەم فەرموودەیەمان پێشتریش هێنا لەكاتی قسەكردن لەسەر خاڵی (٤٦)و ماناشمان كرد.

٣) المعجم الوسيط، ص ٢٣٧.

کەسێك ماڵی خۆی ببەخشێ، خۆی بپارێزێ لە خراپە، بڕواشی بە چاکترین وشە بێ، ئێمە ئاسانی دەکەین بۆ کردەوەی ئاسان، (کردەوەی ئاسان ئەو کردەوەیە کە فیترەتی مرۆڤ دەیخوازێ کە کردەوەی مسوڵمانانەیە) ئەو کەسانە وەردەچەرخێنرێن بۆ کردەوەی چاك، دیارە بەپێچەوانەشەوە: ﴿وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾﴾ اللیل، هەر کەسێ ڕژدیی بکاو خۆی بەبێ نیاز ببینێ (بەرانبەر بەخوا)، بڕواشی بە چاکترین وشە نەبێ {کە وشەی (تَوْحید)ە}، ئەوە ئاسانی دەکەین بەرەو شتێکی زەحمەت، (کە کردەوەی خراپە).

فەرموودەی دووەم: {عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي جِنَازَةِ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ، وَلَمَّا يُلْحَدْ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ، وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ، وَكَأَنَّ عَلَى رُؤسِنَا الطَّيْرَ، وَفِي يَدِهِ عُودٌ يَنْكُتُ فِي الأَرْضِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ: اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الْعَبْدَ الْمُؤْمِنَ إِذَا كَانَ فِي انْقِطَاعٍ مِنَ الدُّنْيَا، وَإِقْبَالٍ مِنَ الآخِرَةِ، نَزَلَ إِلَيْهِ مَلاَئِكَةٌ مِنَ السَّمَاءِ بِيضُ الْوُجُوهِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الشَّمْسُ، مَعَهُمْ كَفَنٌ مِنْ أَكْفَانِ الْجَنَّةِ، وَحَنُوطٌ مِنْ حَنُوطِ الْجَنَّةِ، حَتَّى يَجْلِسُوا مِنْهُ مَدَّ الْبَصَرِ، ثُمَّ يَجِيءُ مَلَكُ الْمَوْتِ، عَلَيْهِ السَّلاَمُ، حَتَّى يَجْلِسَ عِنْدَ رَأْسِهِ، فَيَقُولُ: أَيَّتُهَا النَّفْسُ الطَّيِّبَةُ اخْرُجِي إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٍ، قَالَ: فَتَخْرُجُ تَسِيلُ كَمَا تَسِيلُ الْقَطْرَةُ مِنْ فِي السِّقَاءِ، فَيَأْخُذُهَا فَإِذَا أَخَذَهَا لَمْ يَدَعُوهَا فِي يَدِهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ حَتَّى يَأْخُذُوهَا، فَيَجْعَلُوهَا فِي ذَلِكَ الْكَفَنِ، وَفِي ذَلِكَ الْحَنُوطِ، وَيَخْرُجُ مِنْهَا كَأَطْيَبِ نَفْحَةِ مِسْكٍ، وُجِدَتْ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ، قَالَ: فَيَصْعَدُونَ بِهَا، فَلاَ يَمُرُّونَ، يَعْنِي بِهَا، عَلَى مَلإٍ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ، إِلاَّ قَالُوا: مَا هَذَا الرُّوحُ الطَّيِّبُ؟ فَيَقُولُونَ: فُلاَنُ ابْنُ فُلاَنٍ، بِأَحْسَنِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانُوا يُسَمُّونَهُ بِهَا فِي الدُّنْيَا، حَتَّى يَنْتَهُوا بِهَا إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَيَسْتَفْتِحُونَ لَهُ، فَيُفْتَحُ لَهُمْ فَيُشَيِّعُهُ مِنْ كُلِّ سَمَاءٍ مُقَرَّبُوهَا إِلَى السَّمَاءِ الَّتِي تَلِيهَا، حَتَّى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ، فَيَقُولُ

اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: اكْتُبُوا كِتَابَ عَبْدِي فِي عِلِّيِّينَ، وَأَعِيدُوهُ إِلَى الأَرْضِ، ﴿فَإِنِّي مِنْهَا خَلَقْتُهُمْ، وَفِيهَا أُعِيدُهُمْ، وَمِنْهَا أُخْرِجُهُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ قَالَ: فَتُعَادُ رُوحُهُ فِي جَسَدِهِ، فَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ، فَيَقُولانِ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: رَبِّيَ اللَّهُ، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا دِينُكَ؟ فَيَقُولُ: دِينِيَ الإِسْلاَمُ، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ؟ فَيَقُولُ: هُوَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَيَقُولاَنِ لَهُ: وَمَا عِلْمُكَ؟ فَيَقُولُ: قَرَأْتُ كِتَابَ اللَّهِ، فَآمَنْتُ بِهِ وَصَدَّقْتُ، فَيُنَادِي مُنَادٍ فِي السَّمَاءِ: أَنْ صَدَقَ عَبْدِي، فَأَفْرِشُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَأَلْبِسُوهُ مِنَ الْجَنَّةِ، وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إِلَى الْجَنَّةِ، قَالَ: فَيَأْتِيهِ مِنْ رَوْحِهَا وَطِيبِهَا، وَيُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ مَدَّ بَصَرِهِ، قَالَ: وَيَأْتِيهِ رَجُلٌ حَسَنُ الْوَجْهِ، حَسَنُ الثِّيَابِ، طَيِّبُ الرِّيحِ، فَيَقُولُ: أَبْشِرْ بِالَّذِي يَسُرُّكَ هَذَا يَوْمُكَ الَّذِي كُنْتَ تُوعَدُ، فَيَقُولُ لَهُ: مَنْ أَنْتَ؟ فَوَجْهُكَ الْوَجْهُ يَجِيءُ بِالْخَيْرِ، فَيَقُولُ: أَنَا عَمَلُكَ الصَّالِحُ، فَيَقُولُ: رَبِّ أَقِمِ السَّاعَةَ حَتَّى أَرْجِعَ إِلَى أَهْلِي وَمَالِي. قَالَ: وَإِنَّ الْعَبْدَ الْكَافِرَ إِذَا كَانَ فِي انْقِطَاعٍ مِنَ الدُّنْيَا، وَإِقْبَالٍ مِنَ الآخِرَةِ، نَزَلَ إِلَيْهِ مِنَ السَّمَاءِ، مَلاَئِكَةٌ سُودُ الْوُجُوهِ، مَعَهُمُ الْمُسُوحُ، فَيَجْلِسُونَ مِنْهُ مَدَّ الْبَصَرِ، ثُمَّ يَجِيءُ مَلَكُ الْمَوْتِ حَتَّى يَجْلِسَ عِنْدَ رَأْسِهِ، فَيَقُولُ: أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْخَبِيثَةُ، اخْرُجِي إِلَى سَخَطٍ مِنَ اللَّهِ وَغَضَبٍ، قَالَ: فَتُفَرَّقُ فِي جَسَدِهِ فَيَنْتَزِعُهَا كَمَا يُنْتَزَعُ السَّفُّودُ مِنَ الصُّوفِ الْمَبْلُولِ، فَيَأْخُذُهَا، فَإِذَا أَخَذَهَا لَمْ يَدَعُوهَا فِي يَدِهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ حَتَّى يَجْعَلُوهَا فِي تِلْكَ الْمُسُوحِ، وَيَخْرُجُ مِنْهَا كَأَنْتَنِ ﴿رِيحِ﴾ جِيفَةٍ وُجِدَتْ عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ، فَيَصْعَدُونَ بِهَا، فَلا يَمُرُّونَ بِهَا عَلَى مَلإٍ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ، إِلاَّ قَالُوا: مَا هَذَا الرُّوحُ الْخَبِيثُ؟ فَيَقُولُونَ: فُلاَنُ ابْنُ فُلاَنٍ، بِأَقْبَحِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانَ يُسَمَّى بِهَا فِي الدُّنْيَا، حَتَّى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَيُسْتَفْتَحُ لَهُ، فَلا يُفْتَحُ لَهُ، ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): ﴿لاَ تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ﴾، فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: اكْتُبُوا كِتَابَهُ فِي سِجِّينٍ فِي الأَرْضِ السُّفْلَى، فَتُطْرَحُ رُوحُهُ طَرْحًا، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ

فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ﴾، فَتُعَادُ رُوحُهُ فِي جَسَدِهِ، وَيَأْتِيهِ مَلَكَانِ فَيُجْلِسَانِهِ، فَيَقُولانِ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ، لاَ أَدْرِي، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا دِينُكَ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ، لاَ أَدْرِي، فَيَقُولاَنِ لَهُ: مَا هَذَا الرَّجُلُ الَّذِي بُعِثَ فِيكُمْ؟ فَيَقُولُ: هَاهْ هَاهْ،لاَ أَدْرِي، فَيُنَادِي مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ: أَنْ كَذَبَ فَافْرِشُوا لَهُ مِنَ النَّارِ، وَافْتَحُوا لَهُ بَابًا إِلَى النَّارِ، فَيَأْتِيهِ مِنْ حَرِّهَا وَسَمُومِهَا، وَيُضَيَّقُ عَلَيْهِ قَبْرُهُ حَتَّى تَخْتَلِفَ فِيهِ أَضْلاَعُهُ، وَيَأْتِيهِ رَجُلٌ قَبِيحُ الْوَجْهِ، قَبِيحُ الثِّيَابِ، مُنْتِنُ الرِّيحِ، فَيَقُولُ: أَبْشِرْ بِالَّذِي يَسُوءُكَ، هَذَا يَوْمُكَ الَّذِي كُنْتَ تُوعَدُ، فَيَقُولُ: مَنْ أَنْتَ؟ فَوَجْهُكَ الْوَجْهُ يَجِيءُ بِالشَّرِّ، فَيَقُولُ: أَنَا عَمَلُكَ الْخَبِيثُ، فَيَقُولُ: رَبِّ لاَ تُقِمِ السَّاعَةَ﴾ حديث صحيح.[١]

بەڕائی كوڕی عازیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەفەرموێ: لە بەقیعی غەرقەد لەسەر جەنازەیەك بووین مردوویێكمان دەناشت، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هاتە لامان، ئەو دانیشت، ئێمەش لە دەوری دانیشتین وەك باڵندەمان لەسەر سەری نیشتبێ، (ئەوە عادەتی مەجلیسی پێغەمبەر بووە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەوانە كە لە خزمەتی بوون عادەتیان وابوو زۆر بە ئارامییو ویقارو ڕێزەوە دانیشتوون) لەو كاتەدا كە ئێمە دانیشتبووین، نێو قەبرەكەی دەكۆڵدرا، لەو حاڵەتەدا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سێ جاران فەرمووی: پەنا دەبەمە بەر خوا لە سزاو ئەشكەنجەی گۆڕ، دوایی فەرمووی: ئینسانی بڕوادار كاتێك بەرەو دوارۆژ دەچێو لە دنیا دەپچڕێو ماڵئاوایی دەكات، چەند فریشتەیەك دێن بۆ لای وەك ڕۆژ لەسەر دەمو چاویان بێ (یانی هێندە درەوشاوەو گەشاوەن) كفنیان پێیە لە بەهەشتێوە هێناویانە، ئەو بۆنە خۆشەشیان پێیە (كە لەگەڵ كفن دایە بۆ ئەوەی مردوو بۆنی ناخۆش نەبێ، ئەویشیان هەر لە بەهەشتێوە هێناوە) بەو ئەندازەیەی كە چاو بڕ دەكات لەدوور ئەو مردووە دادەنیشن (كە خەریكی ڕووح

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٥٥٧) تعليق شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح رجاله رجال الصحيح ، وقال الهيثمي: رجاله رجال الصحيح، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٥٣)، وابْنُ مَنده برقم: (١٠٦٤)، وقال: هذا إسناد متصل مشهور رواه جماعة عن البراء وهو ثابت على رسم الجماعة، وَالْحَاكِم برقم: (١٠٧، ١٠٩، ١١٧)، وقال: صحيح على شرط الشيخين.

دەرچوونێیە) دوایی فریشتەی گیان کێشان لەلای سەری ئەو ئینسانە دادەنیشێ، پێی دەڵێ: ئەی ڕووحی پاكو خاوێن! ( چونكە ڕووحی ئینسان بە تاعەت پاك دەبێتەوەو بە گوناهان پیس دەبێ) وەرە دەرێ بەرەو ڕەزامەندیی خوا بڕۆ، ئنجا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: ئەو ڕووحە لەو بەدەنە دێتە دەرێ، وەك ئەو دڵۆپە ئاوەی كە لە زاری كوندەو مەشكە دێتە دەرێ (واتە: بە ئەسپایی)، فریشتەی گیان كێشان ئەو ڕووحە وەردەگرێ، ئنجا كاتێك ئەو ڕووحە لەو بەدەنە دەردێنێ، فریشتەكان لێناگەڕێن یەك تۆز لە دەستی دابێ، یەكسەر لێی وەردەگرنو لەو كفنەی كە لە بەهەشتێوە هاتوە، وە لەو بۆنە خۆشەیەوە دەپێچن، وەك خۆشترین بۆنی میسك كە لە ڕووی زەویدا هەیە، ئنجا فریشتەكان ئەو ڕووحە بەرز دەكەنەوە بەرەو سەرێ، بە لای هیچ كۆمەڵێك لە فریشتەكانی خوادا تێناپەڕن، مەگەر ئەو كۆمەڵە فریشتەیە دەپرسن: ئەو ڕووحە بۆن خۆشە كێیە؟ دەڵێن: ئەوە فلانی كوڕی[1] فلانە، بە خۆشترینو جوانترین ناو كە لە دنیادا ناویان دەبرد ناوی دەبەن، هەتا دەیگەیەننە ئاسمان ،داوای كرانەوەی دەرگای ئاسمانی بۆ دەكرێ، بۆی دەكرێتەوە، لەلایەن فریشتە زۆر لە خوا نێزیكەكانەوە لە ئاسماندا، ئەو ڕووحە پێشوازیی دەكرێ، بەرەو ئاسمانی دوای وی، (یانی هەر لە ئاسمانی یەكەمەوە ئەو فریشتانەی كە زۆر لە خواوە نزیكن ئەو ڕووحە پێشوازیی دەكەن، هەتا هەر حەوت ئاسمانەكان)، هەتا دەیگەیەننە ئاسمانی حەوتەم، خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ناوی ئەو بەندەیەی من لە تۆماری (عليِّين)دا بنووسن (یانی: ئەوانەی زۆر بەرزنو شوێنانیان زۆر بەرزە)، بەڵام جارێ ڕووحەكەی بگێڕنەوە بۆ زەوی،چونكە بەدەنی ئەوانمان لە زەوی دروست كردوەو هەر بۆ ئەوێشیان دەگێڕمەوە، هەر لە زەویشدا زیندوویان دەكەمەوەو دەریان دێنمەوە.

ئنجا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: ڕووحەكەی دەگێڕدرێتەوە نێو بەدەنەكەی، دوایی دوو فریشتە دێن بۆلای دایدەنیشێنن (بە جۆرە دانیشتنێك كە خوا بۆ

---

١) دیارە ئەگەر ئافرەتیش بێ دەڵێن: فلانەكەسی كچی فلانەكەسە، بەڵام كوڕەكە هی پیاوان بووە بۆیە وێنە بەپیاوێك هێنراوەتەوە.

خۆی دەزانیٚ چۆنە)، ئەو دوو فریشتە لێی دەپرسن پەروەردگارت کێیە؟ دەڵێ: پەروەردگاری من خوا (الله)یە، دەڵێن: ئەدی دین‌و بەرنامەت چی بووە؟ دەڵێ: دین‌و بەرنامەی ژیانی من ئیسلام بووە، دەڵێن: ئەدی ئەو پیاوەی لە نێو ئێوەدا ڕەوانە کرابوو کێیە؟ دەڵێ: ئەوە (موحەممەد) پێغەمبەری خوایە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، دەڵێن: ئەدی زانیاری تۆ چییە؟ چییت زانیوە؟ دەڵێ: کتێبی خوام خوێندۆتەوەو بەڕاستم زانیوە، (زانیاری من کتێب و بەرنامەی خوایە) بانگکەرێك لە ئاسمانێوە بانگ دەکات، دەڵێ: بەندەی من ڕاستی کرد، جێگای بۆ ڕابخەن لە بەهەشتیٚ و، پۆشاکی بەهەشتی لەبەر بکەن‌و دەرگایەکی لە بەهەشتێوە بۆ بکەنەوە، لە بۆنی خۆش‌و هەوای فێنکی بەهەشتی بۆ دیٚ، بە ئەندازەی ئەوە کە چاو بڕ دەکات، قەبرەکەی بۆ فراوان دەکات، (فراوان بوونێکی مەعنەویی نەك ماددیی)، ئنجا کابرایەك دیٚ بۆ لای ڕوویێکی گەش‌و جوانی هەیەو بۆنێکی خۆشی هەیەو پۆشاکێکی جوانی لەبەردایە، پێی دەڵێ: مژدەت لێبێ بەوەی کە پێی دڵ خۆش دەبی، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە تۆ پەیمان‌و بەڵێنت پیٚ درابوو، (ئەو ڕووحەش بەو پیاوە) دەڵێ: تۆ کێی، بێگومان ڕووی تۆ ڕووی کەسێکە کە خێر بە نێوچەوانییەوەیە؟! دەڵێ: من کردەوە چاکەکانی تۆم، (ڕووحەکە) دەڵێ: خوایە! قیامەتیٚ هەڵسێنە، تا بچمەوە نێو ماڵ‌و منداڵی خۆم ،پێیان شادبم لە بەهەشتدا، (ئەوە بە نیسبەت ئینسانی بڕوادارەوە بەو شێوەیە، ئاوا ڕووحی دەردەچیٚ‌و ئاوا لە گۆڕدا دەبیٚ).

بەڵام بە (پێچەوانەوە) بەندەی کافر لەکاتی پچڕان لە دنیاو ڕوو لە قیامەتدا، فریشتانێك دێنە لای لە ئاسمانێوە، دەم‌و چاویان ڕەشە بەرگی زبر (بووزوو)یان پێیە (یانی: هەندێك پەڕۆکییان پێیە) بۆن ناخۆش‌و ناشیرین، بە ئەندازەی چەشمەندازێك دوور لێی دادەنیشن، دوایی فریشتەی گیان کێشان دێتە لای سەری دادەنیشیٚ، پێی دەڵێ: ئەی نەفسی پیس! (بە هۆی گوناهو تاوان‌و لادان لە بەرنامەی خوا خۆت پیس‌و چڵکن کردوە) وەرە دەریٚ بەرەو تووڕەیی خوا، ڕووحەکەش لە نێو لاشەکەیدا شرووڕ دەبیٚ لە حەژمەتان، وەك چۆن کە ئاسنێکی بە قولاپ بە نێو خورییەکی تەڕدادیٚ، چۆن پارچە پارچەی دەکات‌و لەگەڵ خۆی دەیپچڕێنیٚ (ئەو ڕووحە ئاوا لەو بەدەنە دێتە دەریٚ‌و دەیپچڕێنیٚ) فریشتەی گیان کێشان ئەو ڕووحە وەردەگریٚ، ئەو فریشتانەی دیکە لێناگەڕێن چاو تروکانێك لە

دەستی فریشتەی گیان كێشاندابێ، ئنجا ئەو ڕووحە لەو بەرگە پیسەوە دەپێچرێو پیسترین بۆنو ناخۆشترین بۆنی لەگەڵدا بەرز دەبێتەوە، بەرزی دەكەنەوە، بە لای هیچ كۆمەڵێك لە فریشتەكان دا تێناپەڕن، مەگەر دەڵێن: ئەو بۆنە پیسە كێیە؟ بەناخۆشترینو ناشیرینترین ناو كە لە دنیادا بانگیان دەكرد، دەڵێن: ئەوە فلانی كوڕی فلانە، تا دەیگەیەننە ئاسمانی یەكەم، داوا دەكەن دەرگای بۆ بكرێتەوە، تا بەرز بێتەوە، بەڵام دەرگای لێناكرێتەوە، ئنجا پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾ الأعراف، واتە: دەرگاكانی ئاسمانیان بۆ ناكرێنەوە و، ناچنە بەهەشتێ، هەتا حوشتر لە كونی دەرزییەوە نەچێ، (یاخود هەتا پەتی ئەستوور لە كونی دەرزییەوە نەچێ)، {لێرەدا (ٱلْجَمَلُ) هەم بە مانای حوشتر دێ، هەم بە مانای پەتو گوریسی زۆر گەورە دێ كە كەشتی پێ ڕادەكێشن)، دیارە قەت حوشترو گوریسی گەورە لە كونی دەرزییەوە ناچن. كەواتە: ئەویش قەت ناچێتە بەهەشت} خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ناوی ئەو بەندە تاوانبارەو خراپەی من لە لیستی (سِجِّين)دا بنووسن، كە نزمترین شوێنە، ڕووحی فڕێ دەدرێتە وێ، دوایی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سەبارەت بە فڕێدانی ئەو ڕووحە پیسەش، ئەو ئایەتەی خوای خوێندەوە كەدەفەرموێ: ﴿ ...وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ﴾الحج، واتە: هەر كەسێك هاوەڵ بۆ خوای بڕیاردا، وەك ئەوە وایە لە ئاسمان بكەوێتە خوارێ، باڵندە ڕووحەكەی بگرنەوە (وەك چۆن مێشو مەگەزێك بە دەنووك دەگرن) یاخود فڕێ بدرێتە شوێنێكی زۆر قووڵەوە، دوایی ڕووحەكەی دەگێڕدرێتەوە نێو بەدەنی، دوو فریشتە دێنە لای دایدەنیشێنن، پێی دەڵێن: پەروەردگارت كێیە؟ هەر دەڵێ: هاه هاه نازانم!! (وەك ئینسانێكی لاڵ)، دەڵێن: ئەدی ئایینو بەرنامەت چی بوو؟ دەڵێ: هاه هاه نازانم، ئەدی ئەو پیاوەی لە نێو ئێوەدا ڕەوانە كرابوو كێیە؟ دیسان دەڵێ: هاه هاه نازانم، بانگكەرێك لە ئاسمانێوە بانگ دەكات، دەفەرموێ: درۆ دەكات، (یانی

دەیتوانی بزانێ، خواو پێغەمبەرو دینی خۆی بناسێ) شوێنێکی وەك ئاگری بۆ ڕاخەن، دەرگایەکی لە دۆزەخ لێ بکەنەوە، لە بای گەرمی دۆزەخی بۆ دێ، لە ژەهرو ژانی دۆزەخی بۆ دێ، قەبرەکەی لێوە تەنگ دێ، هەتا پەراسووەکانی تێکدەپەڕن، پیاوێك دێتە لای بە ڕووێکی ناشیرین و بەرگێکی ناشیرینەوەو، بۆنێکی ناخۆشی لێدێ، دەڵێ: موژدەت لێبێ بەوەی کە زۆرت پێ ناخۆشە، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە تۆ هەڕەشەت پێ لێدەکرا، دەڵێ: تۆ کێی؟ دەڵێ: من کردەوەی خراپی تۆم، دەڵێ: خوایە باجارێ قیامەت نەیەت (چونکە ئەوە جارێ هەر موناقەشەیە، دەبێ قیامەتەکە چۆن بێ!!).

ئنجا لە تێکڕاو سەرجەمی ئەو ئایەت و فەرموودانەی لە عالەمی بەرزەخ و مەسەلەی ڕووح دەدوێن، ئەوە دەفامرێتەوە کە ڕووح پێنج جۆرە پەیوەندیی هەن بە جەستەوە:

پەیوەندیی یەکەم: لە کاتێکدا کە ئینسان لە سکی دایکیدایەو کۆرپەیە، ڕووح پەیوەندییەکی تایبەتی هەیە بە بەدەنەوە.

پەیوەندیی دووەم: کاتێك منداڵ لە دایك دەبێ و دێتە سەر دنیا، ڕووح جۆرە پەیوەندییەکی دیکەی هەیە بە جەستەوە.

پەیوەندیی سێیەم: لە کاتی خەودا جۆری پەیوەندیی سێیەمە، ، چونکە لە کاتێکدا ئینسان دەنوێ، ڕووح هەم پەیوەندیی بە جیسمەوە هەیەو، هەم پەیوەندیشی نیە، واتە پەیوەندییەکی کەمتری هەیە لەوەی کە ئینسان بەخەبەرە.

پەیوەندیی چوارەم: لە کاتێکدا ئینسان دەمرێ و دەکەوێتە ژیانی بەرزەخ، لەوێشدا ڕووح پەیوەندییەکی دیکەی هەیە بەجەستەوە.

پەیوەندیی پێنجەم: کاتی زیندوو بوونەوەش، جۆرە پەیوەندییەکی دیکەیە کە پەیوەندیی پێنجەمە.

ئنجا بە کورتیی دەتوانین بڵێین: ئینسان سێ قۆناغی هەن:

١- قۆناغیی ژیانی دنیا. ٢- قۆناغی بەرزەخ. ٢- قۆناغی قیامەت.

١) لە قۆناغی ژیانی دنیادا، بەدەن بەسەر ڕووحدا زاڵە.
٢) لە قۆناغی بەرزەخدا، وا دیارە ڕووح دەسەڵاتی هەیە بەسەر بەدەندا.
٣) لە قۆناغی قیامەتێدا هەردووكیان وەك یەكن.

بۆیە سزای گۆڕ، یان نیعمەتی گۆڕ،تەماشا دەكەین هەستی پـێ نـاكرێ‌و بەرهەست (مَحْسوس) نیە، مەگەر خوای زاڵ و كاربەجێ، جار جار وەك موعجیزە پیشانی بدات بۆ دەرس‌و عیبرەت، ئەگەرنا ئێمە نایانبینین كە ئـەهلی نیعمـەتن، یـان ئـەهلی عـەزابن، چونكە زیاتر حاڵەتێكی ڕووحییە، بەڵێ بەدەنیش تێیدا بەشدارە، بەڵام زیـاتر ڕووحییـە، دەتوانین مەسەلەی عەزاب،یان نیعمەتی قەبر، ئاوا ڕوون بكەینەوە:

دوو كەس لـە لای تـۆ دەخـەون، یـەكێكیان بەزەردەخەنـەوەو بـە دڵێكـی خۆشـەوە هەڵدەستێ ،دەڵێ: سبحان الله، خەونێكی خۆشم دی: چوومە بەهەشـتێ ئـەوەم خـواردو ئەوەم دیت‌و ئەوەم خواردەوەو ئاواو ئاوا، ئەوی دیكەش بـە وەزعێكـی شـپرزەوە دەڵـێ: باشبوو خەبەرم بۆوە، خەونێكی ناخۆشم دی، دەڵێی: چی بوو؟ دەڵێ: لە خەونم دا بردمیانە دۆزەخێ‌و ئاواو ئاوا بوو...هتد، هەردووكیان لە پەنای تۆ خەوتوون‌و، هیچ شوێنەوارێك لە بەدەنیان دەرناكەوێ، بەڵام یەكێكیان لە خۆشییەكی زۆر خۆشدا بـووەو حـەزی نـەكردوە بەخەبەر بێ، ئەوی دیكەشیان بە پێچەوانەوە لـە ناخۆشییـەكی زۆر ناخۆش دا بووەو حەزی كردوە زوو بەخەبەر بێ.

جاری وا هەیە ئینسان خەوی خۆش، یان ناخۆش دەبینێ، شوێنەواری لەسەر بەدەنیشی دەردەكەوێ، من بۆ خۆم جارێك بەڕۆژوو بووم، زۆر برسیبووم‌و زۆر تینوو بووم لە شوێنی وا كە لە ماڵەوە نەبووم، خەوتم ، لە خەونمدا خواردنم خوارد، هەتا بەربانگیش برسیەتی‌و تینوێتییم نەمابوو، جـاری واش هەیـە ئینسـان خـەونی نـاخۆش دەبـینێ، چـەند ڕۆژان شوێنەواری ئەو خەونە ناخۆشە لەسەر بەدەن‌و دەم‌و چاوی هەر دەمێنێ.

كەواتە: پاداشت‌و سزای گۆڕیش ئاوایە، زیـاتر بـۆ ڕووحـە، بـەڵام بـەدەنیش تێیـدا بەشدارە.

## باسی ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشتی

ئنجا دێته سەر بابەتی سێیەم‌و کۆتایی لە هەردووك خاڵی: (٨٢و٨٣)دا ئاماژە بە کۆمەڵێك شت دەکات کە هەموویان پەیوەستن بە ڕۆژی دوایی‌و، پێشم وا نیە هیچ کەسێك لە مسوڵمانان هەبێ‌و بووبی کە مشت‌و مڕ لەبارەی هیچ کام لەو شتانەوە بکات، دەڵێ:

> ٨٢) ( وَنُؤْمِنُ بِالْبَعْثِ وَجَزَاءِ الأَعْمَالِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَالْعَرْضِ وَالْحِسَابِ، وَقِرَاءَةِ الْكِتَابِ، وَالثَّوَابِ وَالْعِقَابِ، وَالصِّرَاطِ وَالْمِيزَانِ ):

واتە: بڕوا دێنین بە زیندوو کرانەوە، بڕوا دێنین بە پاداشتی کردەوەکانمان لە ڕۆژی دواییدا کە ئێمە ڕادەنوێنرێین‌و دەخرێینە ڕوو، وە بڕوامان هەیە بە لێپرسرانەوەو بە خوێندنەوەی نامەی کردەوە، وە بڕوامان هەیە بە پاداشت‌و سزا، هەروەها بە سیڕات، (ئەو پردەی لەسەر پشتی دۆزەخ ڕادەنوێنرێ‌و دەبێ هەموو کەس بەسەریدا تێپەڕ بێ)، بڕوامان هەیە بە تەرازوو ( کە چاکەکان‌و خراپەکانی پێ هەڵدەسەنگێنرێن).

لەو بارەشەوە هەم دەقی قورئان زۆرن، هەم فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم):

١- خوا (جل جلاله) لە سورەتی (الحاقة)دا دەفەرموێ: ﴿ فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ﴿١٦﴾ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَآ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا کارەساتی

هەرە گەورەو دڵ تەزێن ڕوودەدات، ئاسمان شەق‌و پەق دەبێ‌و، لەو ڕۆژەدا ئاسمان زۆر

بێهێزو شەقار دەبێ، فریشتەكانیش لە كەلێنی ئاسمانێدا خۆ دەگرنەوە، لەو ڕۆژەدا هەشت، بارەگای خوا هەڵدەگرن، (هەشت فریشتە، هەشت مەخلووق)، لەو ڕۆژەدا ڕادەنوێنرێن، هیچ كەسێ هیچ شتی (لە خوای پەروەردگار) پەنهان نابێ.

٢- لە سوورەتی (الإنشقاق)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ۝٦ ﴾، واتە: ئەی ئادەمیزاد! تۆ دەبێ ڕەنج بدەی‌و خۆت ماندووبكەی، تا دەگەیە پەروەردگارت.

٣- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ۝٧ فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا ۝٨ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا ۝٩ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ۝١٠ فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ۝١١ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ۝١٢ إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ۝١٣ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ۝١٤ بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا ۝١٥ ﴾ واتە: هەر كەسێك نامەی كردەوەكانی بە دەستی ڕاست وەرگرێتەوە (یانی: ئینسانێكی ڕاست بووە)، ئەوە لێپرسینەوەیەكی ئاسانی لەگەڵدا دەكرێ، دەگەڕێتەوە نێو ماڵ‌و منداڵی‌و كەس‌و كاری زۆر بە دڵخۆشیی، هەر كەسێك نامەی كردەوەكانی لە پشتەوەڕا وەربگرێتەوە، لەمەو دوا بە ئاوات دەخوازێ لە بەین بچێ‌و نەمێنێ، دەخرێتە نێو كڵپەی دۆزەخەوە، چونكە ئەو لە نێو ماڵ‌و منداڵ‌و كەس‌و كاری خۆیدا زۆر دڵخۆشبوو (لە دنیاداو زۆر بە خۆی دەنازی) گومانی وابوو ناگەڕێتەوە بۆ لای خوا، با، چونكە پەروەردگاری بینەری بوو، (زۆر پێی ئاگادارو شارەزا بوو).

٤- ئنجا بوخاریی لە صەحیحەكەیدا لە دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: { لَيْسَ أَحَدٌ يُحَاسَبُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ هَلَكَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَلَيْسَ قَدْ قَالَ اللهُ تَعَالَى فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيراً؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّمَا ذَلِكِ الْعَرْضُ وَلَيْسَ أَحَدٌ يُنَاقَشُ الْحِسَابَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ عُذِّبَ} حديث صحيح.[1]

---

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي برقم: (٦١٧٢).

واتە: هیچ کەسێك نیـە لێپرسـرانەوەی لەگـەڵ بکـرێ لـە قیامـەت دا، مەگـەر دەفەوتێ، (دایکمان عائیشە دەڵێ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەدی ئـەوە نیـە خوای بەرز دەفـەرموێ: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا ﴿٨﴾ ﴾، ئەوەی بـە دەسـتی ڕاسـت نامـەی کردەوەکـانی بدرێتـەوە، ئـەوە لێپێچینەوەیەکی ئاسانی لەگەڵدا دەکرێ؟ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّم) فەرمووی: ئەوە هەر ڕانواندنە، ئەگەرنا هەر کـەس ڕۆژی قیامـەت لێپێچـینەوەی لەگەڵدا بکرێ، مسۆگەر تووشی سزا دەبێ.

*****



## باسێك دەربارەی پردی سەر پشتی دۆزەخ (الصراط):

دیارە ئێمە لەنێو كوردەوارییی دا (پردی سیڕات)ی پێدەڵێین و لێرەش وەك پوختەیەك لەبارەیەوە دەڵێین: هەموو ئینسانەكان دوای ئەوەی كەحیساب و كتابیان لەگەڵدا دەكرێ، جا چ بەدەستی ڕاست نامەی كردەوەكانیان وەربگرنەوە، چ بەدەستی چەپ، واتە: چ بەهەشتیی بن، چ دۆزەخیی، دەبێ هەر هەموویان بەسەر پردێكیدا تێپەڕن، كە بەسەر پشتی جەهەننەمێ ڕاهێڵراوە، لە فەرموودەكانی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە وشەی (صراط) یان وشەی (جِسر) ناوی هاتوە، لە صەحیحی بوخاریی دا هاتوە كە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرمویٚ: { يَخْلُصُ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ }حديث صحيح[1] واتە: بڕواداران لە ئاگر ڕزگاریان دەبێ، ئنجا دیارە بڕواداران ناچنە دۆزەخەوە، بۆیە مەبەست لە ڕزگار بوون لە ئاگر، یانی: لەو پردە دەربازیان دەبێ كە بەسەر جەهەننەم ڕاهێڵراوە، ئەمەش چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەبارەی ئەو پردە ترسناكەوە:

١- { ثُمَّ يُوضَعُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَيْ جَهَنَّمَ وَالانْبِيَاءُ بِنَاحِيَتَيْهِ قَوْلُهُمْ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ}حديث صحيح[2]، واتە: پاشان پرد (صراط) بەسەر پشتی دۆزەخ ڕادەهێڵرێ و، پێغەمبەرانیش لەم لاو لای پردەكەن (ئەمسەرو ئەوسەری)، قسەیان ئەوەیە: خوایە! سەلامەت بكە، سەلامەت بكە، خوایە! سەلامەت بكە، سەلامەت بكە.

٢- { ثُمَّ يُؤْتَى بِالْجِسْرِ فَيُجْعَلُ بَيْنَ ظَهْرَيْ جَهَنَّمَ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَمَا الْجِسْرُ؟! قَالَ: مَدْحَضَةٌ[3] مَزِلَّةٌ[1] عَلَيْهِ خَطَاطِيفُ وَكَلَالِيبُ، وَحَسَكَةٌ

---

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي برقم: (٢٤٤٠).

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١١٤٣)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

٣) دَحَضَتْ رِجْلَهُ: زَلِقَتْ. مختار الصحاح، ص١٨٦، لفظ: د ح ض. دَحَضَت: خليسكا.

مُفَلْطَحَةٌ لَهَا شَوْكَةٌ عُقَيْفَاءُ[٢] تَكُونُ بِنَجْدٍ يُقَالُ لَهَا السَّعْدَانُ، الْمُؤْمِنُ عَلَيْهَا كَالطَّرْفِ وَكَالْبَرْقِ وَكَالرِّيحِ وَكَأَجَاوِيدِ الْخَيْلِ وَالرِّكَابِ فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ وَنَاجٍ مَخْدُوشٌ وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ حَتَّى يَمُرَّ آخِرُهُمْ يُسْحَبُ سَحْبًا}حديث صحيح[٣] واتە: دوایی پرد دەهێنرێ بەسەر پشتی دۆزەخ ڕادەهێڵرێ، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! پرد چیە؟ فەرمووی: لـووسو خلیسکە، قولاپی پانی پێوەن، دڕکێکی بە قۆرتی پێوەیە، کە ئەوجۆرە دڕکە بەقولاپە لە نەجد دەبێ، پێیدەگوترێ: (سەعدان).

ئنجا بڕوادار بەسەر دۆزەخ دا ڕەت دەبن، هەیانە وەك چاو تروووكانو، هەیانە وەك تیشـكو، هەیانـە وەك (بـا) و هەیانـە وەك ئەسـپو وڵاخـی خێـرا، ئنجـا هەیـە بەسەلامەتیی دەرباز دەبێو، هەیە بەڕووشاوییو، هەیشە دەكەوێتە ئاگری دۆزەخەوە، هەتا دواكەسیان دەڕوات بە ڕاكێشران ڕادەكێشرێ.

٣- { وَيُضْرَبُ جِسْرٌ عَلَى جَهَنَّمَ قَالَ النَّبِـيِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يُجِيزُ وَدَعْوَى الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ وَبِهَا كَلَالِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ هَلْ رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَانِ، قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ غَيْرَ أَنَّهُ لا يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَـمِهَا إِلاَّ اللهُ تَعَالَى فَتَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ فَمِنْهُمْ الْمُوبَقُ بِعَمَلِهِ وَمِنْهُمْ الْمُخَرْدَلُ ثُمَّ يَنْجُو }حديث صحيح.[٤] كە ئەمیش مانای وەك هی پێشوویە.

٤- { يَرِدُ النَّاسُ النَّارَ كُلُّهُمْ ثُمَّ يَصْـدُرُونَ عَنْهَـا بِأَعْمَـالِهِمْ } حـديث صـحيح.[٥]، واتــە: خەڵـك دەچنە سوێی ئـاگر (ی دۆزەخ)، بەڵام دوایی بە كردەوەكانیان لێی قوتار دەبن.

١) الـمَزَلَّة والـمَزِلَّة: الـمكان الدَّحْضُ وهو موضع الزَّلَل. مختار الصحاح، ص ٢٤٩، لفظ: ز ل ل. الـمَزِلَّة: شوێنی خلیسكان.

٢) عقف (التعقيف) التعويج: چەماندنەوەو كەوانەیی لێكردنی شـتێك، مـختـار الصـحاح، ص٣٩٢، لفظ: ع ق ف.

٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِي برقم: (٧٠٠١)، وإبنُ حِبّان برقم: (٧٣٧٧).

٤) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١١٤٣)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

٥) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤١٤١)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

شایانی باسیشە، زۆر لە زانایان ئەم دوو ئایەتە وا تەفسیر دەكەن كە مەبەست پێیـان ئەو پردەیە: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾ مریم. واتە: هیچ كامێكتان نیە، كـە نەچـێتە سـوێی (قەراغ ئاگری دۆزەخ) ئەمە بڕیارێكە پەروەردگارت بڕیویەتەوە، پاشان پارێزكاران قوتـار دەكەین‌و ستەمكارانیش لەسەر چۆكان ( لەسەر ئەژنۆیان) لەوێدا (لـە دۆزەخ دا) بـەجێ دەهێڵین.

هەرچەندە زۆرێك لە توێژەرەوانی قورئان، وشـەی (وارِدهـا)یـان لـێ ئیشـكال بـووەو گوتوویانە: بەمانای (داخِلُهـا)یە، بەو پێیەش بێ ئیمانـدارانیش هـەموویان دەچـنە نێـو دۆزەخەوەو، دوایی دەرباز دەبن!

بەلاّم لە ڕاستیدا هیچ ئیشكالێك لەئارادا نیە، چونكە وشەی (وَرَدَ) بـەمانای (دَخَـلَ) هاتە نێوی، نیە، بەڵكو بــــەمانای هاتە سوێی، هاتە قــــەراغی، (لێی نیزیك بۆوە)یـــە بەبەڵگەی:

١/ خوای كاربەجێ لەبارەی مووساوە (علیه السلام) كە چووە لای گەلی مەدیەن‌و ئاژەڵی دوو ئافرەتەكەی ئاودا، فەرموویـەتی: ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ النَّاسِ يَسْقُونَ ... ﴿٢٣﴾ ﴾ القصص، ئاشكراشە لێرە ناگونجێ (وَرَد) بە (دَخَل) لێك بدرێتەوە ، چونكە مووسا نەچووە نێو ئاوەكە، بەڵكو چووە نێزیك‌و سوێی ئاوەكە.

٢/ لە (المُعجم الوسیط)دا هاتوە: (وَرَدَ يَرِدُ وروداً: حَضَرَ... وَورَد فُلانٌ علی المَكان: أَشْرَفَ عَلَيْهِ دَخَلَهُ أَو يَدْخَلْهُ) ص١٠٢٤. وەك دەبینین (وَرَدَ)ی بە: ئامـادەبوو، وەچـووە سـەر سوێی، بەسەریدا ڕوانی، لێك داوەتەوە.

ئنجا لەبارەی تێپەڕبوونی ئەهلی ئیمان بەسەر پرد (جِسر)ی سـەر پشـتی دۆزەخ دا، بێئەوەی تووشی زیان بن، بگرە تەنانەت هەستیشی پێ بكەن ئەم دەقە هەیە:

{ إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ قَالوا: أَلَمْ يعدنا رَبُّنَا الوُرود عَلَى النَّارُ؟ قَالَ: بَلَى، مَرَرْتُمْ عَلَيْهَا وَهِيَ خَامِدَةٌ} حديث صحيح.(١) واتە: دوای ئەوەی بەهەشتییەکان چوونە بەهەشتەوە گوتیان: پەروەردگارمان! ئەدی بەڵێنت پێنەدابووین، کە بچینە سوێی ئاگر؟ فەرمووی: با، بـەڵام ئێوە بەسەریدا ڕەت بوون ئەو خامۆش بوو.

شایانی باسیشە لەبارەی پرد (صراط)ەوە ئەم شوێنەوار (أثر)ە هاتوە: {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدري بَلَغَنِي أَنَّ الْجِسْرَ أَدَقُّ مِنَ الشَّعْرَةِ وَأَحَدُّ مِنَ السَّيْفِ} رواه مسلم: ١٨٣.

واتە: پێم گەیشتووە کە ئەو پردە لە موو باریکترو لە شمشێر تیژترە.

کە بێگومان مەبەست پێی حاڵەتی پەڕینەوەی کافرانو گوناهبارانی دەرباز نەبوویە، کە ناتوانن لەسەری بپەڕنەوە.

هەروەها (عبدالله بن يوسف الجديع) گوتوویەتی هەندێك فەرموودەش لەو بارەوە هەن کە تێکڕایان ئەو مانایە دەگەیەنن. بڕوانە: (تيسير علم أصول الفقه) ص ١٤٢.

خوا بە لوطفو کەرەمی بێ سنووری خۆی، سـەربەرزانە دەربازمـان بکـاتو لـەئاگر چەپاڵەمان بدات.

******




١ ) أَخْرَجَهُ أَبْنُ أبي شيبة برقم: (٣٦٥٧٨) عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ موقوفاً.

## ئێستا بەهەشت و دۆزەخ هەن و لەبەینیش ناچن

لە خاڵی (٨٣)ش دا باسی ئەو ڕاستییە دەكات، كە ئێستاكە بەهەشتو دۆزەخ هەنو چاوەڕێی خەڵكی خۆیان دەكەن، دەڵێ:

٨٣) ( وَالْجَنَّةُ وَالنَّارُ مَخْلُوقَتَانِ، لا تَفْنَيَانِ أَبَدًا وَلا تَبِيدَانِ، وَإِنَّ اللهَ تَعَالَى خَلَقَ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ قَبْلَ الْخَلْقِ، وَخَلَقَ لَهُمَا أَهْلاً، فَمَنْ شَاءَ مِنْهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ فَضْلاً مِنْهُ، وَمَنْ شَاءَ مِنْهُمْ إِلَى النَّارِ عَدْلاً مِنْهُ، وَكُلٌّ يَعْمَلُ لِمَا قَدْ فرِغَ لَهُ، وَصَائِرٌ إِلَى مَا خُلِقَ لَهُ ):

واتە: بەهەشتو ئاگری دۆزەخ ئێستا دروستكراون، نافەوتێنو لەبەین ناچن، خوا بەرلەوەی خەڵك دروست بكات، بەهەشتو دۆزەخی دروست كردوونو، خەڵكێكیشی بۆ درووست كردوون، ئنجا هەركەسێكیانی ویست، بەبەخششی خۆی دەیباتە بەهەشتو، هەركەسێكیشیانی ویست، بەدادگەریی خۆی دەیباتە دۆزەخ،هەركام لە بەندەكان بۆ شوێنێك كار دەكات، كە بڕیاری بۆ دراوەو بەرەو ئەو شوێنە دەچێ كە بۆی دروستكراوە.
ئەوە ڕای زۆربەی زانایانی لەسەرە، بەڵكو دەتوانین بڵێین: تێكڕای زانایانی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەسەر ئەوەن، كە ئێستا بەهەشتو دۆزەخ دروست كراون، ئایەتو فەرموودەش لەو بارەوە زۆرن، خوای پەروەردگار لە چەند شوێنان، كە باسی بەهەشت دەكاتو دەفەرموێ: بەهەشت ئاوایەو ئاوایەو دەفەرموێ: ﴿ ...أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ١٣٣ ﴾ آل عمران، بۆ پارێزكاران ئامادەكراوە. لە چەند شوێنان خوای دادگەر دەفەرموێ: دۆزەخ

ئاوایەو ئاوایە، دوایی دەفەرموێ: ﴿... أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾ البقرة، بۆ کافران سازکراوە و پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە چەندان فەرموودەدا، بە تایبەت لە شەوی میعراج دا باس دەکات کە بەهەشتو دۆزەخی بینیون، بۆ وێنە: یەکێ لە فەرموودەکان کە (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوەو ئێمە شوێنی مەبەستی لێ وەردەگرین، ئەمەیە:

{ عن عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُ: ... قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلْتَ شَيْئًا فِي مَقَامِكَ، ثُمَّ رَأَيْنَاكَ كَعْكَعْتَ، فَقَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ فَتَنَاوَلْتُ عُنْقُودًا، وَلَوْ أَصَبْتُهُ لأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتِ الدُّنْيَا، وَأُرِيتُ النَّارَ فَلَمْ أَرَ مَنْظَرًا كَالْيَوْمِ قَطُّ أَفْظَعَ، وَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ، قَالُوا: بِمَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: بِكُفْرِهِنَّ قِيلَ: يَكْفُرْنَ بِاللهِ قَالَ: يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، وَيَكْفُرْنَ الإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ كُلَّهُ، ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ} حديث صحيح[1]. واتە: ... گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! بینیمان لەشوێنی خۆتەوە دەستت بۆ شتێك برد، دوایی دەستت کێشایەوە؟ فەرمووی: بەهەشتم بینیو دەستم بۆ هێشوویەك (ترێ) برد، ئەگەر لێم کردبایەوە، هەتا دنیا دنیا بوو لێتان دەخوارد، وە ئاگر (ی دۆزەخ)م پێشان درا، هەرگیز ئەو دیمەنەی ئەمڕۆ بینیم، دیمەنی وا سامناکم نەدیوە، بینیم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتان بوون، گوتیان: بەهۆی چییەوە، ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەهۆی ناسپاسییانەوە، گوتیان: بەرانبەر بەخوا ناسپاسن؟ فەرمووی: بەرانبەر بەمێرد سپڵەنو، لەبەرانبەر چاکەدا ناسپاسن، ئەگەر بەدرێژایی تەمەنت چاکە لەگەڵ یەکیاندا بکەی، دوایی شتێکت لێ ببینێ، دەڵێ: هەرگیز چاکەم لێت نەدیوە.

کەواتە: بەهەشتو دۆزەخ ئێستا هەن، بەڵام ئایا لە کوێن؟ ئەوە بەس خوا بۆ خۆی دەزانێ. ئنجا (طەحاویی) دەڵێ: ئەو بەهەشتو دۆزەخەش کە ئێستا هەنو دروست کراون، لە نێوچوونو فەنابوونیان بەسەردانایەت، کەچی هەندێك لە زانایان هەندێك دەق دێننەوە کە گوایە بەهەشتو دۆزەخ کاتێك دێ لە بەین دەچن، یان دەڵێن: لە کاتی بوونەوەر

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٧١١)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (١٠٠٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٩٠٧).

تێکچووندا، ئەوانیش لەبەین دەچن، بۆ وێنە: ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الرحمن، واتە: هەرچی کە لەسەر زەوییە لەبەین دەچێ، بەڵام ڕووی پەروەردگارت دەمێنێتەوە.

بەڵام بێگومان ئەو ئایەتە بەبەڵگەی ئەو مەبەستە ناشێ، چونکە خوای بێ وێنە لێرەدا باسی خەڵکی سەر زەوی دەکات، دیارە هەندێك بەڵگەی دیکەش هەن، بەڵام دەڵێین: بەڵگەکان مەبەست پێیان نێو بازنەی بوونەوەرە، بەڵام بەهەشتو دۆزەخ لە دەرەوەی جوغزی بوونەوەرن.

ئنجا سەبارەت بەوە کە ئایا بەهەشتو دۆزەخ خۆیانو دانیشتوانیان بۆ هەمیشە دەمێننەوە، یان نا؟

دەڵێین: جارێ سەبارەت بە بەهەشت، جگە لە هەندێ پیرو تاقمی ڕیزپەڕ (شاذ) کە ئێستا نەماون، پێیان وابووە بەهەشتو ئەهلی بەهەشتیێو، دۆزەخو ئەهلی دۆزەخیێ هەموو لە بەین دەچن، تەنیا خوا سبحانه وتعالی دەمێنێتەوە، ئەگەرنا هەموو زانایان ئێستاو ڕابردووش لەسەر ئەوە یەکدەنگن ، دەمێنێو بەهەشتییەکان کە بەهەشت تێیدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی، چونکە خوای پەروەردگار لە زۆر شوێنی قورئاندا دەفەرموێ: خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ... ﴿٥٧﴾ ﴾النساء، واتە: تێیدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی، هەتا هەتایە، بەڵام بە نسبەت دۆزەخەوە، هەندێ لە زانایانی ئیسلام، ئێستاش هەن بۆچوونیان وایە دەڵێن: کاتێك دێ دۆزەخ لەبەین دەچێو نامێنێو، دۆزەخییەکانیش دەچنە بەهەشت، هەندێکیش ڕایان وایە، کە دۆزەخو دانیشتوانەکەی هەموویان لەبەین دەچن، دیارە چەند شتێکیش بەبەڵگە دێننەوە، بەڵام ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر بکەین (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کە دەڵێن: بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوەو لێی نایەنە دەرێ، ئەو ئایەتو فەرموودانە ئەو قسەیە بەرپەچ دەدەنەوە.

ئنجا طەحاویی دەڵێ: (وَإِنَّ اللهَ تَعَالَى خَلَقَ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ قَبْلَ الْخَلْقِ)، خوای بەرز بەهەشتو دۆزەخی پێش دروستکراوەکانی دروست کردوون، (وَخَلَقَ لَهُمَا أَهْلاً)، دانیشتوانیشی بۆ دروست کردوون، ئەهلێکیشی بۆ دروست کردوون، هەم بۆ بەهەشتێ هەم بۆ دۆزەخ، (فَمَنْ شَاءَ مِنْهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ فَضْلاً مِنْهُ، وَمَنْ شَاءَ مِنْهُمْ إِلَى النَّارِ عَدْلاً مِنْهُ) هەر کەسێك خوا بیەوێ بۆ بەهەشتی بەرێ دەکات، لە چاکەو بەخششی خۆیەوە، هەر کەسێکیش خوا بیەوێ بۆ دۆزەخی وەردەچەرخێنێو بەرێی دەکات، بە دادگەریی خۆی. (وَكُلٌّ يَعْمَلُ لِمَا قَدْ فَرغَ لَهُ)، هەر کامێکیش لە بەهەشتییانو دۆزەخییان، کارێك دەکات کە بڕاوەتەوەو بڕیاری لەسەر دراوەو کۆتایی پێهاتوە، (وَصَائِرٌ إِلَى مَا خُلِقَ لَهُ) بۆ ئەو شوێنە دەچێ کە بۆی دروست کراوە.

دیارە لێرەدا جارێکی دیکە مەسەلەی قەزاو قەدەر دێنێتەوە پێشێ، کە پێشتر بە درێژیی باسمان کردوەو، پێویست ناکات دووبارەی بکەینەوەو هەر بە کورتی لێرەدا دەڵێین: کە دەڵێ: خوا عزوجل بەهەشتو دۆزەخی دروست کردوونو ئەهلێکیشی بۆ دروست کردوون، ئەوە جەبر ناگەیەنێو ئەوە ناگەیەنێ کە ئەو خەڵکەی خوای پەروەردگار بۆ بەهەشتی دروست کردوون، هیچ ویستو ئازادییەکیان نیە، یان ئەوەی بۆ دۆزەخی دروست کردوون، هیچ هەڵبژاردنێکیان بۆ نیە، چونکە ئەوە جەبرەو گوتیشمان کە عەقیدەی ئیسلامییش عەقیدەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، کە عەقیدەی ڕاستەقینەی ئیسلامییە، لە نێوان ئەهلی جەبرو ئەهلی قەدەردایە، قەدەرییەکان (موعتەزیلەکان) دەڵێن: ئینسان بۆ خۆی کردەوەکانی خۆی دەخوڵقێنێو دروستکەری کردەوەکانی خۆیەتی، خوا ئیرادەی نەکردوە، ئینسان خراپە بکات، بەڵکو ئینسان بۆ خۆی ئیرادەی ئەو کردەوە خراپەیەی کردوەو بۆ خۆی دەیخوڵقێنێ، بەو جۆرە وەك پێشتر گوتمان لە دەسەڵاتو ویستی خوا تەسك دەکەنەوە، بە حیسابی خۆیان بۆ ئەوەی دیفاع لە دادگەریی خوا بکەن، جەبرییەکانیش لە بەرانبەری واندا دەڵێن: نەخێر، ئینسان نەك هەر بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆی نیە، بەڵکو بکەری کردەوەکانی خۆشی نیەو، هەر بەدەستیشیان ناهێنێ، بەڵکو خوا کردەوەکانی بۆ دەخوڵقێنێو ئینسان هیچ دەستی تێدا نیە، ئنجا خوا

لەسەر خراپەکانی عەزابیشی دەدا، لەبەر ئەوەی موڵکی خۆیەتی، جەبرییەکان بۆ ئەوەی دیفاع لە دەستەڵاتو ویستی خوا بکەن، لە زەینی خۆیاندا زیانیان بەدادگەریی خوا گەیاندوە، بەڵام ئەهلی سوننەتو جەماعەت، کە لەسەر خەتی پێغەمبەرو هاوەڵانیو خەلیفە ڕاشیدەکانن، تەمەشای هەموو ئایەتو فەرموودەکان دەکەنو خەتی ناوەڕاست هەڵدەبژێرن، دەڵێن: نا، ئینسان وا نیە، کە بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆی بێ، چونکە (خالق) بەس خوا (الله)یە ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ ... ﴿٦٢﴾ ﴾ الزمر، وە واش نیە، کە جەبرییەکان دەڵێن ئینسان دەستە پاچەبێ.

ئێمە لە ڕابردوودا لەو بارەوە بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست نموونەیەکمان هێنایەوە لێرەشدا بە پێویستی دەزانم بیهێنمەوە:

وا بێنینە پێش چاوی خۆمان کورسییەکی کارەبایی هەبێ پلاکەکەی بە دەستی کەسێکەوە بێت بڵێ: وەرە با سوکانی کورسییەکە بە دەستی تۆ بێ، من پلاکەکەت بۆ پێدەکەمو بە ویستی خۆت کوێت بوێ بچۆ، من بەس پلاکی کورسییەکەت بۆ پێدەکەم، پێشی بڵێ: وە ئەگەر بچی بۆ شوێنی چاك، پێم خۆشەو سوپاسیشت دەکەمو پاداشتیشت دەدەمەوە، ئەگەر بچی بۆ شوێنێکی خراپ، پێم ناخۆشەو تووڕە دەبمو سزاشت دەدەم، بەڵام ڕێگاشت لێناگرم، تۆ کە سوکانی کورسییەکەت بە دەستە، ئەگەر بچی بۆ شوێنێکی خراپ، دوایی ناتوانی بڵێی: بەدەست خۆم نەبوو، یان کە چووی بۆ شوێنێکی باش ناتوانی بڵێی: ئازایەتیی منی تێدا نەبوو، ژیانی ئینسان ئاوایە، خوای بە بەزەیی ئێمەی خوڵقاندوەو هەردوو ڕێگاکەی بە ئێمە پێشانداون، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ ﴿١٠﴾ ﴾ البلد، یان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ ﴾ الإنسان، دەتوانێ هەردووکیان بێ، هەم سوپاسگوزاربێ، هەم دەش توانێ سپڵەو بێ ئەمەك بێ، بەڵام هەردوولای کە لە تواناداا هەن، لەبەر ئەوەیە، کە خوای پەروەردگار ویستی وابووەو یارمەتی دەدات، نەك خوا نەیویستبێ!.

# كۆتا باس
# لەبارەی قەدەرو
# هەندێك لە وردەكارییەكانیەوە

جارێكی دیكەش (طەحاویی) (خوا لێی خۆش بێ) دەگەڕێتەوە سەر باسی بابەتی قەدەرو پێنج خاڵی: (٨٤–٨٨ )ی بۆ تەرخان دەكاتو دەچێتە نێو هەندێك لە وردەكارییەكانییەوە كە یەكەمجارە باسیان بكات، ئێمەش هەر تێبینیو سەرنجێكمان لەبارەی هەر قسەو بۆچوونێكییەوە هەبێ، وەك عادەتی خۆمان لەم كتێبەدا - كە دەرفەتی زۆر پێوەچوونمان نیە- بەكورتییو گوشراویی دەیانخەینە ڕوو، سەرەتا دێتە سەر خاڵی (٨٤) و، دەڵێ:

**٨٤) ( وَالْخَـيْـرُ وَالشَّـرُّ مُقَـدَّرَانِ عَلَـى الْـعِـبَادِ ):**

واتە: خێرو شەڕ چاكەو خراپە، بڕیاردراونو ئەندازەگیریی كراون بۆ بەندەكان. یـانی: لەهەربووەوە خوای پەروەردگار چـاكەو خراپـە، خێـرو شـەڕ، خۆشـییو ناخۆشـیی، بـۆ بەندەكانی بڕیار داون، بەڵام بە هەڵبژاردنی خۆیان، بۆ وێنە: خوا بڕیاری داوە لە هەربووەوە كە من ئەم دەرسە دەڵێمەوە، بەڵام بۆچی وای بڕیار داوە؟ چونكە لە ئەزەلەوە زانیویـەتی كە من بە ویستو هەڵبژاردنی خۆم، ئەم كۆمەڵە مسوڵمانە كۆ دەكەمەوەو ئەم دەرسەیان پێدەڵێم، هەر خواش بە نیەتەكەم ئاگادارە، داخۆ بۆچی دەیكـەم؟ بـەڵام گـرنگ ئەوەیـە كەمن بە ڕواڵەت دیارە كە بەویستو هەڵبژاردنی خۆم دەیكەم، دەشم توانی بچم كارێكی خراپ بكەم، ئەو كاتیش هەر بە ویستو هەڵبژاردنی خۆم دەمكرد، جا هـەر كاتێـك بـۆ كارێك ویستو هەڵبژاردنی خۆتت لەگەڵدابێ، هەم سزا لە ئارادا دەبێ، ئەگەر كردەوەكـە خراپ بێ، هەم پاداشت لە ئارادا دەبێ، ئەگەر كردەوەكـە چـاك بـێ، بـەڵام هـەركاتێك ویستو خواستی ئینسان لە ئارادا نەبێ، سزاو پاداشتیش لە ئارادا نیە، هەر بۆیـە خـوا سبحانه و تعالی بەردەوام لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿... جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٧﴾ السجدة، یان (يَفْعَلُونَ) یان (يَكْسِبونَ)، واتە: لەبەرانبەر ئەوەدا كە: دەیانكرد، وەدەستیان دەهێنا، ئەنجامیان دەدا، نەیفەرمووە: فلاَن كەس قۆزەو باڵای بەرزە، پاداشتی بدەنـەوە،

فلاَن كەس دزێوەو بالاَی نزمە، سزای بدەن، شتی وا نیە، بۆچی؟ ، چونكە ئەو شتانە بە هەڵبژاردنو ویستی ئینسان نین، بەرزیی و نزمیی، جوانیی و ناشیرینیی، هەژاریی و دەولَەمەندیی...، ئەمانە بە هەڵبژاردنو ویستی ئینسان نین، كاتێك سزاو پاداشت هەیە كە هەڵبژاردنو ویستی ئینسان هەبێ، مەسەلەی قەزاو قەدەریش وەك لە باسەكانی ڕابردووشدا باسمان كرد، زۆر ئالۆزو قووڵەو هەر هێندە بە دوای دەكەوین كە عەقڵی ئێمە بڕ دەكات، چونكە زیاتر بە دوای بكەوین، تووشی خلیسكانو زیان دەبین، چونكە قەزیەكە هێندە قووڵە، هەموو قەزیەكە بە تەواویی و تا ئەوپەڕی، لە عەقڵی ئینساندا جێی نابێتەوە.

ئنجا دەچێتە سەر خاڵی (٨٥)و، چەند وردەكارییەكی بابەتی قەدەرەوە، كە كاتی خۆی لەنێوان زانایانی ئەهلی سوننەتو جەماعەتو گرووپە داهێنەرەكاندا، بەتایبەت موعتەزیلە، ڕاجیایی و مشتو مڕی زۆریان لەسەر بووەو، دەڵێ:

٨٥) ( وَالإِسْتِطَاعَةُ الَّتِي يَجِبُ بِهَا الْفِعْلُ مِنْ نَحْوِ التَّوْفِيقِ الَّذِي لا يَجُوزُ أَنْ يُوصَفَ الْمَخْلُوقُ بِهِ، فَهِيَ مَعَ الْفِعْلِ، وَأَمَّا الإِسْتِطَاعَةُ مِنْ جِهَةِ الصِّحَّةِ وَالْوُسْعِ وَالتَّمَكُّنِ وَسَلامَةِ الآلاتِ فَهِيَ قَبْلَ الْفِعْلِ، وَبِهَا يَتَعَلَّقُ الْخِطَابُ، وَهُوَ كَمَا قَالَ تَعَالَى: (لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ) [البقرة:٢٨٦]):

واتە: ئەو توانایەی كە كردەوەكەی پێ پێویست دەبێو، كردەوەكەی پێ دێتە دی، وەك ئەو یارمەتیدانەی كە دروست نیە دروست كراوی پێ وەسف بكرێ، ئەو توانایەو ئەو دەستەلاَتە، لەگەڵ هاتنی كردەوەكە دایە، بەلاَم ئەو توانایەی كە لە ڕووی لەش ساغیی و تواناو بۆ گونجانو ساغیی ئەندامەكانەوەیە، ئەو جۆرە توانایە لە پێش كردەوە دایە، دیارە فەرمانو تەكلیفی خواش پەیوەندیی بەو جۆرە توانایەوە هەیە، خوای بەرز فەرموویەتی: خوا زیاد لەتوانای لەهیچ كەس داوا ناكات.

بەڕێزان!

بۆ هەر كارێك كە دەكرێ چاك بێ، یان خراپ، ئینسان دوو جۆرە توانای پێویستە:

١- توانایەكیان لە پێش كردنەكەی دایە.

٢- یەكیشیان لە كاتی كردنەكەی دایە، ئەو توانایەی كە لە پێش كردنەكەی دایە، وەك لەش ساغیی‌و سەلامەتیی ئەندامەكان‌و، تواناو دەستەڵات‌و بۆ كران‌و ئەوانە، دواندنی خواو تەكلیفی خوا پەیوەندیی بەو جۆرە توانایەوەیە، كە لە پێش كردەوەكەدایە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار تەكلیف لە كوێر ناكات جیهاد بكات، بۆچی؟ چونكە چاوی نیە، تەكلیف لە ئیفلیج‌و شەل‌و نەخۆش‌و پەككەوتە ناكات، وە تەكلیف لە فەقیرێك ناكات، كە چەكەكەی پێ ناكردرێ‌و پێداویستییەكانی جیهادی بۆ دابین ناكرێن، خوا تەكلیفیان لێناكات‌و داوای كارێك لە كەسێك ناكات كە پێداویستییەكانی نین، بەڵام ئایا ئەو ئیشە كە دەكرێ چاك بێ، یان خراپ، بەس بەو توانایە دێتە دی؟! نەخێر، بەڵكو توانایەكی دیكەیشی پێویستە، كە بریتیە لەو كارئاسانیی‌و یارمەتیدانەی، كە بۆ كردنەكەی دێتە دی، ئەوەیان لەلای خوای میهرەبان‌و دادگەرەوەیە.

ئنجا ئایا جیاوازیی لە نێوان ئەو دوو توانایەدا چییە؟ توانای یەكەمیان پەیوەندیی بە خۆتەوەیە، ئنجا هەركات ئەو توانایەت خستە گەڕوخستتە ئیش، ئەگەر بەباری چاكە دابێ، خوا یارمەتیت دەداو تەوفیقت دەدا، لەگەڵ ڕازیبوون دا، وە ئەگەر بەباری خراپەش دابێ، دیسان خوا یارمەتیت دەدا، بەڵام لەگەڵ پێناخۆشبوونیدا، ئنجا جاری وایە لە ڕێی شەیتانانەوە یارمەتیت دەدا، گرنگ ئەوەیە یارمەتیت دەدا، وەك دەفەرموێ: ﴿ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ ... ﴿٢٠﴾ ﴾ الإسراء، دەفەرموێ: یارمەتی هەردووك لایان دەدەین، ئەوانیش‌و ئەوانیش، یانی بە باری خێرو چاكەو، بە باری شەڕو خراپەدا،

یارمەتییان دەدەین، بۆچی؟ چونکە دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ النجم، ئینسان بەس هەوڵو كۆششی خۆی بۆ هەیە، نەیفەرمووە: (وَأَن لَيسَ للمؤمِنِ) ئینسان وەك ئینسان، كافر بێ، یان مسوڵمان بێ، كۆشش بكاتو خۆی ماندوو بكات، خوا یارمەتی دەدا، ئنجا كە یارمەتی دەدا، وە ئەگەر بە باری چاكەدا خۆی ماندوو بكات، بە پێخۆشبوونەوە یارمەتی دەداتو پاداشتیشی دەداتەوە، ئەگەر بە باری خراپەدا خۆی ماندوو بكات، خوا یارمەتی دەدات بەپێی ماندوو بوونی خۆی، مرۆڤ خۆی شت بەدەست دێنێ، خوای گەورەش دەستوورو سوننەتی وا داناوە، كە ڕێگەی لێ نەگرێ بەپێی كردەوەو كۆششی خۆی، بەڵام پێشی ناخۆشەو سزاشی دەداو لێشی تووڕە دەبێ، ئنجا (طەحاویی) دەڵێ: (وَهُوَ كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ... ﴿٢٨٦﴾ ﴾) خوا لە هیچ كەس داوا ناكات ئەوە نەبێ، كە لە توانایدا هەیە.

كەواتە: هەر كاتێك ئەوەی كە ئینسان لە توانایدا هەیە، ئەو توانایەی كە خوا عزوجل پێیداوە خستیە كار بەباری خێردا، خوای پەروەردگاریش توانایەكی تایبەتیو یارمەتییەكو ئاسانكارییەكی تایبەتی بۆ دەنێرێ، كە كردەوە چاكەكانی پێ ئەنجام دەدرێن كەواتە ئینسان لەسەرێكەوە وەدەستهێنەری كردەوەكانی خۆیەتی، لەسەرێكیشەوە خوا كردەوەكانی بۆ دەڕەخسێنێ، چونكە بەبێ یارمەتی خوا كردەوەكانی بۆ ئەنجام نادرێ.

بۆیە لە خاڵی هەشتاو شەشەمیندا دەڵێ:

**٨٦) ( وَأَفْعَالُ الْعِبَادِ خَلْقُ اللهِ، وَكَسْبٌ مِنَ الْعِبَادِ ):**

واتە: كردەوەكانی بەندەكان دروستكراوی خوانو بەدەستهێنراوی بەندەكانن، (خَلق) یانی: دروستكردنو بەدیهێنان و پەیداكردن لە نەبوونەوە، ئەوە بەس بە خوا دەكرێ، بەڵام (كَسب) یانی بەدەستهێنانو ئەنجامدانو تێپەڕاندن، ئەوەیان لە بەندەكانەوەیە.

(طەحاویی) دەڵێ: خوا کردەوەکانی ئێمە دەخوڵقێنێ، بەڵام بۆ خۆمان بەدەستیان دەهێنین، بۆ خۆمان ئەنجامیان دەدەین و لەسەر دەستی ئێمە تەواو دەبن، بەویستی ئێمە تەواو دەبن. زۆربەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئاوا دەڵێن، بەڵام من پێشتر باسم کردو لێرەش دووبارەی دەکەمەوە، کە هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نیە، کە کردەوەکانی مرۆڤ دروستکراو (مخلوق)ن تاکو ناچاربین بەدیهێنەر(خالق)ێکیان بۆ بڕیار بدەین: خوا، یان مرۆڤ، بەڵکو کردەوەکانی مرۆڤ، تەنیا وەدەستهێنراو (مکتسب)و گێڕراو (مجعول)و ئەنجامدراو (مفعول)ن و، بەس پەکیان لەسەر: وەدەستهێنەرو گێڕەرو ئەنجامدەر (مکتسب و جاعل و فاعل) کەوتوەو، مرۆڤیش بەهەموو ئەو سیفەتانە لە قورئان دا وەسف کراوە.

جەبرییەکانیش دەڵێن: نەخێر ئینسان هیچ دەستی لەکردەوەکانی خۆیدا نیە.

موعتەزیلەش دەڵێن: نەخێر، ئینسان بۆ خۆی کردەوەکانی خۆی بەدی دێنێ.

ئنجا نووسەر لەخاڵی (٨٧)دا هەندێك وردە مەسەلەی دیکەی پەیوەست بە قەدەرەوە باس دەکات، کە پێم وا نیە هیچ کەس لەبارەیانەوە مشتومڕ بکات، جگە لەو قسەیەی، کە دەڵێ: (وَلا يُطِيقُونَ إِلاَّ مَا كَلَّفَهُمْ) کە دوایی تێبینی خۆمانی لەسەر دەخەینە ڕوو، دەڵێ:

> ٨٧)- (وَلَمْ يُكَلِّفْهُمُ اللهُ تَعَالَى إِلاَّ مَا يُطِيقُونَ، وَلا يُطِيقُونَ إِلاَّ مَا كَلَّفَهُمْ، وَهُوَ تَفْسِيرُ: "لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ"، نَقُولُ: لا حِيلَةَ لِأَحَدٍ، وَلا حَرَكَةَ لأَحَدٍ، وَلا تَحَوُّلَ لِأَحَدٍ عَنْ مَعْصِيَةِ اللهِ إِلاَّ بِمَعُونَةِ اللهِ، وَلا قُوَّةَ لأَحَدٍ عَلَى إِقَامَةِ طَاعَةِ اللهِ وَالثَّبَاتِ عَلَيْهَا إِلاَّ بِتَوْفِيقِ اللهِ):

واتە: خوای بەرز داوای لە بەندەکانی نەکردوە، مەگەر ئەوەی کەدەیتوانن، واتە: چەندە دەتوانن، خوا هەر ئەوەندەی لێ داوا کردوون، وەك خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) دەفەرموێ ﴿ لَا

﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ... ﴿٢٨٦﴾ ﴾البقرة، ئنجا دەڵێ: (وَلا يُطِيقُونَ إلاَّ مَا كَلَّفَهُمْ) ناشتوانن، مەگەر ئەوەی داوای لێکردوون.

بەڵام تێبینییمان لەسەر ئەوە هەیەو دەڵێین: نەخێر، لەوەش زیاتر کە ئینسان داوای لێکراوە دەتوانێ، چونکە خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿ ... يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ... ﴿١٨٥﴾ ﴾البقرة، واتە: خوا دەیەوێ بۆتان ئاسان بکاتو نایەوێ لەسەرتان قورس بکات، وە دەفەرموێ: ﴿ ... وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ... ﴿٧٨﴾ ﴾الحج، واتە: خوا لە دینی خۆیدا سەغڵەتیی نەکردوون، ئنجا ئەگەر هەرچی لە تواناماندا هەیە لێی داوا بکردباین، پێی سەغڵەت دەبووین، بۆ وێنە: کابرا توانای هەڵگرتنی کۆڵێکی سەد کیلۆیی هەیە، ئەگەر ئەو کۆڵە هەڵگرێ، مانای دەبێ ئەوپەڕی توانای بخاتە کارو زۆر ماندوو دەبێ، بەڵام ئەگەر پەنجا کیلۆ هەڵبگرێ، زۆر سەغڵەت نابێ، ئنجا ئەگەر هاتباو هەرچی لە تواناماندا هەیە، خوا لێی داوا کردباین، مانای وایە زۆر ماندوو دەبووین. کەواتە: ئەو قسەیە پێچەوانەی ئەو ئایەتەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ... يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ... ﴿١٨٥﴾ ﴾البقرة.

ئنجا (طەحاویی) دەڵێ: (وَهُوَ تَفْسِيرُ: لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ) ئەوەش لێکدانەوەی ئەو ڕستە بەرزەیە کە: لادان نیە لە خراپەو، هێز نیە بۆ چاکە، مەگەر بە خوا، (نَقُولُ: لاحِيلَةَ لِأَحَدٍ، وَلا حَرَكَةَ لأَحَدٍ، وَلا تَحَوُّلَ لأَحَدٍ عَنْ مَعْصِيَةِ اللهِ إلاَّ بِمَعُونَـةِ اللهِ) لە تەفسیری ئەو وشەیەدا دەڵێین: تەگبیر نیە بۆ هیچ کەسو، جووڵە نیە بۆ هیچ کەسو، ڕێ گۆڕین نیە بۆ هیچ کەس، لە سەرپێچیی نەکردنی خوادا، مەگەر بەیارمەتی خوا، یانی ئینسان ناتوانێ سەرپێچیی لە فەرمانەکانی خوا نەکات، ئەگەر هاوکاریی خوا نەبێ، پاشان دەڵێ: (وَلا

قُوَّةَ لأحَدٍ عَلَى إقَامَةِ طَاعَةِ اللهِ وَالثَّبَاتِ عَلَيْهَا إلاَّ بِتَوْفِيقِ اللهِ)، هێزو تواناو دەستەلاتیش نیە بۆ هیچ کەس، لەسەر جێبەجێ کردنی فەرمانبەریی بۆ خوا، مانەوە لەسەری، مەگەر بە یارمەتی خوا.

سەرەنجام نووسەر لە خاڵی (٨٨)دا وەك دوا قسەی لەبارەی قەدەرەوە، کە پێم وایە زۆر لە حاڵەتی جەبر نێزیك کەوتۆتەوە، لە کاردانەوەی موعتەزیلەو قەدەرییەداو، دەڵێ:

> ٨٨) ( وَكُلُّ شَيْءٍ يَجْرِي بِمَشِيئَةِ اللهِ تَعَالَى وَعِلْمِهِ وَقَضَائِهِ وَقَدَرِهِ، غَلَبَتْ مَشِيئَتُهُ الْمَشِيئَاتِ كُلَّهَا، وَغَلَبَ قَضَاؤُهُ الْحِيَلَ كُلَّهَا، يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ غَيْرُ ظَالِمٍ أَبَداً، تَقَدَّسَ عَنْ كُلِّ سُوءٍ وَحَيْنٍ، وَتَنَزَّهَ عَنْ كُلِّ عَيْبٍ وَشَيْنٍ: لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ [الأنبياء:٢٣]):

واتە: هەموو شتێکیش بەویستی خوای بەرزو بە زانیاری وی‌و بە بڕیارو ئەندازەگیریی وی جێبەجێ دەبێ‌و تێدەپەڕێ، (غَلَبَتْ مَشِيئَتُهُ الْمَشِيئَاتِ كُلَّهَا) ویستی خوا بەسەر هەموو ویستەکاندا زاڵە، هەموو ویستەکانی دیکەی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمویێ: ﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ التكوير، ناتوانن بتانەوێ، تا خوای پەروەردگاری جیهانەکان نەیەوێ، (وَغَلَبَ قَضَاؤُهُ الْحِيَلَ كُلَّهَا)، حوکم‌و بڕیاری خوا بەسەر هەموو تەگبیرەکاندا زاڵە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێ: (ئەوەی لە لای عەبدەکان خەیاڵە، لەلای خوا بە تاڵە)، یان دەڵێ: (تەقدیر تەگبیر بە تاڵ دەکاتەوە)، (يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ وَهُوَ غَيْرُ ظَالِمٍ أَبَداً) هەرچی بیەوێ دەیکات، هەرچی دەیکات ستەم نییە، (تَقَدَّسَ عَنْ كُلِّ سُوءٍ وَحَيْنٍ)، خوا بەرزو بێگەردە لە هەموو خراپەیەك و لە هەموو ستەمێك (وَتَنَزَّهَ عَنْ كُلِّ عَيْبٍ وَشَيْنٍ:) پاکو بێ پەڵەیە لە هەموو ڕەخنەیەك‌و لە هەموو عەیبێك، (لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ) پرسیاری لێناکرێ

لەوەی دەیكات، بەڵكو ئەوان لەلایەن خواوە پرسیاریان لێدەكرێ ، بۆچی؟ چونكە هیچ شتێكی بێ جێ ناكات‌و، خاوەنی ئەوپەڕی دادگەریی‌و حیكمەت‌و ڕەحمەتی بێ سنوورە.

***

## پاڕانەوەو خێرو چاكەی زیندوان، سوود بە مردوان دەگەیەنێ

نووسەر لەم خاڵ (٨٩)دا باسی مەسەلەیەكی فیقهیی لەبواری عیبادەت دا دەكات كە بریتیە لە سوودمەند بوون‌و بەهرە وەرگرتنی مردوان، لە دوعاو خێرو صەدەقەو چاكەیەك كە زیندوان بۆیانی دەنێرن، دیارە لەو بارەشەوە، هەندێك لەپێرو دەستە لادەرو داهێنەرەكان، كێشەو مشت‌و مڕیان لەگەڵ زۆربەی پێشەواو زانایانی ئوممەت دا بووە، بۆیە طەحاویی ئەو مەسەلەیەشی، كە هیچ پەیوەندیی بەعەقیدەوە نیە، خستۆتە نێو باس‌و بابەتەكانی عەقیدەوەو گوتوویەتی:

٨٩) (وَفِي دُعَاءِ الأَحْيَاءِ وَصَدَقَاتِهِمْ مَنْفَعَةٌ للأَمْوَاتِ):

واتە: لە دوعاو پاڕانەوەی زیندوان‌و خێرو چاكەیاندا كەڵك‌و سوود هەیە بۆ مردوان، دیارە ئەوە ڕستەیەكی زۆر كورت‌و گوشراوە، بەڵام شتی زۆری تێدایە، ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت تێكڕایان لەسەر ئەوەن، كە مردوانی مسوڵمانان لە دووعاو خێرو صەدەقەی زیندوان بەهرەمەند دەبن‌و خێرو پاداشتیان بۆ دەچێت، هێندێ لە ئەهلی بیدعەت پێیان وابووە، كە هیچ شتێكی زیندوان سوودی بۆ مردوان نیە، بەڵام ئەوانە هەڵەن‌و گەلێك لە ئایەتەكانی قورئان‌و دەقەكانی سوننەت، ئەو هەڵوێست‌و بیرو بۆچوونەی ئەوان پووچەڵ دەكەنەوە، ئنجا ئەو مەسەلەیە، كە ئایا چی زیندوان سوودی هەیە بۆ مردوان‌و، تا چ

سنووریك، خاوەنی كتێبی (شرح العقيدة الطحاوية)[1] چاكی ڕوون كردۆتەوە، ئێمەش كورتەو پوختەیەكمان لێ دەرهێناوە:

## كام كردەوەی زیندوان سوودی بۆ مردوان هەیەو بەڵگەكانی چین؟!

یەكەم: ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەسەر ئەوە ڕێككەوتوون، كە لە مردوانی مسوڵمانان، بەس مردوانی خاوەن ئیمان سوود وەردەگرن لە كردەوەی زیندوان. چونكە كەسێك ئیمانی نەبێ، هەرچەندە لە دنیادا وەك مسوڵمانیش ناسرابێ، وەك مونافیقەكان، بەڵام هیچ بەشی بەبەهەشت و ڕەحمەتی خواوە نابێ، تاكو كردەوەی خەڵكی دیكە سوودی پێ بگەیەنێ.

دووەم: هەر شتێك كە مردوو لە ژیانی خۆیدا بووبێتە هۆی، لێی بەهرەمەند دەبێ وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: {إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ}حديث صحيح.[2]

واتە: ئەگەر ئادەمیزاد مرد، كردەوەی چاكی دەبڕێو كۆتایی پێدێ، جگە لە سێ شتان: خێرێكی بەردەوام (بۆ وێنە: مزگەوتێك دروست دەكات، پردێك دروست دەكات، قوتابخانەیەك دروست دەكات)، یان زانیارییەك كە لە دوای خۆی خەڵك لێی بەهرەمەند دەبێ (بۆ وێنە: كتێبێكی داناوە، وتارێكی داوە، خەڵكێكی فێری شتێك كردوە، لە دوای خۆی خەڵك سوودی لێ وەردەگرێ، بەردەوام ئەو خێرو چاكەی بۆ دەنووسرێ)، یان منداڵێكی صاڵح، (چ كچ بێ، چ كوڕ، مادام خوا پەرست بێ) كە دوعای خێری بۆ دەكات.

---

[1]) كە (إبن أبي العزّ الحنفي)یە خوا لێی خۆشبێ.

٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٦٣١)، وَإِبْنُ حِبَّان برقم: (٣٠١٦)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عِنْهُ، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.

سـێیەم: پاڕانەوەی مسوڵمانانو داوای لێبوردن بۆ كردنیانو، ماڵ بەخشینو حەج كردن، ئەوانە هەموویان ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەسەری یەكدەنگن.

بەڵام زانایانی ئەهلی سوننەت لەبواری عیبادەتی بەدەنییـدا، وەك: نوێـژ، ڕۆژوو، قورئان خوێندن، ڕاجیاییان هەیە:

ئەبو حەنیفەو ئەحمەدو جەماوەری زانایانی پێشین (سلف) دەڵێن: ئەوانە هـەموویان دەگەن، واتە: وەك چۆن ئەگەر مردوو شتێكی لە دوای خۆی بەجێ هێشتبێ پێیدەگات، هەر شتێكی دیكەش بۆ مردوان بكرێ لەلایەن زیندوانەوە، وەك ئەوەی كە ڕۆژووی بـۆ بگیرێ، قورئانی بۆ بخوێنرێ، نوێژی بۆ بكرێ، زیكری بۆ هەدیە بكرێ.

بەڵام شافیعییو مالیك دەڵێن: ئەو شتانە،خێرەكەیان بە مردوو ناگات، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە، كە خەڵكی كورد بەزۆریی شافیعیی مەزهەبن، كەچی ڕایان وایە كە ئەو جۆرە خێرانە هەموویان بە مردوان دەگەن، لەگـەڵ ئەوەشـدا كـە شـافیعیی ڕای وایـە ناگەن!.

ئنجا هەندێك لە پێڕە داهێنەرەكانی وەك: موعتەزیلە ڕایان وایە، كەهیچ شتێك لە زیندوانەوە بە مردوان ناگاتو كە مرۆڤـ مرد، هیچ سوودو قازانجێكی لەكەسەوە پـێ ناگاتو لە هەموو خێرێك بێبەش دەبێ، بەڵام قسـەكەیان بەبەڵگـەی زۆر لـەقورئانو سوننەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئیجماع و قیاس بەرپەرچ دەدرێتەوە.

جا ئەوە چەند بەڵگەیەك لەسەر ئەوە، كە مردوو خێرو پاداشتی چەند كردەوەیەك كە بۆ خۆی دەستی تێیان دا نەبووە، مادام بۆی هەدیە دەكرێ، پێی دەگات:

بەڵگەی یەكەم: خوای پەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠﴾ الحشر، واتە: وە ئەوانەی كە لە دوای كۆچـكەرانو پشتیوانانەوە هاتوون، دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! لە ئێمەو لەو برایانەمان خۆش بە كە لە پێش ئێمەدا ڕۆیشتوونو ڕابردوونو بەرانبەر بە بڕواداران كینەمان مەخە دڵەوە،

پەروەردگارمان! بێگومان تۆ میهرەبانو بە بەزەیی، ئنجا ئەگەر ئەو نزاو پاڕانەوەیە، ئەو مردوانە، کە ڕابردوون، لێی بەهرەمەند نەبووبان، خوای بەخشندە لەسەر شێوەی مەدح نەیدەگێڕایەوە.

بەڵگەی دووەم: لە سوننەتی پێغەمبەریشدا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەو بارەوە دەقی زۆر هەن کە ئێمە چەند نموونەیەك دێنینەوە:

أ- یەکێك لەو دەقانە ئەمەیە: { كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ وَقَفَ عَلَيْهِ وَقَالَ: إِسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ وَسَلُوا لَـهُ التَّثْبِيتَ، فَإِنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ} حديث صحيح.[1]

واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کاتێ لە شاردنەوەی مردوویێك دەبۆوە، لەسەر گۆڕەکەی ڕادەوەستاو ، دەیفەرموو: داوای لێبوردن بۆ برایەکەتان بکەن، (یان بۆ خوشکەکەتان بکەن)و داوای بۆ (لەخوا) بکەن کەدڵی بچەسپێنێ (و زمانی ڕاست بکات بۆ وەڵامدانەوەی فریشتەکان)، چونکە ئێستا پرسیاری لێدەکرێ.

ئنجا ئەگەر مردوو لە دوعای زیندوان بەهرەمەند نەبووبان، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئاوا تەکلیفی لە زیندوان نەدەکرد، کە دوعا بۆ مردوان بکەن.

ب- هەروەها لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە: {قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُعَلِّمُهُمْ إِذَا دَخَلُوا الْمَقَابِرَ فَكَانَ قَائِلُهُمْ يَقُولُ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ إِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ، نَسْأَلُ اللهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ} حديث صحيح.[2]

واتە: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مسوڵمانانی فێر دەکرد کە چوون بۆ سەر گۆڕستان، بڵێن: سەلامی خواتان لێبێ نیشتەجێیانی ئەو گۆڕستانە، لە بڕواداران و لە

---

١) أَخْرَجَهُ الحَاكِم برقم: (١٣٧٢) وقال: صحيح الإسناد، وأبو داود برقم: (٣٢٢١)، وَالبَيْهَقِي في (الشعب) برقم: (٦٨٥٦) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٣٠٢) عَنْ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

مسوڵمانان، ئێمەش هەركاتێ خوا ویستی، بەئێوە دەگەین، داوای سەلامەتیی‌و بێ بەلایی لە خوادەكەین بۆ خۆمان و بۆ ئێوەش.

دیارە ئەوەش دوعایەو مردووەكان لێی بەهرەمەند دەبن، ئەگەرنا، فێری نەدەكردن.

بەڵگەی سێیەم: گەیشتنی پاداشتی ماڵ بەخشین‌و صەدەقە بە مردوو، وەك لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) هاتوە: {أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِلنَبِـي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُهَا، وَأَظُـنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، فَهَلْ لَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا قَالَ: نَعَـمْ}حديث صحيح.[١]

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! دایكم گیانی دەرچوو كت‌و پڕ مرد، (وەسیەتیشی نەكرد)، پێم وایە ئەگەر بەقسان ڕاگەیبایە (كت‌و پڕ گیانی دەرنەچوویا) خێرو چاكەیەكی لە دوای خۆی دەكرد (دەیگوت ئەوەم بۆ بكەنە خێرو، ئەوە بكەن‌و ئەوە بكەن) ئایا خێرو پاداشتی بۆ دەچێ، ئەگەر من لەجیاتی ئەو ببەخشم و خێر بكەم؟؟ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: بەڵێ.

بەڵگەی چوارەم: هەروەها سەبارەت بە گەیشتنی پاداشتی ڕۆژوو كە زیندوو لە جیاتی مردوو بیگرێتەوە، هەر لە دایكمان عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) هاتوە: { أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: «مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ»}حديث صحيح.[٢]

واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: هەركەسێ مردو ڕۆژووی لەسەر بوو، با ئەو كەسەی كە سەرپەرشتیاریەتی (یان ئەو كەسەی كە خزم‌و نزیكیەتی) ڕۆژووەكەی لەجیاتی بگرێتەوە.

بەڵگەی پێنجەم: گەیشتنی پاداشتی حەج بە مردوو، كە زیندوان لە جیاتی مردوان حەج بكەن، ئەوەش لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) هاتوە: { أَنَّ امْـرَأَةً مِنْ جُهَيْنَةَ جَاءَتْ إِلَى اَلنَبِـي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَتْ: إِنَّ أُمِّي نَـذَرَتْ أَنْ تَحُـجَّ،

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِي برقم: (١٣٢٢).

٢) أخرجه البخاري برقم: (١٨٥١).

فَلَمْ تَحُجَّ حَتَّى مَاتَتْ، أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: " نَعَمْ "،حُجِّي عَنْهَا، أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ، أَكُنْتِ قَاضِيَتَهُ؟ إِقْضُوا اللهَ، فَاللهُ أَحَقُّ بِالْوَفَاءِ }حديث صحيح.[١]

واتە: ئافرەتێك لە هۆزی جوهەینە هاتە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) گوتی: دایکم لەسەر خۆی نەزر کردبوو، کە حەجێ بکات (وا دیارە حەجی فەرزی کردوە، بەڵام لەسەر خۆی نەزر کردوە کە حەجێکی دیکە بکات، ئەگەرنا حەجی فەرز هەر فەرزەو پێویست ناکات نەزر بکات)، بەڵام مردو حەجەکەی بۆ نەکرا، ئایا لە جیاتی وی حەجێ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ، لە جیاتی دایکت حەجێ بکە، ئایا ئەگەر قەرزێك لەسەر دایکت بوایە، قەرزەکەت لە جیاتی نەدەدایەوە؟ (گوتی: با)، فەرمووی کەواتە: قەرزی خواش بدەنەوە، چونکە خوا شایستە ترە ئینسان قەرزی بداتەوە.

بەڵگەی شەشەم: مسوڵمانان ئیجماعیان لەسەر ئەوەیە، کەقەرز دانەوە لەلایەن هەر کەسێکەوە بێ، با بێگانەش بێ، لە کۆڵ بابای مردووی دەکاتەوە، وەك (إبن أبي العزّ) دەڵێ: (وَأَجمَع المُسْلمونَ عَلى أَنَّ قَضاءَ الدَّيْن يُسْقِطهُ من ذمّة الميِّت وَلو كانَ مِن أَجنَبِي ومِن غَير تَركَتِهِ)[٢] واتە: مسوڵمانان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەگەر بابایەکی بێگانەش لە جیاتی مردووێکی قەرزدار، قەرزەکەی بداتەوە، قەرزەکەی لە کۆڵ دەکەوێ بۆ قیامەتێ، با لەوماڵەش نەبێ کە بەجێی هێشتوە.

ئنجا ئەوەش فەرموودەیەك دەلالەتی لەسەر دەکا، کە ئەبو قەتادە دوو دیناری خستنە ئەستۆی خۆی سەبارەت بە مردوویەك، کاتێ دوو دینارەکەی لە جیاتی کابرای مردوو دانەوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: {الآنَ حِينَ بردّت عَلَيهِ جلدته}حديث حسن[٣] گوتی: ئێستا فێنکایەتییت بەدڵدا هێنا، ئاسوودەت کرد.

بەڵگەی حەوتەم: هەروەها قورئان خوێندنو زیکرکردنو هەدیە کردنیان بۆ مردوو، بە قیاس لەسەر ئەو شتانەی، کە ڕابردن، ئەوانیش دەگەن، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئاخر

---

١) أخرجه البخاري برقم: (١٧٥٤).

٢) شَرح العَقيدة الطحاويّة.

٣) كنز العمال برقم: (١٥٥٠٥)، قال الهيثمي: سنده حسن، وحسَّنَهُ الألباني.

پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەربارەی حەجو صەدەقەو ڕۆژوو و ئەوانە، لێیان پرسیوە، بەڵام دەربارەی قورئان خوێندن لێیان نەپرسیوە، ئێمە چۆن دەتوانین بڵێین: ئەویش هەر دەگا؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە، کە یەکێك دەربارەی ڕۆژوو لێی پرسیوە؟ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: دەگات، یەکێك دەربارەی حەج لێی پرسیوە؟ فەرموویەتی: بەڵێ، دەگات بە مردوو، یەکێ دەربارەی صەدەقە لێی پرسیوە؟ فەرموویەتی: بەڵێ، دەگات، ئنجا ئەگەر کەسێکیش هەبا، لێی بپرسیبا دەربارەی زیکرو قورئان خوێندن، هەر دەیفەرموو: دەگات، چونکە جیاوازییەك نیە لە نێوان قورئان خوێندنو ڕۆژوو گرتندا، هەردووکیان دوو عیبادەتی بەدەنیین، ئەوە زۆربەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت لەسەر ئەوەن.

کەواتە: ئەو کەسانەی دەڵێن: مردوو هیچ شتێکی پێ ناگاو، پێویست ناکات هیچی بۆ هەدیە بکرێ، قسەکەیان بێ بەڵگەیە. بەحەقیقەتیش ئەوەی زۆربەی زانایان گوتوویانە، هەرئەوە لە کەرەمو لوتفی خوا چاوەڕێ دەکرێ بەڵام دیارە نابێ هیچ کەسێك لەبەر ئەوەی دوایی حەجی بۆ دەکرێو، ڕۆژووی بۆ دەگیرێ، پشتێنی لێ بکاتەوە، ئەوە هەڵەیە، بەڵام ئەو ڕایەی دەڵێ: مردوو بەهرەمەند نابێ لە هیچ شتێکی زیندوان، ئەوە پێچەوانەی قورئانو سوننەتو ڕووحی شەریعەتە.

*****

جارێكی دیكەش نووسەر دەگەڕێتەوە سەرخستنە ڕووی هەندێك لە سیفەتە بەرزو مەزنو بێ وێنەكانی خوای تاكو پاك، كە وادیارە ئەو سیفەتانە، یان هەندێكیان، جۆرێك لە ڕاجیاییان لەسەر هەبووە، لەنێوان زۆربەی زانایانی ئۆممەتو، هەندێك لە دەستەو تاقمە لادەرو داهێنەرەكان، بۆیە هەرسێك خاڵی (٩٠و ٩١و ٩٢) بۆ ئەو مەبەستە تەرخان دەكاتو، سەرەتا لەخاڵی (٩٠)دا باسی وەڵامدانەوەی خواو بەدەنگەوە هاتنی بۆ بەندەكانی دەكاتو، دەڵێ:

**٩٠) ( واللهُ تَعالَى يَسْتَجِيبُ الدَّعَوَاتِ، وَيَقْضِي الحَاجَاتِ ):**

واتە: خوای بەرز وەڵامی پاڕانەوەكان دەداتەوەو پێویستیی بەندەكان جێبەجێ دەكات. بەڵێ، عەقیدەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت وایە، كەخوا وەڵامی ئەو كەسانە دەداتەوە كە لێی دەپاڕێنەوەو دوعاكەیان گیرا دەكاتو پێداویستییەكانیشیان جێبەجێ دەكات، یەكێك بۆی هەیە بپرسێ: چۆن خوا وەڵامی هەركەسێك دەداتەوە، كە لێی بپاڕێتەوە؟

دەڵێین: خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾غافر، واتە: پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە جوابتان دەدەمەوە، بێگومان ئەوانەی لەبەرانبەر پەرستنی مندا خۆ بەزل دەگرن، لەمەودوا بە زەبوونیی دەچنە دۆزەخەوە. یان دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ... ﴿١٨٦﴾ ﴾البقرة، واتە: كاتێك (ئەی موحەممەد! ) بەندەكانی من پرسیاری منیان لە تۆ كرد، من نێزیكم، وەڵامی بانگكەر دەدەمەوە، كاتێك بانگم بكات.

ئنجا یەكێك بۆی هەیە بڵێ: باشە بۆچی كەسی وا هەیە زۆر دوعا دەكاتو دوعاكەی گیرا نابێ؟ ئێمە دەڵێین: خوا دەفەرموێ: من وەڵامتان دەدەمەوە، نافەرموێ: ئیشەكەتان

جێبەجێ دەكەم، (أَسْتَجِبْ لَكُمْ) یان دەفەرموێ: (أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ ) وەلامی بانگكردنەكەی دەدەمەوە، وەلامدانەوەی بانگكردنیش، مەرج نیە بەو شێوەیەبێ، كە ئینسانەكە بۆ خۆی چاوەڕێی دەكات، وەك لەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هاتوە:

{عَن أَبي سَعِيدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ، قَالَ نَبِـي اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو بِدَعْوَةٍ لَيْسَ فِيهَا إِثْمٌ، وَلاَ قَطِيعَةُ رَحِمٍ، إِلاَّ أَعْطَاهُ اللهُ بِهَا إِحْدَى ثَلاَثٍ: إِمَّا أَنْ يُعَجِّلَ لَهُ دَعْوَتَهُ، وَإِمَّا أَنْ يَدَّخِرَهَا لَهُ فِي الآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يَكُفَّ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ بِمِثْلِهَا قَالُوا: إِذًا نُكْثِرُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: اللهُ أَكْثَرُ} حديث صحيح.(١)

واتە: ئەبو سەعید (خوا لێی ڕازی بێ )، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: هیچ مسوڵمانێك نیە، كە (بە ڕاستیی) لە خوا بپاڕێتەوە، بەمەرجێك ئەو پاڕانەوەیە گوناهی تێدا نەبێو، پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی تێدا نەبێ، مەگەر خوای بەبەزەیی یەكێ لەو سێیانەی لەگەڵدا دەكات: یان لە كاتی خۆیدا داواكارییەكەی جێبەجێ دەكات، یان بۆ ڕۆژی دوایی خێرو پاداشتێكی بۆ پاشەكەوت دەكات، بەئەندازەی ئەو شتەی كە داوای كردوە، یان بە ئەندازەی ئەو خێرەی داوای دەكات، شەڕو خراپەی لەسەر لادەبات، گوتیان: كەواتە ئەی پێغەمبەری خوا! (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئێمەش زۆر لە خوا دەپاڕێینەوە، (تاكو خوای بەخشەر یەكێ لەو سێ شتانەمان بۆ جێبەجێ بكات) فەرمووی: (اللهُ أَكْثَرُ) خوا لە ئێوە زۆرترە (واتە: ڕەحمەتی خوا لە داواكاریی ئێوە زۆرترە، پاداشتی خوا لە چاكەی ئێوە زۆرترە، هەرچەندە ئێوە زۆری لێ بپاڕێنەوە، خوا پەكی ناكەوێو نەدارێك نیە، ئەگەر بداتە تۆ، بەشی ئەوی دیكە نەمێنێتەوە!!).

ئنجا لە خاڵی (٩١) باسی بێ نیازیی‌و دەوڵەمەندیی خواو جێی نیازبوونی لە هەر تاوێك‌و چركەساتێكدا دەكات‌و، دەڵێ:

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١١٤٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٨١٦) وقال: صحيح الإسناد، وَالبَيْهَقِي في شعب الإيمان برقم: (١١٢٨).

٩١) ( وَيَمْلِكُ كُلَّ شَيْءٍ، وَلاَ يَمْلِكُهُ شَيْءٌ، وَلاَ غِنَى عَنِ اللهِ تَعَالَى طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَمَنِ اسْتَغْنَى عَنِ اللهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ، فَقَدْ كَفَرَ وَصَارَ مِنْ أَهْلِ الحَيْنِ ):

واتە: خوا هەموو شتێکی بەدەستەو هیچ شتێك خوای بە دەست نیە، (یانی: خوا خاوەنی هەموو شتێکەو، هیچ شتێك ئیرادەو سوڵتەی بەسەر خوادا نیەو، هیچ کەس هیچ شتێکی خوای بەدەست نیە. کەواتە: ئینسان ناتوانێت چاوتروکانێك لە خوای پەروەردگار بێ ئیحتیاج بێ، لەچاو تروکانێکدا تۆ هەناسە دەدەی‌و هەناسە هەڵدەمژی، دڵت حەفتا جار لە دەقیقەیەك لێدەدات، یەك چرکە دڵ‌و هەناسەت بوەستێ، ژیانت کۆتایی پێدێ، بۆیە دەڵێ: (وَلاَ غِنَى عَنِ اللهِ تَعَالَى طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَمَنِ اسْتَغْنَى عَنِ اللهِ طَرْفَةَ عَيْنٍ، فَقَدْ كَفَرَ وَصَارَ مِنْ أَهْلِ الحَيْنِ) چاوتروکانێك، بێ نیازیی لەخوای بەرز نیە، هەر کەسێك چاوتروکانێك پێی وابێ پێویستی بەخوا نەماوە، ئەوە کافر دەبێ و دەچێتە ڕیزی فەوتاوانەوە[١].

بەڕاستی ئەوە زۆر گرنگە ئینسانی مسوڵمان بزانێ، کە هەموو دەم پێویستی بەخوا هەیە، بۆ هەموو شتێك پێویستی بەخوا هەیە، چونکە هەموو بوونەوەرو هەرچی غەیری خوایە، پەکی لەسەر خوا کەوتوە، هەم بۆ پەیدابوون و هەم بۆ بەردەوامبوونی، یانی: ئێمە دووجار پێویستیمان بەخوا هەیە:

١/ ئەصلی دروست بوونمان کە خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، ﴿ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾ ﴾الزمر، واتە: هیچ شتێك بوونەکەی لە خودی خۆیەوە نیە، بەڵکو بوونەکەی خوازراو (مُستَعار)ەو لە خوای وەرگرتوە.

٢/ ئنجا ئەوەی دروست دەبێ، دیسان پێویستیی بە خوا هەیە بۆ بەردەوام بوون لە ژیان‌و لە بووندا، پێغەمبەر مووسا (علیه السلام) بەڕاستی جوابێکی پڕ بە پێستی داوەتە

---

١) الحَيْنُ: الهَلاك والمِحْنَةُ، المعجم الوسيط، ص٢١٣.

فیرعەون، كاتێك لە مووسا دەپرسێ: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾طـە، واتـە: ئەی مووسا! پەروەردگاری تۆو هارِوونی برات كێیە؟ مووساش وەڵامێكی دەداتەوە، كە بەڕاستی هەموو ئەو بەڵگانەی دەهێنرێنەوە بۆ ئیسپاتی بوونی خـوا، لـەو ئایەتـەدا كورتدەبنـــەوە: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ واتـــە: پەروەردگارمـان ئەو زاتەیە، كە بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوە، ئنجـا ڕێنماییشـی كردوە. واتە: پەروەردگاری ئێمە، ئەو زاتەیە كە هەموو شتێكی پەیدا كردوە، لە نێو ئەو شتانەدا، تۆش ئەی فیرعەون! بوونت لە خۆتەوە نیە، كاتێك بـووە، تـۆ نـەبووی، بوونی بە هەموو شتێك بەخشیوەو دوایی ڕێنموونیی كردوە، چـۆن بـەردەوام بـێ لـە بووندا، تەنیا هەتا ئەو كاتەی خوا مۆڵەتی لەسەرە دەمێنێتەوە، هەر كاتێك بوونەكەی لێ بسێنێتەوە بە فەنادا دەچێ، چونكە لە ڕاستیدا مردنیش بریتی نیە لـە نەهێشـتن (إعدام)، وشەی ئیعدام هەڵەیە، مردن ئەوەیە كەتۆ لە حاڵەتی ژیانی دنیاییەوە دەچیە حاڵەتی ژیانی بەرزەخیی، بەڵام ئەوە كە بەمردن هەر بچیتە عەدەمـەوەو نـەمێنی، نەخێر وانیە، هەر دەمێنی ،بەڵام بەو شێوە پێكهاتنەت نا، دەبیتەوە خاكو خۆڵ، بەڵام بە شـێوەی گەردیلـەكان هـەر دەمێنیتـەوە، ڕووحەكـەت هـەر دەمـێنێ، بـەڵام لـە بەدەنەكەت جودا دەبێتەوە.

ئنجا لە خاڵی (٩٢)دا باسی هەردووك سیفەتی تووڕەبوونو ڕازیبـوونی خوا دەكـات، كە وەك هی دروستكراوەكان نیـــن، وەك سەرجەم سیفەتو وەسفەكانی دیكەی، دەڵێ:

**٩٢) ( واللهُ يَـغْـضَبُ وَيَـرْضَى لاَ كَأَحَـدٍ مِـنَ الوَرَى ):**

واتە: خوا تووڕە دەبیّو ڕازی دەبێ، بەڵام وەك هیچ كام لە دروستكراوەكانی نا. یانی: خوا سیفەتی تووڕە بوونی هەیەو، سیفەتی ڕازی بوونیشی هەیە، بەڵام نەك تووڕە بـوونو ڕازیبوونەكەی، وەك هی دروستكراوەكانی بێ، ئێمە لەكاتی تووڕە بووندا سوور دەبینەوەو

دڵمان خێراتر لێدەدا، گۆڕانی جەستەیی‌و دەروونییمان بەسەر دادێ، لە کاتی ڕازیبوونیشدا دەم‌و چاومان گەش دەبێ‌و ڕوومان خۆش دەبێ، بەڵام خوا تووڕە دەبێ‌و ڕازی دەبێ، نەك وەك ئێمە، چونکە خوا ماددەو ڕووح‌و جیسم نیە، لە حاڵەتی تووڕە بـوون‌و ڕازی بوونـدا گۆڕانکاریی بەسەردابێ، وەك چۆن سیفەتی بینین‌و بیستن‌و قسەکردن‌و توانای دەسـتەڵاتی هەیەو، هیچ کام لە سیفەتەکانی وەك هی دروستکراوەکانی نیە، بۆ وێنـە: ئێمـە بەچـاو دەبینین، خوای پەروەردگار دەبینێ، بەڵام نەك وەك ئێمـە، ئەگـەر خـوا بـە ئەندامـەکان بینیبای، یان بیستبای، مانای وایە پێویستی بە غەیری خۆی بوو، ئەوە عـەقیدەی ئەهلی سوننەت‌و جەماعـەتە کەخوا هەرچی سیفەتی تەواویی (کَمال)ە هەیەتی، وە هەر سیفەتێك لە قورئان‌و سوننەت دا بۆ خوا بڕیار دراوە، ئێمە پێی دەڵێین سیفەتی خوا، بەو شێوەیەی کە لە خوا دەوەشێتەوە، ئەو ئایەتەش هـەموو ئـەو مەسـەلانە یـەکلایی دەکاتـەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿... لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشـوری، واتـە: هیچ شتێك وەك خوا نیەو ئەو بیسەری بینەرە، ئنجا وەك چـۆن زاتـی خـوا، وەك هـی دروستکراوەکانی نیە، زاتی خوا پێویستی بەپەیداکەرێك نیە، بوونێکی سەربەخۆو زاتیی هەیە، سیفەتەکانیشی بەهەمان شێوەن.

ئنجا لێـرەدا دەمـەوێ جارێکـی دیکـەش هەڵوێسـتی ڕاسـت‌و هەڵـە، لـە بـواری سیفەتەکانی خوا (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ)دا، ڕوون بکەمەوە، هەرچەندە لە پێشوودا باسـمان کرد، بەڵام لێرەش بۆتان تەئکید دەکەمـەوە، کە لەو بارەوە سێ هەڵوێست هەن:

١) <u>هەڵوێسـتی پەکخەرەکـان (الـمُعَطِّلَة)</u>: ئەوانـەن کـەخوای پـەروەردگار لـە هـەموو سیفەتەکان دادەڕنن‌و لێیدەکەنەوە، چونکە بەگومانی ئەوان، بە هۆی ئەو سیفەتانەوە خوای پەروەردگار بە دروستکراوەکانی دەچوێنرێ، دەڵـێن: خـوا تـووڕە بـوونی نیـەو مەبەست لە تووڕە بوونی خوا، تۆڵە ستاندنییەتی، وە مەبەست لە ڕازی بوونی خـوا، چاکە کردنییـەتی لەگەڵ غـەیری خۆیـدا، وە دەڵێـن: عـەرش‌و بارەگایـەك نیـەو

مەبەست لە عەرش، سەڵتەنەت و دەستەڵاتی خوایە، بەو جۆرە هەموو سیفەتەکانی خوا، بە جۆرێك ماناو تەئویل دەکەن کە دەچێتە قاڵبی پەکخستن (تَعْطيل)و نەهێشتیانەوە.

٢) هەڵوێستی پێچوێنەرەکان (الـمُشَـبِّهة): ئەمانیش دێنن ئەو سیفەتانە کە خـوا بـۆ خۆی بڕیاری داون، چۆن دێتە زەینی ئێمەوە، ئەوان بەو شێوەیە بۆی ئیسپات دەکەن، دەڵێن: دەستی هەیە وەك دەستی ئێمە، بەڵام دیارە گەورەترە، (ڕوو)ی هەیە وەك هی ئێمە، عەرشی هەیەو، کورسی هەیەو لەسەری دانیشتوە!! دیارە ئەهلی (تعطيل)و ئەهلی (تشبيه) هەردووکیان هەر بەهەڵەدا چوون.

٣) هەڵوێستی بەپاكگرەكان (الـمنَزِّهة): ئەهلی سوننەت و جەماعەت کە ئەهلی (تنزيه)ن، دەڵێن: ئەو سیفەتانە، کە خوا بۆ خۆی بڕیاری داون، ئێمەش بۆی بڕیار دەدەین، بەڵام خوا بە پاك دەگرین لەوەی کە سیفەتەکانی بە سیفەتی دروستکراوەکانی بشوبهێنین، وەك چۆن زاتەکەی وەك زاتی ئێمە نیە، بە هەمان شێوە سیفەتەکانیشی، وەك سیفەتی ئێمە نین، ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە نێوان هەردوولادا، ئەو خەتە ڕاستەیان گرتوە، وەك چۆن لە مەسەلەی قەزاو قەدەریشدا، لە نێوان جەبرو ئیعتیزالدا خەتی نێوەڕاستیان گرتوە، هەروەها لە هەموو ڕوویێکەوە کە تێپەڕاندنو بەزایەدان (إفراط و تفريط)یان تێدا پەیدابووە، ئەوان هاوسەنگانە خەتی نێوەڕاستیان گرتوە.

******

ئەمجارە نووسەر دێتە سەر بابەتێكی تازە، لەهەڵوێستە فیكرییەكانی زۆربەی هەرەزۆری ئۆممەتی ئیسلامیی‌و زاناو پێشەوایانی، كە بریتیە لەتاكە هەڵوێستی ڕاست‌و درووست‌و هاوسەنگ، لە بەرانبەر هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزو ناوازەكانی پێغەمبەری خوادا (خوا لێیان ڕازی بێ) بەگشتیی‌و، بەتایبەت چوار جێنشینە سەر ڕاست‌و ڕێنمایی كراوەكانی: (أبو بكرو عمر و عثمان و علي) (رضي الله عنهم)و ژمارەیەكی دیكە لە دیارو بەرجەستەكانیان كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هەر لەدنیادا مـوژدەی بەهەشتی پێداون‌و، بە موژدەی بەهەشت پێدراوان (المُبَشَّرون بالجَنّة) ناسراون، دیارە نووسەر چوار خاڵی بۆ ئەو بابەتە گرنگە داناون، كە خاڵەكانی: (٩٣-٩٦)ن، سەرەتا لەخاڵی (٩٣)دا بەگشتیی باسی هاوەڵان (الصَّحابة) دەكات‌و، دەڵێ:

٩٣) ( وَنُحِبُّ أَصْحَابَ رسُولِ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلاَ نُفْرِطُ فِي حُبِّ أَحَدٍ مِنْهُم؛ وَلاَ نَتَبَرَّأُ مِنْ أَحَدٍ مِنْهُم، وَنُبْغِضُ مَنْ يُبْغِضُهُم، وَبِغَيْرِ الخَيْرِ يَذْكُرُهُم، ولا نُذْكُرُهُم إلاَّ بِخَيْرٍ، وَحُبُّهُم دِينٌ وإيمَانٌ وإحْسَانٌ، وَبُغْضُهُم كُفْرٌ ونِفَاقٌ وطُغْيَانٌ ):

واتە: هاوەڵانی پێغەمبەری خوامان خۆش دەوێن، زێدەڕۆیی ناكەین لەخۆشویستنی هیچ كامێكیاندا، وە خۆمان بەریی پێشان نادەین لەهیچ كامێكیان، (پشت لە هیچ كامێكیان ناكەین)، وە ئەو كەسە دەبوغزێنین‌و ڕقمان لێیەتی كە دەیانبوغزێنێ، هەروەها هەر كەسێ بە خراپە باسیان بكات ڕقمان لێیەتی، بەچاكە نەبێ باسیان (باسی هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ناكەین، خۆشویستنیان (خوا لێیان ڕازی بێ) دینەو ئیمانەو چاكەیە، بوغزاندنیشیان كوفرەو دەغەڵییەو یاخیبوونە لە خوا.

## حەوت خاڵی گرنگ لەبارەی

## هــاوەڵان (صـحـابـة)وە خوا لێیان ڕازی بێ

یەکەم: کەسانێك کە پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە دەستی خۆی پەروەردەی کردوونو تێی گەیاندنو پێی گەیاندن، لە دوای پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەهەموو ئوممەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەبێ گەورەترو چاکتر بن، چونکە وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) توانیویەتی خەڵکی تێبگەیەنێو پێبگەیەنێ، هیچ کەس ئەو توانایەی نیە، کەواتە: ئەوانەی کە لەبەردەستی ویدا تێگەیشتوونو پێگەیشتوون، دیارە هاوەڵی هیچ کەسی دیکە لەگەڵ واندا ناچێتە تەرازووییێکەوە.

دووەم: ئنجا خوا پێغەمبەری کردوە بە سەروەری پێغەمبەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، وە کردوویەتی بە پێشەوای پێغەمبەرانی دیکە، ئنجا ئایا ئەو ئەرکەی کە کەوتۆتە سەر شانی پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، کێ لەگەڵی هەڵگرتوە؟ بێگومان هاوەڵە بەڕێزەکانی، دیارە ئەو ئەرکو بارە قورسەش کە پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و هاوەڵە دڵسۆزەکانی هەڵیانگرتوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە ئەرکی هەموو ئوممەت قورستر بووە، ئێمە کە خانوو دروست دەکەین، کامە بەردی زەبەلاحو گەورەیە، کامە بەردی پتەوو دامەزراوە، لە بناغەدا دایدەنێین، چونکە دوایی فشاری هەموو بینایەکە لەسەر ئەو بناغەیە دەبێ، پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)یش بناغەی ئیسلامەتییەو هاوەڵە بەڕێزەکانیو دڵسۆزەکانی بناغەی ئوممەتی پێغەمبەرن (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). کەواتە: لە هەموان زیاتر فشاریان لەسەر بووەو، لە هەموان زیاتر تووشی ناڕەحەتییو کێشەو موعانات بوون. کەواتە: جێی خۆیەتی لە هەموان گەورەترینو پاداشتیشیان زیاتر بێ، ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستو سروشتییە، بەڵێ ئەمە بۆچوونی ئەهلی سوننەتو جەماعەتە، کە هاوەڵو برادەرە دڵسۆزو

وەفادارەكانی پێغەمبەرمان خۆش دەوێن، بەڵكو لە هەموو كـەسمان خۆشـتر دەوێــن، چونكە سەنگی مەحەكی ئیسـلامن.

سێیەم: بەڵام هەرچەندە زۆرمان خۆش دەوێن‌و لە لامان عەزیزو خۆشەویسـتن، زێـدەڕۆیی ناكەین لە خۆشویستنی هیچ كامێكیاندا، وەك شیعەكان كە زیـادەڕۆیی دەكـەن لـە خۆشویستنی عەلییدا (خوا لێی ڕازی بێ)،گەورەی دەكەن بەسەر هەرسێك جێنشینەكەی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەبو بەكرو عومەرو عوسمان (خوا لێیـان ڕازی بـێ)، بەڵكو گەورەی دەكەن بەسەر هەموو پێغەمبەراندا، جگە لە پێغەمبەری كۆتایی (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و دەڵێن: لە هەموو پێغەمبەران گەورەتر بـووە، بینیومـە لـە كتـێبی شیعاندا كە دەڵێن: عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، جگە لە موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە هەموو پێغەمبەرانی دیكـە گـەورەترە، كـە بێگومـان ئـەوە زێـدەڕۆییكردنێكی نامەنتیقیی‌و بێ مانایە.

وەك (طەحاویی) دەڵێ: ئێمە زێدەڕۆیی ناكەین لە خۆشویستنی هیچ كامێكیانـدا، هەروەها بەرائەتیش دەرنابڕین لە هیچ كامێكیان، مادام هاوەڵی پێغەمبەر بێ‌و (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەسەر ئیمان مابێتەوە، جێی ڕێـزو تەقـدیرە لـەلامان، هەڵبەتـە بـە فریشتەیان نازانین‌و دەزانین كەم‌و كوڕییان هـەبووە، بـەڵام پێمـان وایـە كـەخوا لـە هەڵەكانیان دەبووریٚ‌و چاكەو خێریان هێندە زۆرن، كە لە بەرانبەریـاندا خراپـەكانیان هەر شایانی باس نین‌و، پاساوی زەم‌و غەیبەت كردنیان نین.

چوارەم: هەر كەسێكیش ئەو زاتانە ببوغزێنێ، ئێمەش دەیبوغزێنین، شیعەكان هـاوەڵانی دڵسۆزو بەڕێزی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەبوغزێنن، ئێمەش لەو خاڵەدا و لە هەر خاڵێكی دیكەی هەڵەدا كە هەیانە، دەیانبوغزێنین، یانی: هەر كەسـێك نێـوانی لەگەڵ هاوەڵاندا تەواو نـەبێ، ئێمـەش نێوانمـان لەگـەڵی تـەواو نیـەو، هەركەسـێك بیانبوغزێنێ، ئێمەش لەو سیفەتە خراپەیدا ڕقمان لێیەتی، چـونكە ئێمـە ئینسـانی كافریش هەر سیفەتە خراپەكەی دەبوغزێنین، وەك پێغەمبەر لـووط (عليه السلام) بـە

قەومەكەی خۆی دەڵێ: ﴿قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلۡقَالِينَ ١٦٨﴾ الشعراء، واتە: لووط فەرمووی: من ڕقم لە كردەوە خراپەكانتان هەڵدەستێ، هەروەها هەر كەسێك هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ببوغزێنێ، ئێمەش ئەو سیفەتەی دەبوغزێنین، ئنجا پێویستە بزانن، كە شیعە زۆریان عەقیدەیان وایە كەلە دوای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، هەموو هاوەڵان هەڵگەڕاونەتەوە كەمێكیان نەبێ، كە بە ژمارەی پەنجەكان دەژمێردرێن، كە بەڕاستیی ئەوە بەدگومانییەكی خراپە، وە لادانو بە هەڵەداچوونی شیعانیش لێرەوە دەست پێدەكات كە هێندە بەدبینو بەدگومانبوون بەرانبەر هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) گوتوویانە: هەموویان هەڵگەڕاونەتەوە، چونكە دەڵێن: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە دەق فەرموویەتی: عەلی لە دوای من حوكمڕانە، بۆیە هەر لە ئەبو بەكرەوە بگرە هەتا هەموو هاوەڵان كە پشتگیرییان كردو پێشەوایەتییو جێنشینایەتییان نەدا بە عەلی، هەموو هەڵگەڕاونەوە، لەسۆنگەی ئەوەوە كە سەرپێچیی پێغەمبەریان كرد!!.

بەڵام ئێمەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەڵێین: بەڵێ، زۆر جار حوكمڕانییو جێنشینایەتیی لە بواری عەقیدەدا باس دەكرێ، هەروەك لێرەدا دەیبینن[1]، بەڵام بێگومان بەشێك نیە لە بەشەكانی ئیمان، تاكو كەسێك كە لە فەرمانی حوكمڕان دەرچوو، یان بڕوای بە خەلیفەیەك نەبوو، كافر بێ، بەڵام شیعەی دوازدە ئیمامیی ئیمامەت بە پایە (ڕُكن)ی ئیمان دادەنێن، دەڵێن: هەر كەسێك بڕوای بەوە نەبێ كە (عەلی) (خوا لێی ڕازی بێ) لەدوای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئیمامو خەلیفە بووە، كافرە، ئەگەر لەگەڵ ئەو قسەی خۆیان دا ڕاست بكەنو بوێرن بیڵێن، ئەوە قەناعەتیانە!.

---

١) هەرچەندە من ئەو هەڵوێستە بەهەڵە دەزانمو، پێم وایە زیاتر دەرەنجامی كەوتنە ژێر كاریگەریی ئەهلی بیدعەتە، بەتایبەت شیعەو خەواریج، كە مەسەلەی حوكمو سیاسەتیان زۆر لە قەبارەی ئاسایی خۆی، كە شەریعەت بۆی داناوە، گەورەتركردوە لەسەر حیسابی لایەنەكانی دیكەی ئیسلام.

## شایانی باسیشە (شیعة) ئێستاكە سێ جۆری سەرەكیین:

جۆری یەكەم: شیعەی دوازدە ئیمامیی (الشیعة الإثنا عشریة) كە ئێستا لەو بارەوە هەڵوێستیان جۆراو جۆرە:

أ- هەندێكیان دەڵێن: ئەبو بەكرو عومەرو عوسمان (خوا لێیان ڕازی بێ) لە ئیسلام دەرچوون!

ب ـ وە هەندێكیان دەڵێن: بەس دەست بەسەر داگر (غاصب)ن، یانی: حوكمڕانییان لە عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) داگیركردوە!

جۆری دووەم: شیعەی زەیدیی (الشیعة الزیدیة) كە بەڕێزەوە باسی سێ خەلیفەكە دەكەنو حوكمڕانییان بەڕەوا دادەنێن، هەرچەندە (عەلی) بەچاكترو گەورەتر دەزانن، بەڵام دەڵێن: حوكمڕانیی (مفضول) دروستە!.

جۆری سێیەم: شیعەی عەلەویی كە بە (النصیریة)ش ناسراون، نەمزانیوە هیچ زانایەك بە مسوڵمانیان دابنێو نەك هاوەڵانو سێ خەلیفەكان، بگرە سەرجەم مسوڵمانان بەكافرو لاڕێ دادەنێن.

پێنجەم: بەڵام بەڕاستیی مێژووی ئیسلام، چوار خەلیفە ڕاشیدەكەی تێدا نەمێنن، هاوەڵە بەڕێزەكان (الصحابة الكرام)ی تێدا نەمێنن (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەبێتە شتێكی بێ نێوەڕۆكو بەتاڵو بۆش، چۆن دەبێ پێغەمبەرێك (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بیستو سێ ساڵ خەریكی پەروەردەكردنی هاوەڵان بێ، كەچی هەموویان هەڵگەڕێنەوە، ئایا چی بۆ ئەو پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەمێنێتەوە؟! بێگومان شتێكی زۆر بێ مانایە.

ئنجا ئێمە بە شیعە دەڵێین: باشە ئێوە دەڵێن: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) (عەلی) (خوا لێی ڕازی بێ) كردوە بە حوكمڕانو، بۆ ئیسپاتی ئەوەش ئایەتان دێننەوەو حەدیسان دێننەوە، دەڵێین: باشە (عەلی) لە ئێوە شارەزاترە، یان ئێوە لەو شارەزاترن؟ ئەگەر (عەلی) لە ئێوە شارەزاتر بێ - كە ئەوە شتێكی بەڵگە نەویستەو بۆ خۆشیان

دانی پێدادێنن - دەڵێین: بۆچی ئەو ئایەت‌و حەدیسانەی ئێوە دەیانکەنە بەڵگە، ئەو (خوا لێی ڕازی بێ) بە بەڵگە نەیهێناونەوە بەرانبەر بە هاوەڵان‌و ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان (خوا لێیان ڕازی بێ)، نەیگوتوە: من خەلیفەم‌و لەلایەن پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)ەوە دیاریی کراوم بە فلاَن بەڵگەو فلاَن بەڵگە؟ کەواتە: ئەوشتانەی ئێوە بەبەڵگەیان دێننەوە، بەڵگە نین‌و قسەی پووچن.

شەشەم: بەڵێ، هەڵوێستی ڕاست سەبارەت بە هاوەڵان ئەوەیە، کە ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتی لەسەرن‌و، جیایان دەکاتەوە لە خەواریج‌و شیعەو موعتەزیلە:

١/ خەواریج کە هەرکام لە عەلی‌و عوسمانیان (خوا لێیان ڕازی بێ) بە کافر داناوە، هەروەها موعاویەو عەمری کوڕی عاصیان (خوا لێیان ڕازی بێ) بە کافر داناوە، ئەوەی ئەوانیشی پێ کافر نەبووبێ، بە کافریان داناوە، کەواتە: خەواریج بەو هەڵوێستەیان، لە ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت جیابوونەوە.

٢/ شیعەش بە لایەنی کەمەوە، ئەبو بەکرو عومەر و عوسمانیان بەلادەر و فاسیق داناوە، وە زۆربەی هاوەڵان ئەگەر بە هەڵگەڕاوەش لە قەڵەم نەدەن، بە تاوانباریان لە قەڵەم دەدەن، دەڵێن: چونکە لەسەر ناهەق پشتگیریی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانیان کردوە، (خوا لێیان ڕازی بێ)، لێرەش شیعە جیادەبنەوە لە خەتی پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدەکانی. چونکە وەك دوایی باسی دەکەین، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەڕاشکاویی دەفەرموێ: ڕێ‌و شوێنی من‌و ڕێ‌و شوێنی جێنشینەکانم بگرن، ئنجا لە حەقیقەتدا، ئەگەر بمانەوێ ئیسلام بەبەرجەستەیی‌و جێبەجێ (تطبيق) کراویی ببینین، دەبێ تەماشای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بکەین، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ... ﴾ (٢١) الأحزاب، ئەگەر بمانەوێ لە دوای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ئیسلام لەکۆمەڵە ئینسانێکدا ببینین، دەبێ تەماشای هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بکەین (خوا لێیان ڕازی بێ)، کاتێك تەماشای هاوەڵان دەکەین، دەبینین ئیسلام

بەتەواویی‌و گشتگیریی (كاملاً و شاملاً) تێیاندا بەرجەستە بووە: هەم سوارچاكی ڕۆژی بوون، هەم خواپەرستی شەوی بوون، هەم لە بواری سیاسەتدا دەوری خۆیان بینیوە، هەم لە بواری عیبادەتدا، هەم ئەهلی تەقوا بوون‌و، هەم ئەهلی غەزا، هەم بە فرمێسكی چاوو، هەم بەخوێنی هەناو خزمەتی ئیسلامیان كردوە، هەم ئەهلی زانیاریی بوون‌و، هەم ئەهلی دادگەریی بوون، وە مەردی مەیدانی دینداریی‌و دنیاداریی بوون!

ئنجا دەڵێین: لەسەر دەستی كێ ئیسلام بە هەموو دنیا گەیشت؟ وەلەسەر دەستی كێ تاغووتەكان تەخت‌و تاجیان بەمیرات بۆ مسوڵمانان هاتەوە؟ وە لەسەر دەستی كێ، خەڵك دینی خوای پێ گەیشت‌و لەژێر دەستەیی ڕزگاركران؟ بێگومان: ئەو شیعانەی كە ئەمڕۆ لەدژی هاوەڵان قسەدەكەن ودەنووسن ودەیانبوغزێنن‌و ڕەخنەیان لێدەگرن، ئەوانیش مسوڵمانەتییەكەیان یەكێكە لەچاكەكانی سێ خەلیفە ڕاشیدەكان، چونكە لە سەردەمی عومەری كوڕی خەتتابدا، ئیسلام گەیشتە عێراق‌و شام‌و ئێران‌و میسرو زۆر لەوڵاتانی دیكەی دنیا.

حەوتەم: خوای كاربەجێ‌و زاناو شارەزا لە چەندان شوێنی قورئان دا، مەدح‌و ستایشی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)ی كردوەو ڕایگەیاندوە كە لێیان ڕازییە بۆ نموونە:

١- ﴿ لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ ﴾الفتح، واتە: بەدڵنیاییەوە خوا لەوانە ڕازی بوو، كە پەیمانیان پێدەدای لەژێر درەختەكەدا، چونكە زانی چییان لەدڵدایە، بۆیە ئۆخژنی نارده سەریان‌و بە سەركەوتنێكی نزیك پاداشتی دانەوە.

٢- ﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ

ﭽﭾ ﭿ ﮀ ﮁ ﮂ ﮃﮄ﴾التوبـة، واتــە: پێشــكەوتووە یەكەمەكـــان لەكۆچكەران‌و پشــتیوانان‌و ئەوانەی بە باشــیی شوێنیان كەوتوون، خوا لێیــان ڕازییــەو ئەوانیش لێی ڕازین، باغگەلێكـی بۆ دانـاون كە ڕووبـــاریان بـەژێردا دەڕۆن، بەهەمیشــەیی تێیاندا دەمێننەوە، ئا ئەوەش سەركەوتنی مەزنـە.

دیـارە خوای كـاربەجێش لە گۆترە مـەدحی كەس ناكــات‌و نافەرموێ لێی ڕازیـم، وەك فەرموویــەتی: (ﭿ ﮀ ﮁ ﮂ).

كەواتە: ئەدەب لەگەڵ خوای بەرزو مەزن‌و، پاشان لەگەڵ پێغەمبەرەكەیـدا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەوە دەخوازێ، كە ئێمەش لەكەسانێك ڕازی بین ،كە خوا لێیان ڕازییەو بەلای كەمەوە، زەم‌و غـەیبەتی كەسانێك نەكەین، كە خوا مـەدح‌و ستایشی كردوون.

* * * * * *

لە خاڵی (٩٤)دا دێتە سەرباسی چوار جێنشینە سەرڕاستو ڕێنماییكراوەكانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) (أبو بكر، عمر، عثمان، علي) (خوا لێیان ڕازی بێ) كە ئەوانە چوار جێنشینی بە هەقی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بوونو، دەڵێ:

٩٤) ( وَنُثْبِتُ الْخِلافَةَ بَعْدَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَوَّلاً لأَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ تَفْضِيلاً لَهُ وَتَقْدِيمًا عَلَى جَمِيعِ الأُمَّةِ، ثُمَّ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، ثُمَّ لِعُثْمَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، ثُمَّ لِعَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَهُمُ الْخُلَفَاءُ الرَّاشِدُونَ وَالأَئِمَّةُ الْمَهْدِيُّونَ ):

واتە: ئێمە خیلافەت دەچەسپێنین لە دوای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، یەكەم: بۆ ئەبو بەكری صیددیق رضي الله عنه پێشی دەخەین و بەرزی دەكەینەوە بەسەر هەموو ئوممەتدا، {یانی: ئەبو بەكر لە دوای پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە هەموو ئوممەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) گەورەترە}، ئنجا لە دوای ئەبوبەكر خیلافەت دەچەسپێنینو پێشخستن دەچەسپێنین بۆ عومەری كوڕی خەتتاب رضي الله عنه {كە لە ئوممەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەدوای ئەبوبەكر، عومەر رضي الله عنه لە پێشترین كەسەو لە هەمووشیان گەورەترەو دووەمین جێنشینی پێغەمبەریشە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، دوایی بۆ عوسمان رضي الله عنه، دوایی بۆ عەلی رضي الله عنه، (ئەوەندە هەیە لەوەدا كە ئایا عەلی رضي الله عنه گەورەترە، یان عوسمان رضي الله عنه؟ ئەهلی سوننەتو جەماعەت، زۆربەیان ڕایان وایە عوسمان گەورەترە، بەڵام هەندێك لە ئەهلی سوننەتیش، بۆ وێنە: ئەبو حەنیفە ڕای وایە كە عەلی لە عوسمان گەورەترە، هەندێكیش قسەی دیكە لە ئەبو حەنیفە نەقڵ دەكەنو دەڵێن: نەخێر، ئەبو حەنیفەش هەر بە تەرتیبی خۆیان دەیانهێنێ، (ئەبو بەكر، ئنجا عومەر،

ئنجا عوسمان، ئنجا عەلی) (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەوانەش جێنشینە سەر ڕاستەکانی پێغەمبەرو، پێشەوا ڕێ پێشاندراوەکانی مسوڵمانانن (خوا لێیان ڕازی بێ).

دیارە هەم لە ئایەت، هەم لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مەدحی زۆرو زەوەندی هاوەڵانی پێغەمبەرو چوار خەلیفەکانی کراوە، بۆ وێنە خوا (جل جلاله) لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾ کە پێشتریش هێنامانو ماناشمان کرد، بێگومان هەر ئەم ئایەتە بەسسە لە مەدحی هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)دا، بۆ ئەوە کەهەرچی تۆمەتو گومانی بەد هەیە، لە شیعەو خەواریجو چیو چیەوە، بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئاڕاستە دەکرێ، هەمووی بەرپەرچ بدرێتەوە.

چونکە خوای بەخشەر لە قورئاندا بەکەسی نەفەرمووە: لێی ڕازییمو لێم ڕازییە، مەگەر بە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کەچی بابای شیعە، یان بابای خەواریج دەڵێ: من لە ئەصحابەکان ڕازی نیم، یان دەڵێ: خوا لێیان ڕازی نیە، ئەدی ئەوە نیە خوا لێیان ڕازییە، ئنجا تۆش ئەگەر بە تەرازووی خوا هەڵدەسەنگێنی، دەبێ تۆش لێیان ڕازی بی، چونکە خوا لێیان ڕازییە، ئنجا خوای کاربەجێ هەر لە درێژەی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: چەند باغێکی، بۆ ئامادە کردوون، کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، بۆ هەمیشە لە بەهەشتەکاندا دەمێننەوە، ئەوە سەرکەوتنو بردنەوەی هەرە مەزنو گەورەیە.

بۆیە یەکێك لە زانایانی ئیسلام دەڵێ: ئەگەر لە جوولەکەکان بپرسی: چاکترینی ئوممەتی مووسا کێن؟ دەڵێن: ئەوانەن کە لەگەڵ مووسا دابوون، وە ئەگەر لە نەصرانییەکان بپرسی: چاکترینی ئوممەتی عیسا کێن؟ دەڵێن: حەوارییەکان، ئەوانەی کە لە سەردەمی عیسادا ژیاون، بەڵام ئەگەر بەوانەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّم) دەبوغزێنن، بڵێی: خراپترینی ئوممەت كێن؟ دەڵێن: ئەوانەن كە لە خزمەت پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بوون!!

كەواتە: ئەوانەی كە هاوەڵان دەبوغزێنن، كە شیعەو خەواریجن، لەو سیفەتەدا لە جوولەكەو نەصرانییەكان خراپترن، بەڕاستی ئەوە شتێكی زۆر مەترسیدارەو نووسەر جوانی گوتوە: كە ڕق لێبوونەوەی هاوەڵان: كوفرو دەغەڵیی‌و یاخیبوونە (وَبُغْضُهم: كفر ونفاق وطغيان)، سەردەكێشێ بۆ هەمووی.

من پێم وایە: كەسێك هێندە بەد بین بێ بەرانبەر بەهاوەڵان، دەبێ بەد بین بێ بەرانبەر بەپێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ئاخر دەبێ پێغەمبەر چی كردبێ، ئەگەر ئەوانەی وا پەروەردە نەكردبێ كە لە دوای خۆی ڕێگاكەی درێژە پێ بدەن‌و، هەر هەموویان هەڵگەڕێنەوە؟! ئنجا ئەگەر بەو شێوەیە بین، دەبێ بەرانبەر بەمسوڵمانانیش بەد بین، چونكە ئەگەر هاوەڵان وابووبن، دەبێ خەڵكی دیكە چۆن بێ؟

بۆیە ئێمە دەڵێین: شیعە لەو مەسەلەیەدا، خراپ بەهەڵەدا چوون‌و هەڵوێستەكەیان پێچەوانەی قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەرە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، وە پێچەوانەی عەقڵ‌و مەنتیق‌و واقیع‌و مێژووشە.

ئنجا ئایەتی دیكەش لە مەدحی هاوەڵاندا زۆرن، ئەم ئایەتەش دێنینەوە كە دەفەرموێ: ﴿... لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾﴾ الحديد،

واتە: یەكسان نین لە ئێوە، ئەوانەتان كە پێش سەركەوتن (لە پێش گرتنی مەككە)دا ماڵی خۆیان بەخشیوەو جەنگیان كردوە (لە پێناوی خوادا)، ئەوانە پلەیان مەزنترە (لە لای خوای بەخشەر) لەوانەی كە لە دواییدا ماڵی خۆیان بەخشیوەوە جەنگیان كردوە، بەڵام خوا بەڵێنی چاكی بە هەردووكیان داوە،خوا زانایە بەوەی دەیكەن.

كەواتە: ئەوانەی كە لە دوای فەتحی مەككەشەوە بوونە هاوەڵی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، هەرخوا بەڵێنی چاكی پێداون.

فەرموودەی پێغەمبەریش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) زۆرن لەو بارەوە، بۆ وێنە:

١/ یەکێك لە فەرموودەکان، کە ئەبو سەعیدی خودریی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە نێوان خالیدی کوڕی وەلید ( کە بەدرەنگەوە مسوڵمان بوو) وە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف (کە لەپێشووەکان (السابقون)ەو لەزووەوە مسوڵمان بوو بوو) شتێك بوو (دەمەقاڵێیەك بوو) خالید قسەی ناخۆشی پێگوت، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: قسەی ناشیرین بە هیچ کام لە هاوەڵەکانم مەڵێن، ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە قەدەر شاخی ئوحود زێڕ ببەخشێ، ئەوە بەقەدمستێك ماڵی ئەوان کە بەخشیویانەو بە قەد نیومستیشی نابێ، (ئەوان کاتێك ئەو مستەیان بەخشیوە کە هیچ کەس نەبووە بۆ ئیسلام ببەخشێ)[1].

٢/ لە فەرموودەیەکی دیکەدا، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: { خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ }حديث صحيح.[2]

واتە: چاکترینی خەڵکی ئەوانەن، کە لە سەردەمی مندا دەژین، دوایی ئەوانەی، کە لە دوای سەردەمی من دێن، دوایی سەدەی دوای ئەوان.

٣/ هەروەها هەر لەوبارەوە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: { «لاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ مِمَّنْ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ»} حديث صحيح.[3]

واتە: هیچ کام لەوانەی کە لە ژێر درەختەکەدا پەیمانیان (لەگەڵ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)) بەست، ناچنە دۆزەخەوە. دیارە عوسمان رضي الله عنه لەوێ نەبوو، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ناردبووی بۆ مەککە وەك نوێنەری خۆی، بەڵام کاتێك کە بەڵێن و

---

١) {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): «لاَ تَسُبُّوا أَصْحَابِي. فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَباً، مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ، وَلاَ نَصِيفَهُ»} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١٥٣٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٤٧٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٤١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٥٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٨٦١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٢٥٣).

٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِي برقم: (٢٥٠٩)، وَمُسْلِم برقم: (٢٥٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٨٥٩)، وَابْنُ مَاجَة برقم: (٢٣٦٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٢٢٢).

٣) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٤٩٦).

پەیمانی لە هەموان وەرگرت، گوتیان: ئەدی عوسمان؟ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەدەستی موبارەکی خۆی فەرمووی: ئەمەش لە جیاتی عوسمان[1]، هەتا دوایی کە ڕەخنەیان لە عوسمان گرت‌و گوتیان: تۆ بەبەر مزگێنی خوا ناکەوی کە خوای بەبەزەیی پێیان دەفەرموێ: خوا لێیان ڕازی بووە! عوسمانیش گوتی: ئەدی ئەوە نیە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: عوسمان لێرە نیە، ئەوە دەستی من لە جیاتی وی! بێگومان دەستی وی بۆمن چاکتر بوو لەدەستی خۆم، (واتە: من ئیمتیازم بەسەر ئێوەدا هەیە، ئێوە بە دەستی خۆتان بەیعەتتان دا بەپێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، بەڵام پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە دەستی خۆی بەیعەتی بۆ کردووم).

٤/ ئنجا ئەو قسەیەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودیش لە مەدح‌و سەنای هاوەڵاندا دەگێڕینەوە، کە دەڵێ: {إِنَّ اللهَ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَوَجَدَ قَلْبَ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَاصْطَفَاهُ لِنُبُوَّتِهِ، وَابْتَعَثَهُ بِرِسَالَتِهِ، ثُمَّ نَظَرَ فِي قُلُوبِ الْعِبَادِ بَعْدَ قَلْبِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَوَجَدَ قلوبَ أَصْحَابِهِ خَيْرَ قُلُوبِ الْعِبَادِ، فَجَعَلَهُمْ أَنْصَارَ دِينِهِ، مَا رَآهُ الْمُؤْمِنُ حَسَنًا فَهُوَ عِنْدَ اللهِ حَسَنٌ، وَمَا رَآهُ الْمُؤْمِنُونَ قَبِيحًا فَهُوَ عِنْدَ اللهِ قَبِيحٌ}.[2]

واتە: خوا تەماشای دڵی بەندەکانی کرد، تەماشای کرد، دڵی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) چاکترینی دڵەکانە، بۆیە خوا هەڵیبژارد بۆ پەیامبەرێتیی خۆی‌و کردی بە ڕەوانەکراوی خۆی، دوایی تەماشای دڵی بەندەکانی کرد لە دوای دڵی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تەماشای کرد دڵی هاوەڵەکانی چاکترینی دڵی بەندەکانن، بۆیە کردنی بە پشتیوان‌و قەڵا بۆ ئایینەکەی، هەر شتێك مسوڵمانان بەچاکی بزانن، ئەوە لەلای خواش چاکە، هەر شتێکیش ئەوان بە خراپی بزانن، ئەوە لەلای خواش خراپە.

---

١) {فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عُثْمَانَ وَكَانَتْ بَيْعَةُ الرِّضْوَانِ بَعْدَ مَا ذَهَبَ عُثْمَانُ إِلَى مَكَّةَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِيَدِهِ الْيُمْنَى هَذِهِ يَدُ عُثْمَانَ فَضَرَبَ بِهَا عَلَى يَدِهِ فَقَالَ هَذِهِ لِعُثْمَانَ فَقَالَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ اذْهَبْ بِهَا الْآنَ مَعَكَ} أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٤٩٥).

٢) أَخْرَجَهُ الْبَزَّارُ برقم: (١٨١٦).

## باسی (دە )هـاوەڵە موژدەی

## بەهەشـت پێـدراوەکان

ئنجا لە خاڵی (٩٥)دا بەتایبەت باسـی دە هاوەڵـە مـوژدەی بەهەشـت پێـدراوەکان (العشرة المبشّرون بالجنّة) دەکات کە بەڕیز ئەمانەن، هەرچەندە ئەویش ناوی هێناون:

١- أبو بكر الصديق.

٢- عمر بن الخطّاب.

٣- عثمان بن عفان.

٤- علي بن أبي طالب.

٥- طلحة بن عبيدالله.

٦- زبير بن عوّام.

٧- سعد بن أبي وقاص.

٨- سعيد بن عاص.

٩- عبدالرحمن بن عوف.

١٠- أبو عبيدة بن الجراح.

وەك گوتوویەتی:

٩٥) ( وَإِنَّ الْعَشَرَةَ الَّذِينَ سَمَّاهُمْ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَبَشَّرَهُمْ بِالْجَنَّةِ، نَشْهَدُ لَهُمْ بِالْجَنَّةِ عَلَى مَا شَهِدَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَقَوْلُهُ الْحَقُّ، وَهُمْ: أَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَعُثْمَانُ، وَعَلِيٌّ، وَطَلْحَةُ، وَالزُّبَيْرُ، وَسَعْدٌ،

وَسَعِيدٌ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَــرَّاحِ وَهُوَ أَمِينُ هَذِهِ الأُمَّةِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَ أَجْمَعِينَ ):

واتە: ئەو دە (١٠) کەسەی کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ناوی هێناونو موژدەی پێداون بە بەهەشــت، ئێمەش شــایەدییان بۆ دەدەین کە بەهەشـتیین، لەسـەر ئەو بنچینەیە کە پێغــەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّم) شــایەدیی بـۆ داوون، ئـەو دەیـانەش ئەوانەن: (ئەبو بەکــر، عومەر، عوسـمان، عەلی، تەڵحـە، زوبـەیر، سـەعد، سەعید، عەبدوڕڕەحمان، ئەبو عوبەیدە کە ئەمینی ئەم ئوممەتەیــە) خوا لە هەموویــان ڕازی بێ.

## گرنگیی ئـەدەب و ڕێــز بەرانبــەر بە هـاوەڵان و هاوسـەران و وەچـەی پێغـەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)

پاشان لە خاڵی (٩٦)دا لەبارەی هاوەڵانو هاوسەرانو وەچەی پاکی پێغەمبەرەوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کۆتا قسەی لەو بوارەدا دەکاتو، دەڵێ:

٩٦) (وَمَنْ أَحْسَنَ الْقَوْلَ فِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَأَزْوَاجِهِ الطَّاهِرَاتِ مِــنْ كُــلِّ دَنَــسٍ، وَذُرِّيَّاتِــهِ الْمُقَدَّسِينَ مِنْ كُلِّ رِجْــسٍ؛ فَــقَدْ بَرِئَ مِنَ النِّـــفَــاقِ):

واتە: هەر کەسێك قسەی چاك بکات دەربارەی برادەرەکانی پێغــەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و دەربارەی هاوسەرە پاکەکانی لە هەموو پیسییەك، وەوەچــە خاوێنەکەی

لە هەموو جۆرە ناتەواوییەك، ئەوە دوورو پاكە لە دەغەڵیی (نِفاق). یانی: ئینسان بەوە لە نیفاق پاك دەبێتەوەو دووردەكەوێتەوە لە موخەننەتیی كە قسەی چاك بكاتو هەڵوێستی مسوڵمانانەو ئەدەبی هەبێ، بەرانبەر بە هاوەڵانو هاوسەرە بەڕێزەكانی پێغەمبەری خـوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەتایبـەتی، دایكمـان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) كـە لەلایـەن كەسانێكی دڵ ڕەشو دڵ نەخۆشەوە تۆمەتبار دەكرێ بەوەی، كە فیتنە هەڵایسێن بـووەو شەڕی جەمەلی ساز كردوە، شیعەكان توانجو پلاری وای تێدەگرن! كە بێگومـان جگە لـە كینەو بوغزو گومانی بەد، هیچ بەڵگەیەكیان نیە، هەروەها هاوسەرە بەڕێزەكانی دیكەشی كە ئەوانە پاكن لە هەرچی خراپە هەیە، مەعصووم نـین، بـەڵام بـەو شـتانەی تۆمـەتبار دەكرێن، نەخێر ئەوان دوورنو بەریین، ئەگەرنا كەمو كورِیی هەردەبێ، هـەروەها وەچـەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەوانەی كە لە (فاطمة) بە پاش كەوتوون، ئینسانی پاكو چاك بوون، هەرچەندە ئەوانیش دیســان بێ هەڵەو گوناه نەبوون، وەك شیعە دەڵێن. ئنجا هەر كەسێ ئەدەبی چـاكی هـەبێ دەربارەیـان، ئـەوە ئـەو كەسـە لـە دەغـەڵیی دوورەو پارێـــزراوە، خوا لە هەموویان ڕازی بێو پلەو پایەیـــان هەر بەرزو بەرزتر بێ.

*****

ئەمجارە نووسەر هەرسێك خاڵی: (٩٧و ٩٨و ٩٩) تایبەت دەكات، بە هەڵوێستی ڕاستو هاوسەنگی زانایانی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، بەرانبەر بەزانایانو پێشەوایانی ئیسلامو، كەسانێك كە بەدۆستو نێزیكی خوا (أولياء الله) دادەنرێنو خاوەنی كەرامەتو ڕێزی تایبەتی خوای میهرەبانن، دیارە ئەو هەڵوێستە هاوسەنگەش، لە خۆشویستنو ڕێزلێگرتنو تەقدیركردندا خۆی دەنوێنێ، بەلام بەبێ زێدەڕۆییو تێپەڕاندن، وەك بەداخەوە لە شوێنكەوتوانی زۆرێك لە زانایانو پێشەوایان بەگشتییو بەتایبەت، شێخانی ڕێبازەكانی تەصەووف بینراوەو دەبینرێ.

سەرەتا باسی زانایانی ئیسلام دەكات كە دەبێ چۆن چۆنی مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێو، دەڵێ:

> ٩٧) ( وَعُلَمَاءُ السَّلَفِ مِنَ السَّابِقِينَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ "أَهْلُ الْخَبَرِ وَالأَثَرِ، وَأَهْلُ الْفِقْهِ وَالنَّظَرِ"، لا يُذْكَرُونَ إِلاَّ بِالْجَمِيلِ، وَمَنْ ذَكَرَهُمْ بِسُوءٍ فَهُوَ عَلَى غَيْرِ السَّبِيلِ ):

واتە: زانایانی پێشین لە ڕابردووەكانو ئەوانەی دوایان لە شوێنكەوتوان: خاوەنی هەواڵو شوێنەوار (ی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)و هاوەڵانی)، وە خاوەنی شارەزاییو تێگەیشتن، بەچاكە نەبێ باس ناكرێن، هەركەسێك بەخراپە باسیان بكات، ئەوە لەڕێی ڕاست ترازاوە.

دەگونجێ مەبەستی لە (علماء السلف) زانایانی نێو هاوەڵە بەڕێزەكانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بێ، چونكە خوا وشەی (سابقون)ی كردوە بە مەدحو شۆرەتێك بۆ (كۆچكەرانو پشتیوانان)، وەك دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ

﴿وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ ...﴾ ﴿١٠٠﴾، واتە: پێشكەوتوە یەكەمەكان، لەكۆچكەران و پشتیوانان و ئەوانەی بەچاكیی بەدوایان كەوتوون، (شوێن پێی كۆچكەرو پشتیوانانیان هەڵگرتوە)، خوا لەوان ڕازییەو، ئەوانیش لەخوا ڕازین، (طەحاویی) (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، زانایانی پێشینی كردوە بەدوو بەش:

یەكەمیان: (السابقین) واتە: كۆچكەرو پشتیوانان.

دووەمیان: (وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ)، ئەوانەی دوای وان لە شوێنكەوتوان (التابعین)، ئەوانەی كە شوێن كۆچكەرو پشتیوانان كەوتوون، چونكە وشەی: (تابعین) دوو واتای هەن:

یەكەم: مانایەكیان بە جیلی دوای هاوەڵان دەگوترێ، بۆ وێنە: هەركام لە: (ئیبنو سیرین، حەسەنی بەصریی، سەعیدی كوڕی جوبەیر) ئەوانە پێیان دەگوترێ زانایانی تابیعین، یانی: جیلی دوای هاوەڵان.

دووەم: وشەی (تابعین) مانایەكی دیكەشی هەیە، ئەویش ئەوەیە كە هەموو ئەوانەی بەدوای هاوەڵان دەكەون، جا چ لەجیلی یەكەمدا، چ لە جیلی دووەمو سێیەمو چوارەمو ئێستاو دوای ئێستادا، هەرچی بەڕاستی بەدوای هاوەڵان بكەوێ (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێیان دەگوترێ: (تابعین) واتە: شوێن كەوتوان.

ئنجا (طەحاویی) دەڵێ: زانایانی ڕابردوو لە هاوەڵانو ئەوانەی دوای وانیش لە تابعین، یانی: ئەوانەی كە بەدوای هاوەڵان كەوتوون، ئەوانەی كە خاوەنی هەواڵو شوێنەوارەكانی پێغەمبەر بوون (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، سوننەتو ڕێو شوێنەكانی پێغەمبەریان پاراستوە، ئەوانەی خاوەنی فیقهو تێفكرینو وردبوونەوە بوون لە دینی خوادا، هەركامێك لەوانە بەچاكە نەبێ، نابێ باسیان بكرێ، هەر كەسێك بە خراپە باسی زانایانی ئیسلام بكات، چ لە پێشكەوتوان (سابقین) چ لە شوێنكەوتوان (تابعین)، ئەوە لەسەر ڕێیەكی ناڕاستە.

## براو خوشکە بەڕێزەکانم!!

هەر بیرو بڕوایەك كـە دەپـارێزرێ، بـەهۆی زانایانـەوە دەپـارێزرێ، ئیسـلام بـەهۆی زانایانەوە گەیشتۆتە ئێمە، ئەو ئیسلامە تا گەیشتۆتە ئێمە، قورس لەسـەریان كـەوتوە، هی وایان هەیە سەری خۆی لەسەر داناوە، یان ماڵی لە پێناودا داناوە، هی وا هەیە سەرو ماڵی لە پێناودا داناوە، هی وایان هەیە لە پێناویدا لە سجندا گیانی دەرچـووە، زانایـان تووشی چەندان دەردو میحنەت بوون،ئەوجار ئیسلام گەیشتۆتە دەستی ئێمە، ئێـوە كـە ئەمڕۆ كەسانێك دەبینن لە بەرگی زانایاندا، نە لە دینی خوا زانان‌و نەتواناشن، بەوە نابێ زانایانی ئیسلامان لەبەر چاو بكەوێ، ئەو ئیسلامە كە گەیشـتۆتە دەسـتی ئێمـە، ئـەو شەریعەتە زۆر بە قورسی گەیشتۆتە ئێمە، هەوڵی زۆری لە پێناو دراوە، بۆ وێنـە: چـوار پێشەوایەكە (ئەبو حەنیفە و شافیعیی و مالیك و ئەحمەد) هەر كام لەم چوارە، تووشـی میحنەتی زۆر بوون: ئەبو حەنیفە (خوا لێی ڕازی بێ) لەبەر ئەوەی ئامادە نەبوو بـبێ بـە قازی قازییەكان (قاض القضاة) لەسەردەمی ئەبو جەعفەری مەنصورڕدا، گـیراو ئەزیـەت درا، بەڵام تۆزقاڵێك تەنازولی نەكرد.

مـالیك لەبەرئەوەی گوتبـووی ئەوانـەی بـەزۆر تـەلاقیان پێخـوراوەو بەیعـەتیان لـێ وەرگیراوە، بە هەڵوەشاندنەوەی بەیعەتەكانیان تەلاقیان ناكەوێ، چـونكە عـەبباسـییەكان عـادەتیان وابوو بەیعـەتیان وەردەگـرت لـە خـەڵكی بەتەلاقـەوە، بەیعـەتیان لـە كـابرا وەردەگرت‌و دەیانگوت: دەبێ تەلاقیش بخۆی، تاكو ئەگەر بەیعەتەكەی شكاند، تەلاقیشی بكەوێ! ئنجا مالیك فەتوایدا، كە ئەو تەلاقە ناكەوێ‌و ئەم شوێنەوار (أثر)ەی بە بەڵگـە هێنایەوە: {«لَيْسَ عَلَى مُسْتكرِهٍ طَلاَق»}[1] واتە: بەزۆر تەلاق پێخوراو تەلاقی ناكەوێ. لەسەر ئەو فەتوایە ئەوەندەیان لێدا تاكو قۆڵی دەرچوو.

---

١) عن إبن عباس قال {لَيْسَ لِمُكْرَهٍ وَلا لِمُظْطَرّ طَلاَق}. بڕوانە: المحلى، لابن حزم الأندلسي، ج١١ ص٢٤٩، المسألة: ١٩٧٠.

ئەحمەد لەسەر ئەوەی نەدەچووە سەر ڕای موعتەزیلە کەدەیانگوت: قورئان مەخلووقە، زۆر لە سجندا مایەوەو هەزار (١٠٠٠) قامچیی زیاتری لێدرا، بەڵام تەنازولی نەکرد.

هەروەها شافیعیی لەژێر فشاری عەبباسییەکاندا، بۆ سەلامەتی دینەکەی، بۆ میصر ڕایکردو عێراقی بەجێهێشت.

هەروەها زانایانی دیکەی دوای وانیش‌و، پێش ئەوانیش دیسان لە گرفتاریی‌و زیندانیی کردن‌ودەرکران‌و کوژران سەلامەت نەبوون.

هەروەها لەزانایانی هاوچەرخیشمان بەهەمان شێوە، نارەحەتیی زۆریان بینی‌و فیداکاریی زۆریانکرد، بۆ نموونە: هەرکام لە: حەسەن بەننا، مەودوودیی، سەعیدی نورسیی، سەید قوتب، عەبدولقادر عودة ، شیخ ناصرالدین الألباني، أبوالحسن النَّدوي، نجم الدین أربکان، کاك أحمدی موفتی زادە، کاك ناصری سوبحانی....، هەموو ئەوانە کە زانای ڕەسەن‌و بەرجەستە بوون، بە گیان‌و ماڵی خۆیان فیداکارییان کردوە.

کەواتە: ئێمە دەبێ لە سەر ئەو هەموو زەحمەت کێشان‌و فیداکارییەیان دوعای خێریان بۆ بکەین، دەبێ ڕێزو ئەدەبمان بەرانبەریان هەبێ، نابێ کە هەڵەیەکمان لێیان بینی، دەهۆڵیان بۆ بکوتین، چونکە ئەگەر هەڵەیەکیان دەبینی، هەزار چاکەشیان دەبینی، هەڵبەتە ئێمە ناڵێین زانایانی ئێمە لە هەڵەو گوناح پارێزراو (مەعصوم)ن، تەنیا پێغەمبەران مەعصومن، بەڵام ئەوانەی بەبێ ڕێزیی‌و شێوازی ناجوان باسی زانایان دەکەن، ئەوە پێچەوانەی ئاکارو ئەدەبی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت دەجووڵێنەوە.

ڕەوشتی ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت وایە، کە ئێمە دەبێ ڕێز لە زانایانمان بگرین‌و دوعای خێریان بۆ بکەین، چونکە خوا(جل جلاله) کە باسی کۆچکەران دەکات لە سوورەتی (الحشر)دا دەفەرموێ: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾﴾ الحشر،

وەك دەبینین خوا بە چاکترین سیفەتیان مەدحیان دەکات، ئنجا دوایی کە دێتە سەر باسی

پشتیوانان، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلۡإِيمَٰنَ مِن قَبۡلِهِمۡ يُحِبُّونَ مَنۡ هَاجَرَ إِلَيۡهِمۡ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمۡ حَاجَةٗ مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٩ ﴾الحشر، وەك دیارە خوا، پشتیوانەكانیش بە چاكترین سیفەتیان مەدح دەكات، دواییش كە دێتە سەر باسی ئەوانەی كە بەدوای كۆچكەرانو پشتیوانان كەوتوون، واتە: شوێنكەوتوانیان، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ١٠ ﴾، واتە: ئەوانەی لەدوای هاوەڵانەوە هاتوون، دەڵێن: پەروەردگارمان ! لە ئێمەو لەو برایانەمان خۆش بە، كە لە پێش ئێمەدا ئیمانیان هێناوەو بوغزو كینەمان مەخە دڵ بەرانبەر بەبڕواداران، واتە: دوعا دەكەن بۆ برایانیان، كە لە پێش خۆیان خزمەتی دینی خوایان كردوە.

كەواتە: لە كاتێكدا ئێمە كتێبەكانی (ئیبنو تەیمییە) دەخوێنینەوە، یان هی (غەزالیی) و قسەكانی حەسەنی بەصریی، یان شافیعیی، یان هەر كامێك لەو زاناو پێشەوایانە دەبینین، نابێ وەك مێشەڕەشە، كە بەس بەدوای خاڵی ڕەشدا دەگەڕێ، هەر بەدوای هەڵەكانیاندا بگەڕێین، بەڵكو دەبێ وەك ئاوێنەبین، كە وەك چۆن هەڵەكانیان دەبینین. چاكەكانیشیان ببینین، ئەوكاتە تاكو هەڵەیەكیان دەبینی، سەد چاكەیان دەبینی، بۆ وێنە: (غەزالیی) لە كتێبی (إحياء علوم الدين)دا هەندێ شتی وای گوتوە، كە لەگەڵ ڕووحی ئیسلامدا ناگونجێ، هەندێ حەدیسی هێناون كە صەحیح نین، یان هەر ئەصڵیان نیەو حەدیسی پێغەمبەر نین (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، یان لە هەندێ شوێنی كتێبەكەیدا زۆر زێدەڕۆیی كردوە لە مەسەلەی دنیا بەكەم گرتنو تەصەووفو تەزكیەدا، بەڵام هاوكات لەگەڵ ئەوەش هەندێ شتی زۆرگرنگیشی گوتوە، كە ڕەنگە لەو كتێبەدا نەبێ چنگت

نەکەویٚ، تۆ کە هەڵەیەك، یان دوو هەڵان دەبینی، هەمووی زەڕب پێدا بینی، ئەوە بێ ئینصافییە، یان (ئیبنو تەیمیە) هەندێ فەتواو قسەی وای هەن، کە تایبەتن بەخۆیەوەو، پێچەوانەی جەماوەری زانایان هەندێ شتی گوتوە، ئنجا پێکابێتی، یان نەیپێکابێ، ئێمە نابێ لێی بکەین بە هەراو گاڵە، چونکە زانایەکە وەك چۆن چەند شتێکی هەیە کەسانێك لێی ناڕازین، هەزاران شتیشی هەیە، کە سەری مسوڵمانانی بەرز کردۆتەوە، هەروەها (موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب) یەکێك بووە لە پێشەوایان، هەندێ شتی هەیە کە ئێمە دەڵێین: توندو هەڵەیەو زانایان تێبینییان لەسەری هەیە، بەڵام گەلێ شتی گوتوە کە بەرچاوی زۆرێك لە مسوڵمانانی لەهەندێك ڕووەوە ڕوون کردۆتەوە.

ئنجا وەك مالیك دەڵێ: (کُلٌّ یُؤْخَذُ مِن قَوْلِهِ ویُردُّ عَلَیْهِ إلاّ صاحِبَ هذا القَبر) ڕۆژێك مالیك لە لای قەبری پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ڕاوەستابوو ،گوتی: هەموو کەسێك قسەی لێ وەردەگیرێو بەسەری دادەدرێتەوە، بێجگە لە خاوەنی ئەم قەبرە. واتە: پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم).

ئەوە شتێکی گرنگەو دەبێ وریا بین، زانایانمان بە چاوی حورمەتەوە تەماشا بکەین، بەو ئەندازەیە کە زانانو، بەو ئەندازەیەش، کە دینی خوایان پێوە دەبینینو میراتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەپارێزن.

## باسی دۆستانی خواو كەرامەتەكانیان

ئنجا لە خاڵی (٩٨)دا دێتە سەر باسی دۆستانی خوا (أولیاء الله) ، چونكە بێگومان دۆستان و نێزیكانی خوا بەزۆریی لەنێو زانایانو پێشەوایان دان، هەرچەندە بەگشتییش لەنێو هەموو چینو توێژەكاندا لەهەموو ئاستە فیكرییەكاندا، هەرهەن، دەڵێ:

٩٨) ( وَلا نُفَضِّلُ أَحَدًا مِنَ الأَوْلِيَاءِ عَلَى أَحَدٍ مِنَ الأَنْبِيَاءِ عَلَيْهِمُ السَّلام، وَنَقُولُ: نَبِـــيٌّ وَاحِدٌ، أَفْضَلُ مِنْ جَمِيعِ الأَوْلِيَاءِ ):

واتە: وەهیچ كام لە دۆستانی خوا بە چاكتر دانانێین‌و هەڵنابژێرین بەسەر هیچ كام لـە پێغەمبەرانی خـوادا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، وە دەڵـێین: یـەك پێغەمبـەرێك لـە هـەموو دۆستانی خوا باشترە.

ئەوەی بۆیە گوتوە: هەرچەندە ئێستا[1] هیچ كەس نیە بڵـێ: (أولیـاء) گـەورەترن لـە (أنبیاء)، بەڵام كاتی خۆی، كە ئەبو جەعفەری طەحاویی ئەو كتێبـەی دانـاوە، هێنـدێ كەس لە ژێر پەردەی تەریقەت‌و تەصەووفدا، گەلێ شتی وایان گوتوە، شـتی بـێ جـێ و نامەعقوڵ، بۆ وێنە: (محي الدین إبن عربي) خاوەنی كتێبی (الفتوحـات المكیـة)و كتـێبی (فصوص الحكم)و گەلێ كتـێبی دیكەشـی هـەن‌و بـە شـێخی گـەورەتر (الشـیخ الأكـبر)

---

١) بێجگە لە شیعەی دوازدە ئیمامی كە زۆریان ئیمامەكانیان پێ وەك پێغەمبەران علـیهم السـلام و بگـرە بەرزتریشە!! وە ئەم تەعبیرە تەعبیرێكی باوە لە كتێبەكانیان دا: (إنَّ لأئمتنا منزلةً لا يَبْلُغُها مَلَكٌ مُقَرَّبٌ ولا نَبِيٌّ مُرْسَلٌ)، بڕوانە: {فقه الحكومة الإسلامية بين السنّة والشيعة، وقـراءة في فكـر الثـورة الإيرانيـة} للدكتور توفيـق محمـد الشـاوي، ص٧١، كـە ئـەم دەقـە لـە (خمـيني)یـەوە دێـنێ لـە كتـێبی (الحكومـة الإسلامية)كەی دا لاپەڕە (٥٩): {إن من ضرورات مذهبنا الشيعة الإمامية أن لأئمتنا مقامـاً لا يَبلُغُـه مَلَكٌ ولا نبـيٌّ مرسل}.

بەناوبانگە، مامۆستای ئەوانە بووە، كە مەسەلەی (وحدة الوجود)یان تەرح كردوەو گوتوویانە: هەموو شتێك خوایە، یان خوا لە هەموو شتێكدا هەیە، وە وایان تەصەوور كردوە كە خوا ڕووحی بوونەوەرە، وەك چۆن ئینسان جەستەی هەیەو ڕووحەكەشی لە نێو جەستەكەیدایە، گوتوویانە: ئەم بوونەوەرەش لەگەڵ خوادا بەهەمان شێوەیە! بەتایبەت لە (فصوص الحكم)دا گەلێك شتی گوتوە، كە زۆر بێ جێ و نامەعقوولەو، هەم پێچەوانەی دینە، هەم پێچەوانەی عەقڵو مەنتیقو زانستیشە.

بۆ وێنە: (إبن عربي) دەڵێ: من (خاتم الأولياء)م وەك چۆن پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) (خاتم الأنبياء)ە!![1]، هەروەها هەندێك قسەی دیكەیان كە (شطحات)ی پێ دەڵێن، واتە: قسەی هەڵە، بۆ وێنە: هەندێكیان گوتوویانە: مرۆڤ لەڕێی تاعەتو تەقواوە وای لێدێ، لە پێغەمبەر زیاتر بەرز دەبێتەوە! ئەو بەسەرهاتەش كە لە سووڕەتی (كهف)دا هاتوە كە عەبدە صاڵحەكە هەندێ شت دەزانێ، پێغەمبەر مووسا نایزانێ، دەیكەنە بەڵگەو دەڵێن: ئەو عەبدە صاڵحە هەندێ شتی دەزانی، مووسا نەیدەزانی!! بەڵام ئەوە هیچ نابێتە بەڵگە، چونكە مەرج نیە، كە پێغەمبەرێك (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كە لە هەموو خەڵكی گەورەترە لە هەموو كەسێ زاناتر بێ، بەڵگەمان هەیە: بێگومان پێغەمبەری خوا موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە مووسا گەورەتر بووە، كەچی لە شەوی میعراجدا وەك لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە: پێغەمبەر موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەو شوێنو مەقامە،كەگفتو گۆی لەگەڵ خوادا كردوە، دەگەڕێتەوەو لە ئاسمانی شەشەم تووشی مووسا دەبێ، مووسا پێی دەفەرمووێ: خوای پەروەردگار چی لەسەر ئوممەتەكەت فەرز كرد؟ دەفەرمووێ: لە شەوو ڕۆژێك پەنجا نوێژ، دەڵێ ئەوە زۆرە، من لەگەڵ بەنی ئیسرائیل زۆرم گرفتاریی دیوە، بۆیان جێبەجێ ناكرێ، داوا لەپەروەردگارت بكە، بۆت كەم بكاتەوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەرز دەبێتەوە بۆ شوێنی یەكەمجاری و داوا

---

١) بڕوانە: (الفتوحات المكية) ج١ ص٣٥٥، كە ئەمە دەقی قسەكەیەتی:{أَنِّي في الأَتْباع من صِنْفِي كرسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) في الأنبياء، وعسى أن أكون من ختم الله الولاية بي وما ذلك على الله بعزيز}.

دەکات ،خوای بەبەزەیی بۆی دەکاتەوە بە چل‌و پێنج نوێژ، دیسان مووسا (عليه السلام) دەڵێ: زۆرە، بەردەوام ئەوە دووبارە دەبێتەوە، تا بۆی دەکاتە پێنج نوێژ، لێرەدا پێغەمبەر مووسا ئیرشادی پێغەمبەری کۆتایی خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەکات کە بێگومان ئەمە ئەوە ناگەیەنی کە مووسا لە پێغەمبەری خاتەم (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) گەورەترە، یا مەسەلەیەکیش بزانێ کە پێغەمبەری خاتەم (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نایزانێ، ئەو عەبدە ساڵحەش کە هەندێك دەڵێن: ناوی (خضر)ە[1]، ئەوە هیچ دەلیلێکی تێدا نیە لەسەر گەورەتربوون‌و چاکتربوونی لە مووسا، یا هەندێ مەسەلەش بزانێ کە مووسا نەیزانیبێ، ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەو عەبدە ساڵحە گەورەترە[2].

ئنجا لە خاڵی (٩٩)دا بەباسی کەرامەتەکانی دۆستانی خوا (كرامات أولياء الله) کۆتایی بەقسەکانی لەبارەی زاناو پێشەوایان‌و دۆستانی خواوە دێنێ‌و، دەڵێ:

٩٩) (وَنُؤْمِنُ بِمَا جَاءَ مِنْ كَرَامَاتِهِمْ، وَصَحَّ عَنِ الثِّقَاتِ مِنْ رِوَايَاتِهِمْ):

واتە: بڕوامان بەو کەرامەتانەی دۆستانی خوا هەیە، کە لە ڕێی متمانە پێکراوانەوە بۆمان گێڕدراوەتەوە، لە بەسەرهاتەکانیان، واتە: بڕوامان هەیە بەوەی هاتوە لە کەرامەتەکانیان، لە حورمەت‌و ڕێز لێگرتنی خوا بۆ ئەوان،ئەو بەسەرهاتانەی کە ڕاست‌و دروستن‌و لە متمانە پێکراوانەوە پێمان گەیشتوون، بڕوامان پێیان هەیە.

---

١) وەك لە (صحيح البخاري)دا بەسەرهاتەکەی بەدرێژیی هێناوە بڕوانە: ژمارە: ٤٧٢٥، ص٨١٤، ٨١٥. هەروەها بڕوانە: (صحيح مسلم): ١٨٤٧.

٢) بەلام بە پێغەمبەر لەقەڵەم دانی (خَضِر) ڕایەکی بێهێزەو تەنیا کەمینەیەك لە زانایانی صۆفی مەشرەب وایان گوتوەو هیچ بەڵگەیەکیشیان بەدەستەوە نیە، (عبدالرحمن بن ناصر السعدي)یش لەو بارەوە گوتوویەتی: (...ومنها: أن ذلك العبد الذي لقياهُ، ليس نبياً، بل عبداً صالحاً، لأنه وصفه بالعبودية، وذكر مِنَّة الله عليه بالرحمة والعلم، ولم يذكر رسالته ولا نبوَّته، ولو كان نبياً، لذكر ذلك كما ذكره غيره...) تيسير الكريم الرحمن ص٤٨٤.

## پێناسەیەكی: (موعجیزە، كەرامەت، جادوو):

١- موعجیزە (المعجزة): ئەو بەڵگە دەستەوستانكەرەیە[1] كە پێغەمبەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، تەحەدداى خەڵكیان پێكردوەو، ئیسپاتی پێغەمبەرایەتییان پێكردوەو گوتوویانە ئێمە پێغەمبەرین، بە چ بەڵگەیەك؟ پێغەمبەری خاتەمی خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: قوڕئانم پێیە، پێغەمبەرمووسا (عليه السلام) فەرموویەتی: مـن گۆچانم پێیە، عیسا (عليه السلام) فەرموویەتی: مردوان زیندوو دەكەمـەوە. كەواتـە: موعجیزە بەڵگەی پێغەمبەرانە (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام).

٢- كەرامەت (الكرامة): بریتیە لەو شتە پێچەوانەی عادەتو یاسا سروشتییانە (خوارق العادة)ی كە خوا لەسەر دەستی هەندێك لە دۆستانی خۆی، پەیدایان دەكات.

٣- جادوو (السحر): بریتیە لەو یاسادڕ (خارق العادة)انەی كە كەسانێك لە شەیتانەكانەوە نزیكن‌و لە خوا دوورن، شەیتانەكان یارمەتییان دەدەن بە هۆی ڕووحی پیسی خۆیان كە پەروەردەیان كردوە، هەندێ شت دەكەن كە یاسادڕ (خارق العادة)ەو پێچەوانەی نەریت‌و یاسا سروشتییەكانە.

جیاوازیی نێوان كەرامـەت‌و مـوعجیزە ئەوەیـە، كـە مـوعجیزە لەگـەڵ ئیـددیعای پێغەمبەرایەتییدایـە، بـەڵام ئەوانـەی كـە ئـەهلی كەرامـەت بـوون، ئیـددیعای پێغەمبەرایەتییان نەكردوە، هـەر كەسـێك ئیـددیعای پێغەمبەرایـەتیی كـرد، لـە دوای پێغەمبەری خاتەم (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شتی یاسادڕ (خارق العادة)شی لەدەسـت پەیـدا بوو، بۆ وێنە: بەسەر ئاوێدا ڕۆیی، یان بە هەوادا ڕۆیی، ئەوە ناڵێین: كەرامەتە، دەڵـێین: سیحرە، یان دەڵێین : ئەوە چاوبەست‌و تەڕ دەستیی (شَعوَذة و خفة اليد)ە بۆچی؟ چـونكە

---

١) شێخ موحەممەدی خاڵ بەڕەحمەت بێ وشەی (معجزة)ی بە (دەستەوستانكەر) لێكداوەتەوەو پێم وایە باشیشی پێكاوە.

دەڵـێین: هەرکـەس ئیـددیعای پێغەمبەرایـەتیی کـرد، درۆی کـردوەو بابـای درۆزنو ساختەچییش، هیچ ڕێزو حورمەتی لەلای خوا نیەو یارمەتی نادات، گرنگ ئەوەیە بزانین کەکەرامەت لەگەڵ شەعوەذەو چاوبەستەکیێ، جیاوازییـان ئەوەیـە کەکەرامـەت لەسـەر دەستی کەسانێك دەبێ کە پابەندن بە شەریعەتی خواوەو ئیستیقامەتیان هەیـە لەسـەر شەریعەتی خواو خاوەنی ئەوپەڕی ئیمانو تەقوان، وەك خوا (عز وجل) دەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾يونس، واتە: ئاگاداربن دۆستانی خوا نەترسیان هەیەو نە پەژارەیان هەیە، ئنجا ئـایـا دۆستانی خـوا کێـن؟ ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾﴾يـونس، واتـە: ئەوانەن،کـە ئیمانیـان هێناوەو پارێز دەکەن. کەواتە: هەر کەسێك ئیمانو تەقوای تەواومان تێیدا نەدی، ئەگەر شتی یاسادڕ (خارق العادة)شمان لێبینی، ناڵێین: کەرامەتە، دەبێ مرۆڤـ خاوەنی ئەوپەڕی ئیمان و تەقوابێ، ئنجا شتە (خارق العادة)کانی بە کەرامەت لە قەڵەم دەدەین، ئەگـەرنا بە پێچەوانەوە بەجادوو (سحر)، یان پەلکێشکران[1] بـۆ تـاوان (إستِدْراج)ی لـە قەڵـەم دەدەین، وەك زانایان ڕوونیان کردۆتەوە.

کەواتە: ئەوەی لە هیندۆسەکان دەیبینین، یان لە هەندێك دەروێشی خۆمان دەیبیـنین، زەرگـو تیرو شیر لە خۆیان دەدەن، بەڵام نوێژێ ناکەن، ناڵێین: ئەوە کەرامەتە، دەڵێین: ئەوە مەعوونەیە[2] یان ئیستیدراجە، ناشڵێین: سیحرە، چونکە سیحر عیلمێکە دەبێ بخوێنرێو

---

١) بۆ مانـای (إستدراج)م بـەکارهێنا کـە وادیـارە زانایـان لـە فـەرموودەی خـوا: ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ وَأُمْلِى لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ ﴿١٨٣﴾﴾ الأعراف. وەریان گرتوە.

٢) المعونة: زانایان بۆ کەسێکیان بەکارهێناوە کە (فاسق)ەو شتی یاسادڕ (خارق العادة)ش دەکات، واتە: ئەو کەسە نەهێندە پارێزکارو صالحە شتەکەی بەکەرامەت بزانرێو، نەهێندەش خراپە بەپەلکێشکران (إستدراج) دابنرێ. کەواتە: دەگونجێ (معونة) بۆ مسوڵمانی ئاسایی سادە ببێ کە بریتیە لە یارمەتی دانی خوا بۆی، بێ ئەوەی لەکردەوەکەی ڕازی بێ!!.

مومارەسەیەکە دەبێ بکرێ، بەڵام ئێمە دەزانین ئەو دەروێشە جادووی نەخوێندوەو نایزانێ، هەندێکیش دەڵێن: ئەگەر کەسەکە خۆی شایستەیی نەبێ کە بڵێین: ئەوە کەرامەتە بۆخۆی، دەڵێین: ئەوە کەرامەتە نەك بۆخۆی، بەڵکو بۆ شێخەکەی، ئەگەر شێخەکەشی ئەهل نەبێ، بۆ شێخی شێخەکەی، ئەگەرنا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زنجیرە پاکەی کە ئەو موریدە خۆی بە شوێنکەوتوویان دەزانێ، بەڵام لەڕاستیدا من هەرچەندە کاتی خۆی ڕام وابووبێ، بەڵام ئێستا پێم وایە: ئەوە پینەو پەڕۆیەکی مەحکەم نیە، باشتر وایە بڵێین: ئەوە ئیستیدراجە، یان مەعوونەیە، یانی: بەهۆی شەیتانەکانەوە ئەو شتە دەکرێ، چونکە زۆربەی ئەوانە نوێژو ڕۆژووشیان وەك پێویست نیە، گەلێ جار شیرکیشیان لێ پەیدا دەبێ، کابرا هاواردەکاتە شێخەکەی، کە ئەوە (إستغاثة)یە، یان هاوار (نداء)ەو هەردووکیان شیرکن.

ئنجا لە هەموو ئەوەی ڕابرد چاکتریش ئەوەیە: لە کتێبی (ڕێگای صالح بوون...)دا لەو بارەوە باسم کردوە کە:

وەك چۆن بەدەنی ئینسان، ئەگەر وەرزشی پێ بکات‌و ڕای بێنێ، دەتوانێ شتی وا بکات کە پێچەوانەی عادەتی خەڵك بێ، بۆ وێنە: بابای کاراتێ، بەردێکی گەورە بەدەست دەشکێنێ، یان جومناستیك جموجۆڵی سەیر سەیر دەکات، لە ئەنجامی ڕاهێنانـدا جووڵەکانی پێچەوانەی عادەتی خەڵکن، ڕووحیش بە هەمان شێوە، ئەگەر بەباری چاکدا ڕاهێنرابێ‌و پەروەردە کرابێ کەرامەتی لێ پەیدا دەبێ‌و، ئەگەر بەباری خراپدا ڕاهێنرابێ جادوو و شەعوەذە، یان حاڵەتی ڕووحیی نامۆی لێ ڕوودەدات. کەواتە: ئینسان ،چ بە باری خێردا، چ بە باری شەڕدا، ئەگەر ڕووحەکەی ڕاهێنرابێ، حاڵەتی یاسادڕ (خارق العادة)ی لەسەر دەست ڕوودەدات، چونکە ئەگەر دەروێشەکانی ڕێبازی قادریی‌و ڕێبازی ڕیفاعی لەنێو ئێمەی مسوڵمان دا مووس‌و شووشە دەخۆن‌و، شمشێرو زەرگ لە جەستەی خۆیان ڕادەکەن‌و...هتد، هیندۆسییەکانیش شتی شێوەی ئەوان دەکەن، بەڵکو جاری وایە پێشیشیان دەکەونەوە، ئنجا ئەگەر هی دەروێشەکانی ئێمە کەرامەت بێ، ئەدی هی هیندۆسییەکان چییە؟!

## نیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی

نووسەر لەم خاڵی (١٠٠)ەدا دێتە سەر باسی نیشانەکانی (نیشانە گەورەکان)ی هاتنی کاتی تێکچوونی دنیا (الساعة)و چواری سەرەکییان لێ ڕیز دەکاتو، دەڵێ:

١٠٠) ( وَنُؤْمِنُ بِأَشْرَاطِ السَّاعَةِ: مِنْ خُرُوجِ الدَّجَّال، ونُـزُولِ عِيسَى ابنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلامُ مِنَ السَّماءِ، وَنُؤْمِنُ بِطُلُوعِ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَخُرُوجِ دَابَّةِ الأَرْضِ مِنْ مَوْضِعِهَا ):

واتە: بڕوامان بەنیشانەکانی ڕۆژی دوایی هەیە لە: دەرچوونی دەججالو هاتنە خوارەوەی عیسای کوڕی مەریەم لە ئاسمانێ وە (سەلامی خوای لێبێ)و هەڵهاتنی خۆر لە ڕۆژئاواوەو دەرچوونی ئاژەڵی زەوی (دابّة الأرض) لەشوێنی خۆی.

ئەوانە چوار نیشانەن لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی، پێش ئەوەی ڕۆژی دوایی بێ، چەند نیشانەیەك خەڵك دەیانبینێ، وەك پێشەکیو ڕێ خۆشکردنێك بۆ هاتنی ڕۆژی دوایی، پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە فەرموودەیەکدا فەرموویەتی: {«إِنَّ أَوَّلَ الآيَاتِ خُرُوجًا طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا أَوِ الدَّابَّةُ عَلَى النَّاسِ ضُحًى، فَأَيَّتُهُمَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا فَالأُخْرَى عَلَى أَثَرِهَا»}حديث صحيح.[1]

واتە: یەکەمین نیشانە لە نیشانەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی، هەڵهاتنی خۆرە لە ڕۆژئاواوە، وە هاتنە دەری زیندەوەرە لە کاتی چێشتەنگاوێدا، هەر کامێك لەو دوانە پێش هاوەڵەکەی کەوت، ئەوی دیکە بەدوایدا دێ.

سەبارەت بەو نیشانانەی ڕۆژی دوایی، فەرموودەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) زۆر هەن، بۆ وێنە یەکێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەمەیە: { عَنْ

١) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٣١٢) قَالَ الشيخ الألباني: صحيح.

حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ اطَّلَعَ النَبِـيِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ السَّاعَةَ، فَقَالَ: مَا تَذْكُرُونَ، قَالُوا: نَذْكُرُ السَّاعَةَ، فَقَالَ: إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ عَشْرَ آيَاتٍ: الـدُّخَانُ وَالـدَّجَّالُ وَالدَّابَّةُ وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَـا وَنُـزُولُ عِيسَـى ابْـنِ مَـرْيَمَ وَيَـأْجُوجُ وَمَـأْجُوجُ وَثَـلاثُ خُسُوفٍ، خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنْ قِبَلِ تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ }حديث صحيح.[١]

واتە: حوزەیفەی کوڕی ئەسید (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ڕۆژێکیان پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لێمان وەدەرکەوت، باسی ڕۆژی دواییمان دەکـرد، فـەرمووی: باسـی چـی دەکەن؟ گوتیان: باسی ڕۆژی دنیا تێکچوون دەکەین، فەرمووی: ڕۆژی دوایی نایەت، تاکو دە (١٠) نیشانان نەبینن: دووکەڵ (دووکەڵێك پەیدا دەبێ هەموو دنیا داگیر دەکـات)، دەججال، داببە، هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوە، هاتنە خوارێی عیسای کوڕی مەریەم، هاتنە دەری یەئجووجو مەئجووج، سێ شوێنیش ڕۆ دەچن: شوێنێك لە ڕۆژهـەڵات ڕۆ دەچـێ، شوێنێك لە ڕۆژئاوا، شوێنێکیش لە دوورگەی عەرەب ڕۆدەچێ، کۆتایی ئـەو نیشـانانەی ڕۆژی دوایی، ئاگرێکە لە یەمەن دێتە دەرێ ،خەڵکی پاڵ پێوە دەنێ بۆ ئەو شوێنەی کـە خەڵکی لێ حەشر دەکرێ.

پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەربارەی دەججـال، زۆری شتی فەرمووە، لە یەکێك لە فەرموودەکـاندا دەفەرموێ: { إِنَّ اللهَ لا يَخْفَى عَلَـيْكُمْ، إِنَّ اللهَ لَـيْسَ بِـأَعْوَرَ وَأَشَـارَ بِيَـدِهِ إِلَى عَيْنِهِ وَإِنَّ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ أَعْوَرُ الْعَـيْنِ الْيُمْنَى، كَأَنَّ عَيْنَـهُ عِنَـبَةٌ طَـافِيَةٌ} حديث صحيح.[٢]

واتە: خوا لە ئێوە پەنهانو شێرراوە نیە، (نیشانەو سیفەتەکانی خوا لە ئێـوە پـەنهان نین)، خوا یەك چاو نیە،پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بەدەستی موبارەکی خۆی ئاماژەی بۆ چاوی خۆی کرد ،بەڵام مەسیحی دەججال چاوی ڕاستەی کوێرە، چاوی ڕاستی وەك بۆڵووە

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦١٨٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين.

٢) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٩٧٢)،

ترێیەکی هەڵدمساوە، یـان سـەراوكەوتوویە. لـە فەرموودەیـەكی دیكـەدا دەفـەرمویٚ: {دەججاڵ یەك چاوە، بەڵام خوای ئێوە یەك چاو نیە، دەججاڵ لە نێوچەوانی نووسراوە: ك ف ر، (واتە: كافر) هەموو ئینسانێك دەیخوێنێتەوە، با خوێندەواریشی نـەبیٚ}[1]، هەڵبەتە دەججاڵ ئیددیعای خوایەتیی دەكاتو دەڵێ: من خوای خەڵكیم، فیتنەیەكی زۆر گەورەیە، بەڵام هەركەسێ ئیمانی هەبیٚ، دەزانیٚ درۆزنە، دەڵـێ: ئەگـەر ڕاسـت دەكـەی خوای، ئەدی بۆچی چاوی خۆت چاك ناكەیتەوە؟!.

*******



١) {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): «الدَّجَّالُ مَمْسُوحُ الْعَيْنِ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ »، ثُمَّ تَهَجَّاهَا: ك ف ر « يَقْرَؤُهُ كُلُّ مُسْلِمٍ»} أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٧٥٥٠).

# چەند تایبەتمەندییەکی دیکەی فیکریی و عەقیدەیی و ئاکاریی ئەهلی سوننەت و جەماعەت



ئنجا لە کۆتاییدا (أبو جعفر الطحاوي) چوار خاڵی کۆتایی کتێبەکەی، واتە: (١٠١-١٠٤) تەرخان دەکات بۆ خستنە ڕووی هەندێك تایبەتمەندیی دیکەی جەماوەری مسوڵمانانی پابەند بەڕێبازی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم)و، ڕۆیشتوو لەسەر ئەو ڕاستە ڕێیەی کە دیاریی کردوەو پێشینی چاکو، بەتایبەت سێ سەدەکان (القرون الثلاثة) لەسەری بوون.

دیارە ئەو تایبەتمەندییانەش جۆراو جۆرنو، هەیانە پەیوەستە بەلایەنی فیکرییەوەو، هەیانە بەلایەنی عەقیدەییو، هەیانە بەلایەنی سیاسییو، هەیانە بەلایەنی ئاکاریی (سلوكي)یەوەو، هەشیانە گشتییو هەمەلایەنەیە.

## باوەڕ نەکردن بە سەرجەم ئەوانەی لافی زانینی نادیار (غیب) لێدەدەن

سەرەتا دێتە سەرباسی تایبەتمەندییەکی فیکرییو عەقیدەیی لەخاڵی (١٠١)دا کە بریتیە لە باوەڕ نەکردنو بەڕاست دانەنانی سەرجەم ئەوانەی لافی زانینی نادیار (معرفة الغيب) لێدەدەن، هەرناوونیشانێکیان هەبێو، دەڵێ:

> ١٠١) ( وَلا نُصَدِّقُ كَاهِنًا[١] وَلا عَرَّافا[٢]، وَلا مَنْ يَدَّعِي شَيْئًا يُخَالِفُ الْكِتَابَ وَالسُّنَّةَ وَإِجْمَاعَ الأُمَّةِ ):

واتە: ئێمە هیچ کاهینێك، هەروەها هیچ فاڵچییەك بە ڕاست نازانین، وە هەر کەسێك لافی شتێك لێبدات کە پێچەوانەی قورئانو سوننەت بێ، یان پێچەوانەی کۆڕای ئوممەت بێ، (ئەوانە هیچیان بەڕاست نازانین).

١) كَهَنَ يَكْهَنُ كهانَةً، كَهَنَ لَهُ: أَخْبَرهُ بالغَيْب. فهو كاهِن ج: كُهَّانٌ وكَهَنَةٌ. المعجم الوسيط ص٨٠٣.
٢) العَرّاف: المُنجِّم، وطبيب العرب، والكاهن، المعجم الوسيط، ص٥٩٥.

(كاهِن) كۆیەكەی (كُهَّانَ)ە، بەو كەسە دەگوترێ كە لافی ئەوە لێدەدا پەنهان (غَیب) دەزانێ، یان لەڕێی جند (جن)ەوە زانیاری ئاسمانێ، دەربارەی ژیانی خەڵكی وەردەگرێو، ئیددیعای ئەوە دەكات كە هەندێ شت دەزانێ، لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم و موسنەدی ئەحمەددا هاتوە، لە دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە كە گوتوویەتی: { سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَاسٌ عَنْ الْكُهَّانِ؟ فَقَالَ: لَيْسوُا بِشَيْءٍ فَقَالُوا: يَا رَسُول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَا أَحْيَانًا بِشَيْءٍ فَيَكُونُ حَقًّا، فَقَالَ رَسُول اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ فَيَقُرُّهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ فَيَخْلِطُونَ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ }حديث صحيح.[1]

واتە: خەڵكێك پرسیاریان لە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كرد دەربارەی كاهینەكان فەرمووی: هیچ شتێ نین، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو كاهینانە جاری وا هەیە قسەیەك دەكەن، دوایی ڕاست دەردەچێ، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: (ئەو قسەیەی كاهینەكان كە ڕاست دەردەچێ)، ئەوە قسەیەكی ڕاستە، جند (ئەو جندەی كە پەیوەندیی بەو كاهینەوە هەیە، دەیرفێنێ (بەپەنهانیی لە فریشتانی دەدزێ) ئنجا دەیخاتە گوێی دۆستەكەیەوە (كە كاهینەكەیە) ئەویش سەد درۆی لەگەڵ تێكەڵ دەكات). بەڵێ، وەك چۆن ئینسان بەهۆی تەقواوە پەیوەندیی لەگەڵ مەلائیكەتاندا پەیدا دەكات، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ فصلت، واتە: ئەوانەی گوتوویانە: پەروەردگاری ئێمە خوایەو، ئنجا لەسەریشی دامەزراون، فریشتەكان دادەبەزنە سەریان (پەیوەندییان لەگەڵدا پەیدا دەكەن). پێیان دەڵێنو دەیخەنە دڵو مێشكیان: ترستان نەبێو پەژارە دامەگرن، موژدەتان لێ بێو دڵخۆش بن بەو بەهەشتەی كە گفتتان پێدەدرا.

---

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٤٢٩).

کەواتە: ئینسان بەهۆی ئیمان و تەقواوە لە فریشتان نزیك دەبێتەوە، ئنجا بەهەمان شێوەش: بە پێچەوانەوەوە بەهۆی خراپەو تاوانانەوە لە شەیتان نێزیك دەبێتەوە: ﴿...إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾﴾الأعراف، واتە: ئێمە شەیتانەکانمان کردوە بە دۆستی ئەوانەی کە ئیمانیان نیە، ئنجا وەك چۆن مەلائیکە ئیلهامی خێر دەخەنە دڵی دۆستانی خواوە، شەیتانەکانیش زانیاری خراپ دەخەنە دڵی ئەو کەسانەوە کە دۆستی وانن کە جاری وایە ئەو زانیارییانە ڕاستیشن، وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: {«تِلْكَ الْكَلِمَةُ الْحَقُّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ فَيَقْذِفُهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ وَيَزِيدُ فِيهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ»}حديث صحيح.[1] واتە: ئەو وشەیە کە کاهینەکە دەیڵێو ڕاستیش دەردەچێ، شەیتانێکی جینی دزیویەتی لە فریشتە،(بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمانو ئەو وشەیە لە فریشتەکان دەدزێ، فریشتەکان کە قسە دەکەن بۆ جێبەجێ کردنی کاروبارەکان، ئەو جیننیانە خوای توانا، توانایەکی وای داونێ، ئەو قسانە دەدزن)، ئنجا ئەو قسەیە دەخاتە گوێی دۆستەکەی خۆیەوە، (کە بابای کاهینە، یان ساحیرە) ئەویش سەد (١٠٠) درۆی ڕەگەڵ دەخات، ئنجا کە خەڵك شتە ڕاستەکەیان لێ دەبینێ، وادەزانێ درۆیەکانیش هەر ڕاستن.

کەواتە: ئێمە کاهین، فاڵگرەوە، ئەستێرە گرەوە، قاوە گرەوە، هەموو ئەوانەی کە ئیددیعای ئەوە دەکەن، غەیب دەزانن، بەڕاستیان نازانینو بە درۆیان دەزانین، ئەگەر جار جاریش ڕاست بکەن، ئەوە ئەو جند (جِنِّي)ە پێی گوتوە، نەك لە خۆیەوە بزانێ، خوای بەرزو مەزنو پەنهانزانیش (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) زۆر بەڕاشکاویی پێیڕاگەیاندووین کە هیچ کەس نهێنی ئاسمانەکان نازانێ، جگە لەخۆی، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾﴾

النمل، واتە: بڵێ جگە لەخوا، هیچ کەس لەوانەی کە لە ئاسمانەکانو زەویدان پەنهان (غیب) نازانێ، هەست ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە.

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: برقم: (٥٩٥٢).

**٢- ﴿ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ ... ﴿٢٧﴾ ﴾ الجن، واتە:**

**هیچکەس لە پەنهانی خۆی ئاگادار ناکات، جگە لە ڕەوانەکراوێك کە پەسندی بکات...**

**بەڵام پێویستە لێرەدا ئاگاداری مەسەلەیەکی گرینگ بین کە لێ بێئاگابوونی، تووشی هەڵەی بێڕەزامان دەکات لە تێگەیشتنی فەرمایشتەکەی پێغەمبەردا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)! ئەویش ئەوەیە کە:**

**هەموو ئەو زانیاریی‌و پێش بینییانەی، کە لەڕێی شێوازو ئامرازە زانستییەکانەوە وەردەگیرێن، وەك پێشبینیەکانی خۆرو مانگ گیرانو کەشو هەواو، ڕووداوە گەردوونییەکان، هیچ پەیوەندییان بەبابەتی کەهانەو فاڵچێتی یەوە نیەو، بەزانینی پەنهان (غیب)یش دانانرێن.**

*******

## پێویست بوونی كۆمەڵ بوونی مسوڵمانان و قەدەغەبوونی پەرتەوازەییان

ئەمجارە لە خاڵی (١٠٢)دا باسی تایبەتمەندییەكی سیاسییو كۆمەڵایەتیی ئەهلی سوننەتو جەماعەت دەكات،كە بریتیە:{لەگەڵ كۆمەڵو زۆرینەی مسوڵمانانو دەستەڵاتە شەرعییە سیاسییەكاندا بوون}و،{لێ نەترازانو لێ دوورنەكەوتنەوەیان}، دەڵێ:

**١٠٢ (وَنَرَى الجَمَاعَةَ حَقّاً وَصَوَاباً، والفُرْقَةَ زَيْغاً وَعَذَاباً):**

واتە: ئێمە پێمان وایە كەكۆمەڵ بوونی مسوڵمانان حەقەو ڕاستە، وەپەرتەوازە بوونیان، لادانو ئازارو سەر ئێشەیە. یانی: مسوڵمانان دەبێ كۆمەڵ بنو نابێ پرژو بڵاو بن، كۆمەڵبوونی مسوڵمانان شتێكی هەقەو ڕاستە، ئەو دینە هاتوە مسوڵمانان بهۆنێتەوە، كۆمەڵیان بكا، برا گەورەیان بۆ دابنێ، مسوڵمانان نابێ پرژو بڵاو بن، دەبێ كۆمەڵو ڕێك بن، ئەو كۆمەڵبوونە بە هەقو ڕاست دەزانین، بەپێچەوانەوە پرژو بڵاوبوونی مسوڵمانان و پارچە پارچە بوونیان، بە لادان و لاڕێ بوون، دەزانین، بە عەزابو مەینەتیشی دەزانین، هەم لە دنیاو هەم لە دواڕۆژدا، بەڕاستی مسوڵمانان بە هۆی پارچە پارچە بوونیانەوە، هەم لە دنیادا تووشی عەزاب دەبن، هەم لە دواڕۆژیشدا خوای دادگەر تۆڵەیان لێ دەستێنێ.

ئەوە خاڵێكی زۆر گرنگە بۆ هەموو مسوڵمانان كە گەلێك لە مسوڵمانان، وادەزانن كۆمەڵ بوون و بەیەكەوە بوونیان، بەشێك نیە لەدین، بەڵام ئەوەتا ئەبو جەعفەری طەحاویی وەك نوێنەرێكی ئەهلی سوننەتو جەماعەت، لە یەكێ لە بەندەكانی عەقیدەی ئەهلی سوننەتو جەماعەتدا دەڵێ: دەبێ مسوڵمانان كۆمەڵ بن.

ئنجا هەرچەندە بەڕای من ئەو مەسەلەیە لەگەڵ گرنگیی‌و گەورەییشیدا، بەشێك نیە لە عەقیدە، بەڵام بێگومان یەكێكە لەو شتانەی كە ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی لە مسوڵمانانیان دەخوازێ‌و، هەتا زیاتریش مسوڵمانان ئەهلی تەوحید بن، زیاتریش ئەهلی وەحدەت دەبن‌و، یەكڕیز و تەبا دەبن.

لە خاڵی (١٠٣)دا ئەو ڕاستییە دەخاتەڕوو، كە گەردنكەچیی‌و تەسلیم بوون بۆ خوا، ئایین‌و بەرنامەی گشتیی خوای زاناو توانایە، بۆ ئەهلی ئاسمانەكان‌و خەڵكی زەوی، دەڵێ:

١٠٣) (وَدِينُ اللهِ فِي الأَرْضِ وَالسَّمَاءِ وَاحِدٌ، وَهُوَ دِينُ الإِسْلامِ، قَالَ تَعَالَى: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ... ﴿١٩﴾ ﴾ آل عمران، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿ ...وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ... ﴿٣﴾ ﴾ المائدة ):

واتە: دینی خوا لە زەوی‌و لە ئاسمان دا یەكە، كە ئیسلامە، یانی: ئەوەی كە خوا كردوویەتی بە بەرنامە، هەم بۆ خەڵكی سەر زەوی‌و، هەم بۆ دانیشتوانی ئاسمانەكان، یەكە كە ئیسلامە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ... ﴿١٩﴾ ﴾ آل عمران، دین‌و بەرنامە لە لای خوا بەس ئیسلامە، دەفەرموێ: ﴿ ...وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ... ﴿٣﴾ ﴾ المائدة، واتە: ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسەند كردوون. پێم وایە نووسەر بۆیە گوتوویەتی: ئیسلام دینی خوایە لە زەوی‌و لە ئاسماندا، ، چونكە خوای بەرزو مەزن لە سووڕەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ:

﴿ أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ٨٣ ﴾ آل عمران، **واته: ئایا جگه لـه بەرنامـەی خوا داوا دەکەن، لە حاڵێکدا هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، گەردنکەچە بۆ خـوا؟ (ئیسلام) یانی: گەردن کەچییو تەسلیم بوون بۆ خوا، ئایینو دەستوورو بەرنامەیەکە، نەك هەر ئینسان ، بەڵکو هەموو بوونەوەر پەیڕەویی لێدەکات، هەر بۆیەش ئەو ئینسانانەی کە لە دینی پەسند کراوی خوا لادەدەن، شتێکی زۆر نامۆو عەجایب دێنە پێش چاو، وەك ئەو سەیارەیەی کە لە یاسای هاتوو چۆ لادەدات! بەڵێ، هەموو بوونەوەر مسوڵمانە، بۆیە خوا مسوڵمانەتیشی کردوە بە دین بۆ ئینسان، کاتێك ئینسان لە مسوڵمانەتیی لادەدا، مانای وایە پێچەوانەی هەموو بوونەوەر ڕەفتاری کردوە، بۆیەش پێویستە بۆ هەمیشە لە دۆزەخدا بـمێنێتەوە.**

## میانجێتیی و هاوسەنگیی (الوسطية والتوازن)

## نیشانەی گەورەی ئیسلامەتیی ڕەسەنە

سەرەنجام نووسەر لە خاڵی پێش كۆتایی ژمارە (١٠٤)دا ئاینو بەرنامەی ڕاستو هاوسەنگی خوای كاربەجێ، بەچوار وەسفی گرنگ پێناسە دەكات، كە هەموو لایەنو بوارەكانی ژیانو ئینسانو سەرجەم ڕەهەندەكانی دینداریی‌و دنیادارییی دەگرنەوە، پێشم وایە سەرجەم مسوڵمانان تێیاندا یەكدەنگن، ئەگەر بەكردەوەش وارەفتار نەكەن، كە بریتین لە:

١- نە تێپەڕاندن، نەبەزایەدان، بەڵكوهاوسەنگ بوون.

٢- نە وێچواندن، نە پەكخستن، بەڵكو چەسپاندنی سیفەتەكانی خوا لەگەڵ بەپاكگرتندا.

٣- نە بێچارەبوون، نەبەدیهێنەربوون، بەڵكو خاوەنی كردەوەی خۆبوون.

٤- نەدڵنیابوون، نەنائومێدبوون، بەڵكو لەنێوان ترس‌و هیوادا بوون. وەك گوتوویەتی:

١٠٤) ( وَهُوَ بَيْنَ الْغُلُوِّ وَالتَّقْصِيرِ، وَبَيْنَ التَّشْبِيهِ وَالتَّعْطِيلِ، وَبَيْنَ الْجَبْرِ وَالْقَدَرِ، وَبَيْنَ الأَمْنِ وَالْيَأْسِ ):

واتە: دینی ئیسلامیش، لە نێوان زێدەڕۆیی‌و كورتهێنانو وێچواندنو پەكخستنو، ناچاركرانو كردەوەی خۆخوڵقاندنو، دڵنیابوونو نائومێدبوون دایە.

لێرەدا نووسەر هەشت جۆرە سیفەتو هەڵوێستی هەڵەو ناڕاست باس دەكات، كە هەموویان هی پێڕو دەستە لادەرو داهێنەرەكاننو، دەڵێ: ئیسلامەتیی‌و دینداریی ڕاستو ساغ لەنێوان ئەو چوار جۆرە سیفەتو بۆچوونو هەڵوێستە هەڵانەدایە:

١و٢/ الغُلوُّ والتقصیر: (تێپەڕاندنو بەزایەدان): ئەم دوانە زیاتر پەیوەندییان بەلایەنی دینداریی بەگشتییو خواپەرستیی (عبادة)ەوە بەتایبەت هەیە، ، چونكە مسوڵمانی هاوسەنگ (مُتَّزِن) نە زێدەڕۆیی دەكاتو تێدەپەڕێنێو، نەكەمتەرخەمییش دەكات، كە بەجێ بمێنێ.

٣و٤/ التَّشبیه والتَّعطیل: (وێچواندنو پەكخستن): ئەم دوانەش پەیوەستن بەبواری ناوو سیفەتەكانی خواوەو، مسوڵمانی ڕاست و تەواو، سیفەتەكانی خوا عز وجل بۆ خوا دەچەسپێنێ، بەڵام لەگەڵ بەپاكگرتنی خوادا، كە سیفەتەكانی وەك هی دروستكراوەكانی بچن (إثبات مع التنزیه) بەو جۆرە خۆی لە زێدەڕۆیی وێچواندنو كورتهێنانی پەكخستن دەپارێزێ.

٥و٦/ الجبر والقدر: (بێچارەبوونو بەدیهێنەربوون): ئەم دوانەش پەیوەندییان بەبواری ویستو هەڵبژاردنو ئازادیی مرۆڤەوە هەیە، كە مرۆڤ نەوەك جەبریەكان دەڵێن دەستە پاچەیە كە هیچی بەدەست نەبێ، نەوەك موعتەزیلەو قەدەرییەكانیش دەڵێن: بەدیهێنەری كاروكردەوەكانی خۆیەتی، چونكە كردەوەی مرۆڤ بەدیهێنراو (مَخلوق) نین، تاكو پەكیان لەسەر بەدیهێنەر (خالق) كەوتبێ.

٧و٨/ الأمن والیأس: (دڵنیابوونو بێ هیوابوون): ئەم دوانەش پەیوەستن بەبواری مامەڵەكردنی بەندە (عَبد) لەگەڵ خوادا كە دەبێ لەنێوان ترسو هیوا (الخَوف والرجاء) دابێو، نە پشتێندی دڵنیایی بەرانبەر بە سزای خوا لێ بكاتەوەو خۆی بۆ بەهەشت دابنێو، نە نائومێدو تەما بڕاویش بێ، لە ترسی سزاو لێپرسینەوەی خواو خۆی بۆ دۆزەخ دابنێ.

******

## کۆتا قسـەی طـە حاویي لە کتێبەکەیـدا

گوتوویەتی:

١٠٥) (فَهَذَا دِينُنَا وَاعْتِقَادُنَا ظَـــاهِراً وَبَاطِناً، وَنَحْنُ بُرءآء إِلَى اللهِ مِـــنْ كُلِّ مَنْ خَـــالَفَ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ وَبَــيَّـنَّـــاهُ):

واتە: ئائەوەی باسمان کرد (لەو سەدو چوار خاڵەدا کە ڕابردن) ئەوە دینی ئێمەیە، ئەوە بیرو بڕوای ئێمەیە (واتە: ئەهلی سوننەتو جەماعەت)، هەم بە ڕواڵەتو هەم بەپەنهان، (یانی: هەم ئەوەی کەدەری دەبڕین، هەم ئەوەی کەلە دڵماندایە ئەوە عەقیدەکەمانە)، ئێمە بۆ لای خوا حاشاکەرین لەهەرکەسێك، کە پێچەوانەی ئەوەبێ، کە باسمان کـردو ڕوونمـان کردەوە.

هەڵبەتە وەك باسمان کرد لە دەرسەکانی ڕابردوودا، زانایان و ئێمەش لەبـەر تیشـکی شەریعەتو قسەی زانایاندا، بە پێی هەڵێنجانی خۆمان، تێبینیمان هەبووە لەسەر هەندێك لەو قسانەی، کە ئـەبو جەعفـەریی طـەحـاویی بـە نـاوی عـەقیـدەی ئـەهلی سـوننەتو جەماعەتەوە کردوونی، کە وەك طـەحاویی خۆیشی گوتوویـەتی: زیـاتر لەبـەر تیشـکی قسەکانی ئەبو حەنیفەدا قسەکانی کردوە، یەکێك لە بۆچوونەکانی ئەبو حەنیفە ئەوەبووە ئیمان نەکەم دەکات نەزیاد دەکات، بەڵام گوتمان ئەوە پێچەوانەی زۆربـەی ڕای زانایانـە، ڕای زۆربەی زانایانیش ڕاستە، کە ئیمان زیاد دەکاتو کەمیش دەکات.

یەکی دیکە لە قسەکانی ئەوەیە کە: ئینسان لە ئیمان ناچێتەدەر، مەگەر بـەوەی کـە ئینکاریی بکات لەو شتانەی کە پێیان چۆتە نێو ئیمانەوە، بەڵام ئێمـە باسمـان کـرد کـە نەخێر، جاری وا هەیە ئینسان ئینکارییش ناکات، ئینکاریی قورئانو سوننەتو دینـیش ناکات، بەڵام لە بازنەی ئیسلامییش دەچێتەدەر، چونکە: بۆ وێنە: گاڵتە بەدین دەکات، بەوە لەدین دەچێتە دەرێ، بەبێ ئەوەی ئینکارییش بکات.

ئنجا طەحاویی دەڵێ:

(وَنَحْنُ بُرءآءُ إِلَى اللهِ مِنْ كُلِّ مَنْ خَالَفَ الَّذِي ذَكَرْنَاهُ وَبَيَّنَّاهُ)، یانی: ئێمە بەریین و دەستبەرداری هەر کەسێکین، کە پێچەوانەی ئەوە دەڵێ، کە باسمانکردو ڕوونمان کردەوە، یانی هەر کەسێ بەو شێوەیە عەقیدەی نەبێ، ئێمە لێی بەریین و لەسەر عەقیدەی ئیسلامیی نیە.

ئنجا لە کۆتاییدا دەپاڕێتەوەو دەڵێ: (وَنَسْأَلُ اللهَ تَعَالَى أَنْ يُثَبِّتَنَا عَلَى الإِيمَانِ، وَيَخْتِمَ لَنَا بِهِ، وَيَعْصِمَنَا مِنَ الأَهْوَاءِ الْمُخْتَلِفَةِ، وَالآرَاءِ الْمُتَفَرِّقَةِ، وَالْمَذَاهِبِ الرَّدِيَّةِ، مِثْلَ الْمُشَبِّهَةِ وَالْمُعْتَزِلَةِ وَالْجَهْمِيَّةِ وَالْجَبْرِيَّةِ وَالْقَدَرِيَّةِ وَغَيْرِهِمْ، مِنَ الَّذِينَ خَالَفُوا السُّنَّةَ وَالْجَمَاعَةَ، وَحَالَفُوا الضَّلاَلَةَ، وَنَحْنُ مِنْهُمْ بَرَآءٌ، وَهُمْ عِنْدَنَا ضُلاَّلٌ وَأَرْدِيَاءُ وَبِاللهِ الْعِصْمَةُ وَالتَّوْفِيقُ).

واتە: لە خوای بەرز دەپاڕێینەوە، کە لەسەر ئیمان بمانچەسپێنێ، پێمان ڕاگیر بکاو کۆتایی و خاتیمەمان بەو ئیمانو عەقیدەیە بێنێ، وە بمانپارێزێ لە بیرو بۆچوونە جیاوازەکان، لە بیردۆزە سەرلێشێوێنەکان، لە بیروڕا پرژو بڵاوەکان، لە بیردۆزەو ڕێچکە پووچەکان، وەك موشەببیهەو موعتەزیلەو جەهمیەکانو جەبرییەکانو قەدەرییەکانو غەیری ئەوانیش، لەوانەی کە پێچەوانەی ئەهلی سوننەتو جەماعەت ڕەفتاریان کردوە، لەگەڵ گومڕاییدا پەیمانیان بەستوە، ئێمە لەوانە دوورو بەریینو، ئەوانە لەلای ئێمە سەر لێشێواوو خراپن، پارێزران لەگوناهانو یارمەتیدانیش بۆ چاکان، هەر بەخوای پەروەردگارە.

وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين

❖❖❖❖❖❖

# نێوەڕۆك

(أبو جعفر الطحاوي) كێیە؟ ..... 14
پێشەكی ..... 17
دەستپێكی كتێبەكەی طەحاویی ..... 27
باسی خوا بەیەكگرتن (توحید الله) ..... 29
خستنە ڕووی ژمارەیەكی زۆر لە سیفەت و كردەوە بێ وێنەكانی خوا ..... 51
گرنگیی و گەورەیی خواناسیی بۆ سەرجەم پایەكانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی ..... 64
ئایا خوا پێش ئەم بوونەوەرە، دروستكراوی دیكەی هەبوون، یان نا؟! ..... 68
وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێك لەبارەی دەسەڵاتی بێ سنووری خواوە ..... 74
باسێك لەبارەی سیفەتەكانی خوا ..... 79
باسێك لەبارەی سیفەتەكانی خواوە ..... 81
باسی قەزاو قەدەرو هەڵویستی ڕاست و هاوسەنگ لە بارەیەوە ..... 91
باسی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ..... 113
باسی قورئان و چۆنییەتی بڕوا پێهێنانی ..... 125
بینرانی خوای بێ وێنە لە بەهەشت دا لە لایەن بڕوادارانەوە ..... 133
باسی شەو ڕۆو بەرز بوونەوە (الإسراء والمعراج)ی پێغەمبەر ..... 153
باسی حەوزی (كوثر) وتكاكردن (شفاعە) و پەیمان (میثاق) لیوەرگیرانی ئادەم و وەچەكەی ..... 165
وەرگرتنی پەیمانی بەندایەتیی بۆ خواكردن، لە ئادەم و وەچەكەی ..... 174
باسێكی چڕوپڕ لە بارەی قەزاو قەدەرەوە ..... 177
باسی (لوح) و (قلم) ..... 189
باسێك لەبارەی عەرش و كورسی و چۆنییەتی پەیوەندییان بە خواوە ..... 197
باسی سێ لەپایەكانی ئیمان (ئیمان بە فریشتان و كتێبەكانی خواو پێغەمبەرانی) ..... 213
حەوت تایبەتمەندیی عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ..... 219
پێناسەی ئیمان و پایەكانی نوێژ لەپشت كردن و نوێژی جەنازە لەسەر كردنی تیكڕای مسوڵمانان ..... 264
ئیمان بە فریشتان و ژیانی بەرزەخ و گۆڕو زیندووكرانەوەو لێپرسرانەوەو بەهەشت و دۆزەخ ..... 287
ئیمان بە فریشتەكانی خوا، تۆماركەرانی كردەوان و فریشتەی مەرگ ..... 290

باسی ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشتی ........ 311
باسێك دەربارەی پردی سەر پشتی دۆزەخ (الصراط): ........ 314
ئێستا بەهەشت و دۆزەخ هەن و لەبەینیش ناچن ........ 318
کۆتا باس لەبارەی قەدەرو هەندێك لە وردەکارییەکانیەوە ........ 323
پاڕانەوەو خێرو چاکەی زیندوان، سوود بە مردوان دەگەیەنێ ........ 332
خستنەڕووی چەند سیفەتێکی خوا (عز وجل) کە مشتومڕیان لەبارەوە هەبووە ........ 339
هەڵوێستی ڕاست و دروست لەبارەی هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ........ 347
باسی چوار جێنشینەکانی پێغەمبەر ........ 357
باسی (دە)هاوەڵە موژدەی بەهەشت پێدراوەکان ........ 364
باسی دۆستانی خواو کەرامەتەکانیان ........ 375
نیشانە گەورەکانی هاتنی ڕۆژی دوایی ........ 381
چەند تایبەتمەندییەکی دیکەی فیکریی و عەقیدەیی و ئاکاریی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ........ 385
پێویست بوونی کۆمەڵ بوونی مسوڵمانان و قەدەغە بوونی پەرتەوازەییان ........ 391
میانجێتیی و هاوسەنگیی (الوسطية والتوازن) نیشانەی گەورەی ئیسلامەتیی ڕەسەنە ........ 394
کۆتا قسەی طە حاویی لە کتێبەکەیدا ........ 396